چوار چرا

# میتۆدی

# توێژینەوەی زانستی



پرۆفیسۆر
د. سابیر بۆکانی

2020

ناوی کتێب: میتۆدی توێژینەوەی زانستی
بابەت: زانستی
نووسینی: پ. د. سابیر بۆکانی
پیتچنین: نووسەر
دیزاین: یادگار محمد فرج
نۆبەتی چاپ: چاپی دووەم / 2020
چاپخانە: خانەی چاپو بڵاوکردنەوەی چوارچرا - سلێمانی، هەرێمی کوردستان.
تیراژ: 1000 دانە.
ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (1718)ی ساڵی (2015) ی پێ دراوە.
پەیجی تایبەتی نووسەر لەفەیسبووک:

Dr. Sabir Bokany
https://www.facebook.com/DSabrBkany

## لەبری پێشەکی

لەژیانی خوێندندا، ئەو چانسەم هەبووە کە باشترین مامۆستایانی میتۆدی توێژینەوە، وانەم دابدەن. لەهەر سێ قۆناغی خوێندنی بەکالۆریۆس‌و ماستەرو دکتۆرادا، پێم خۆش بوو بێت یان نا، میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستییان فێرکردووم بەجۆرێك کە تائێستاش ناتوانم؛ لەئاست بەخشندەیی‌و مەزنییاندا؛ دەنگی مامۆستایی هەڵبڕم‌و شاگردی هەمیشەییان نەبم. هەر ئەوانیش بەو بڕوایەیان گەیاندم؛ کە مامۆستا بۆ ئەوەی ئاستی زانستی خۆی لەمادەیەکدا؛ بەرز بکاتەوە، بەتەنها خوێندنەوەی سەرچاوەو؛ پشتبەستن بەو وانانەی لەکاتی خوێندکاریداو لەناو پۆلدا پێیدراون؛ بەس نەبن. دوو بنەمای دیکەش ئەگەر پەیرەو کران؛ زۆر لەوانە گرنگترن. یەکێکیان دەڵێت: ئەگەر مامۆستا بوویت‌و زانیت لەمادەیەکی زانستیدا؛ ناگەیتە ئەو ئاستەی بەدڵی خۆت بیت‌و وەکو پێویست توانات بەسەریدا ناشکێت، ئەوا هەولبدە وەریبگری‌و بیلێیتەوە. منیش وەها بووم‌و لەسەرەتای کاری مامۆستایەتیم لەزانکۆدا؛ ئەو رەفتارەم؛ لەگەڵ هەردوو مادەی میتۆدەکانی توێژینەوەو ئاماردا؛ کردو وەرم گرتن. وا پانزە ساڵە هەردووکیان؛ بەتایبەتیش میتۆدەکان؛ بەخوێندکارانی ماستەرو بەکالۆریۆس دەڵێمەوە. بەخۆشی خۆم نەبوو؛ خوێندکاران ناچاریان کردم؛ زۆرترین سەرچاوە ببینم‌و بەدواداچوونم هەبێت‌و دانەبڕێم. بنەماکەیتر بەتەنها تایبەتە بەمیتۆدی توێژینەوەی زانستییەوەو ئامادەبوونە لەگفتوگۆی تێزی دکتۆراو ماستەرنامەداو دەڵێت: "ئەوەندەی ئەو گفتوگۆیانە؛ وردەکاری ئەنجامدانی توێژینەوەمان فێر دەکەن؛ بارتەقای ئەوە لەسەرچاوەو وانە تیۆرییەکانەوە فێر نابین". ئەمەشیانم تاقیکردەوە. کەمن ئەو گفتوگۆ زانستییانەی؛ ئاگاداری ئەنجامدانیان بووبم، نەچووبم‌و ئامادە نەبم؛ تابزانم چی، چۆن دەگوزەرێت؟ زۆر بەوردی سەرنجم لەتێبینی‌و راوبۆچوونی گفتوگۆکاراندا‌وە، جارجارەش وەك میوانێکی نەناسراوی بانگهێشت نەکراو؛ خۆم بەو هۆڵانەدا کردووە کە تاوتوێی ماستەرنامەو تێزی دکتۆرای پزیشکی

ددانو بایۆلۆژیو ئەندازیارییان کردووە، کە لەپسپۆڕی خۆمەوە دوور بوون. گەر بەتەواوی لەناوەڕۆکی ئەو توێژینەوانەش تێنەگەشتبم؛ بەڵام سەرئەنجام لەڕەوتی گشتی بەڕێوەچوونیان؛ گەلێك زانیاری فێربوومو هەرگیز بەدەستی بەتاڵ نەهاتوومەتە دەرەوە.

لەپانزە ساڵی رابردووشدا؛ بۆخۆم چەندین توێژینەوەم ئەنجامداوە. هاوکات سەرپەرشتی دەیان توێژینەوەی دەرچوونی بەکالۆریۆسو پانزە ماستەرنامەم کردووە. تا نووسینی ئەم چەند دێڕەش؛ سەرۆك یان ئەندامی لیژنەی گفتوگۆی بیستو دوو ماستەرنامەو تێزێکی دکتۆرا بووم. کەم تا زۆر لەتوێژینەوەکانو لەمامۆستایانی سەرپەرشتیارو لەسەرۆكو ئەندامانیتری لیژنەو تەنانەت لەخوێندکارانیشەوە، بڕێکی باش زانیاریو شارەزایم لەمیتۆدو چۆنێتی نووسینی توێژینەوەدا کۆکردۆتەوە.

جگە لەخولیای تایبەتی خۆم، هەموو ئەو ئەزموونانەی ئاماژەم بۆ کردن، هەوێن بوون بۆ نووسینی کتێبێك لەبواری میتۆدی توێژینەوەی زانستیدا، بەتایبەتیش کە ئاگاداربووم؛ کتێبخانەی زانکۆکانی هەرێم، بەدەگمەن لەو جۆرە کتێبانەیان بەزمانی کوردی تێدایەو؛ لەم رووەوە زۆر هەژارو نەدارن. پێموایە ئەو چەند دانەیەی بەرچاوم کەوتوون؛ تێرو تەسەل نینو؛ زیاتر نامیلکەو بڵاوکراوەی تایبەتن بەبوارو پسپۆڕییەکی زانستییەوە.

هاندەری دیکەش بۆ نووسینی ئەم کتێبە، خراپی رەوشی توێژینەوەکانمانە کە بەئاشکرا دیارەو بەرۆشنی رەنگیداوەتەوە. بەرپرسانی زانکۆو خوێندنی باڵاش؛ هێندەی بایەخ بەچەندێتیو ژمارەی توێژینەوەکان دەدەن، بەو هێندە چۆنێتیو کوالیتییان؛ نەکردۆتە ئامانج. زیادگۆیی نییەو واقیعی حاڵ پێمان دەڵێت: زۆرێك لەمامۆستای گفتوگۆکاری ماستەرنامەو تێزەکانی دکتۆرا، تەنها بەرواڵەتو رووکاری؛ لاپەڕەکانی توێژینەوەوە؛ پەیوەستنو ئەوەی دەیبینو پرسیار دەکەن لێی؛ هەر تۆبۆگرافیای لاپەڕەو جوگرافیای رێکخستنی دەقەکانن. تێبینیو سەرنجەکان؛ سنوری رووکەشی توێژینەوە؛ نابەزێنو

زياتر جەختكردنەوەن لەسەر: شوێنی ئەم كەوانەيەو ئەو ئەستێرەيەو؛ فاريزەی ئەم سەرچاوەيەو قەبارەی ئەو ناونيشانەو؛ بچوكی ئەم خشتەيەو گەورەيی ئەو هێلكارييەيە. شتێكی ئەوتۆ لەشياوی تيۆرو تۆكمەيی هەنگاوی مەيدانیو دروستی ميتۆدی توێژينەوەكان؛ باس ناكرێتو بەلايدا ناچنو خۆيانی لێ بەدوور دەگرن. بەهۆی بەنەريت بوونو پيادەكردنی ئەم لۆژيكەوە، خوێندكاريش زياتر؛ بايەخ بەفۆرمو شێوەی دەرەكی دەداتو بەو رێژەيە؛ خەمی ناوەڕۆكو ئەنجامی توێژينەوەكەی نييەو خەريكە وای لێدێت هەر ئەوەندە لەتوێژينەوەی زانستی تێبگات. جا ئەگەر كەسێك بەباشی لەشتێك تێنەگەشتبێ، چۆن دەتوانێ كەسانيتر تێگەيەنێت؟ ئايندەش؛ هەر ئەوە دەڵێتەوە؛ كە پێی ووتراوە، هەر ئەوەش دەگەيەنێت؛ كە پێيگەشتووەو هەر ئەوەش دەكاتەوە؛ كە پێشتر كردوويەتی.

داواكارم لەو كەسانەی كە لەميتۆدی توێژينەوەی زانستيدا، لەئێمە شارەزاو بەئەزموونترن، كاتێك ئەم كتێبەيان دەكەوێتە بەردەستو دەيخوێننەوە، گەر كەموكورتیو؛ ناتەواویو هەڵەيەكيان كەوتە بەرچاو، بمانبەخشنو بۆمان راست بكەنەوە.

لەكۆتاييدا، هيوادارم ئەم كتێبە، بەر لەهەر شتێك؛ خزمەتێك بێت بەزمانی كوردیو بتوانێت لەبوارەكەی خۆيدا؛ ببێتە سەرچاوەيەكی بەردەستو؛ هاوكاری ئەو خوێندكارو توێژەرانە بكات، كە هەلومەرجە نالەبارەكانی رۆژگار، ئەو دەرفەتەی بۆ نەرەخساندن؛ جگە لەكوردی؛ زمانێكيتر بەباشی فێربنو كەڵكی لێوەربگرن... ئەم كتێبە؛ هەر بەئەوانيش؛ پێشكەشە.

د. سابير بۆكانی
2015 /11/ 9
سلێمانی

## پێڕستی بابەتەکان

## دەروازە

مرۆڤ بەدرێژای مێژوو لەهەوڵی بەردەوامدا بووە؛ بۆ لێکدانەوەی دیاردە سروشتیو کۆمەڵایەتییەکان تاکو لێیان تێبگاتو بزانێت لەئایندەدا بەکوێ دەگەنو پاشان بە چ ڕێگاو شوێنێك کۆنترۆڵیان بکات. هەمیشە بەدوای زانینو مەعریفەدا گەڕاوە تا وەڵامی پرسیارەکانی دەستبکەوێت، ئەو وەڵامانەی کە یارمەتیدەرن بۆ باشترکردنی ژیانو گوزەرانی، بەتایبەتیش لەو کاتانەدا کە ڕووبەڕوی تەنگوچەڵەمەو گرفتی جۆراوجۆر بۆتەوە. ئامانجی بنەڕەتی زانست، بریتییە لەدۆزینەوەی سیستمی باوی ئەم گەردوونەو؛ تێگەشتن لەیاساکانی سروشتو دۆزینەوەی ئەو ڕێگایانەی کە پێویستن بۆ کۆنترۆلکردنی هێزو تواناکانی سروشت، ئەویش لەڕێی گرتنەبەری ڕێگای زانستی توێژینەوەوە.

ئەمڕۆ توێژینەوەی زانستیو بەکارهێنانەکانی لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا، بۆتە ئەو دیاردەیەی کە ئێستای لەسەردەمەکانیتر پێجیادەکرێتەوە. لەم ڕۆژگارەدا هەر کۆمەڵگەیەك بۆ دیاریکردنو چارەسەرکردنی کێشەکانی، بۆ پەرەپێدانی ئابوریو کۆمەڵایەتی، پشت بەتوێژینەوەی زانستی نەبەستێتو بەکاری نەهێنێت، لەکاروانی پێشکەوتن دوادەکەوێتو؛ گیرۆدەی چەندین گرفتی جۆراوجۆر دەبێتەوە کە لەژمارە نایەن. ئەم سەردەمە بەسەردەمی شۆڕشی زانستیو تەکنۆلۆژی دەناسرێتەوە، خەسڵەتەکانی ئەم شۆڕشەش تەواو جیاوازە لەو شۆڕشە پێشەسازیانەی کە جیهان بەخۆوە دیویەتی لەسەدەکانی ڕابردوودا. شۆڕشی تەکنۆلۆژیاش هەمیشەو بەبەردەوامی پشتی بەتوێژینەوەی زانستی بەستووەو دەیبەستێت. بۆیە ئەو دەوڵەتانەی کە زیاتر پێشکەوتوونو؛ لەڕووی تەکنۆلۆژییەوە؛ هەنگاوی گەورەتریان ناوە، ئەو دەوڵەتانەن کە ڕووی چەندێتیو چۆنێتییەوەو لەگشت کەرتو بوارەکانی

خزمەتگوزاریو ئابوریو پیشـەسـازیو کشـتوکاڵی...هتد. گرنگی زیاتریان بەدامەزراوەکانی توێژینەوەی زانستی داوە.

**سەرچاوەکانی مەعریفە**

مرۆڤ لەپێناوی گەیشـتن بەزانیاریو مەعریفە، چەندین ڕێگای گرتۆتەبەر، تاکو وەڵامی ئەو پرسـیارانەی دەسـتبکەوێت کە سـەبارەت بەدیاردەکانی دەوروبەری لەلای دروسـت دەبوون. لەڕووی مێژوویەوە؛ سـەرچاوەکانی مەعریفە بۆ پێنج جۆر؛ پۆلێنکراون کە بریتین لە:

**ئەزموون**

ئەو سـەرچاوەیەیە کە هەمووومان پێی ئاشـناینو، لەژیانماندا زۆرجار بەکاری دەهێنین. بۆ نموونە: کە ڕۆژانە دەچینە سـەر کار، بەتاقیکردنەوەو ئەزموون بۆمـان دەردەکەوێـت کـام ڕێگـایەی هـاتوچۆ؛ لەوانیتر نزیکترو چۆڵترو سـەلامەتو هێمنترە. ئیـدی هەموو جـارێك پێیـایدا دەڕۆینەوە. زۆرێـك لەشـارەزاییو زانیـارییەکانمـان هەر لەم ڕێیەوە وەردەگرینو نەوە بۆ نەوە دەیگوێزینەوە، ئەگەر مرۆڤ سـودی لەئەزموونی ڕابردووی خۆیو کەسـانیتر وەرنەگرتایە، ئەوا خاوترو سـسـتتر هەنگاوی دەناو؛ پێشـکەوتنمان زۆر دوا دەکەوت. پێویسـتە بگوترێـت هەموو مەعریفەیەکیش بەتەنهـا لەڕێی ئەزموونەوە بەدەست ناهێنرێت.

**کەسانی بڕواپێکراو**

مەبەست لەکەسانی بڕواپێکراو؛ ئەوانەن لەو کێشەیەدا شارەزاو پڕئەزموونن کە لێـیـدەکۆڵـینەوە وەك پسـپـۆڕانو هەروەهـا سـەرچـاوە فەرمیو حکومییەکانیش دەگرێتەوە. زۆرجار بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتو کێشانەی کە دژوارنو لەڕێی ئەزموونی خۆمانەوە بۆمان چارەسـەرناکرێن؛ پەنا دەبەینە بەر پسپۆڕو شارەزایان، ڕوو دەکەینە فەرهەنگەکان بۆ دۆزینەوەی مانای ئەو ووشانەی کە نایانزانین. یاخود ڕاوێژ بەڕاوێژکاران دەکەین. دەبێت ئەوەشمان

لەیاد نەچێت کە نابێت هەموو جارێك بڕوا بەکەسـانی بڕواپێکراو بکەین و؛ بەتاقە سەرچاوەی مەعریفەیان دابنێین.

**بیرکردنەوەی هەڵهێنجانی**

فەیلەسـوفەکانی گریك ئەوان یەکەمین لەداڕشـتنی ڕێگای سـیسـتماتیك لەبەدەسـهێنانی مەعریفەدا. ئەرسـتۆو شـوێنکەوتوانی لەبەکارهێنانیدا دەسـتپێشـخەربوون. هەڵهێنجان کە بەمانای بە(دەرئەنجام گەشـتن) دێت، بریتیە لەو پرۆسـەیەی بیرکردنەوە کە مرۆڤ لەڕێی (گشـت)ەوە بە (تایبەت) یان (بەش) دەگات؛ ئەویش بەبەکارهێنانی ڕێسـا سـنوردارەکانی لۆژیك. ئەو ڕێگەیەیە کە بەهۆیەوە زانیـارییەکـان ڕێکـدەخەین تـاکو بەپوختکراوەکـان بگەین. یەکێك لەسەرەکیترین نموونەکانی بیرکردنەوەی هەڵهێنجانیی لۆژیکی ئەرسـتۆیە. کە لەپێشـەکی گەورەو پێشـەکی بچوك و ئەنجام پێك دێت. وەك ئەم نمونەیە:

هەموو مرۆڤێك دەمرێت ( پێشەکی گەورە)
پاشاکانیش مرۆڤن ( پێشەکی بچوك)
کەواتە پاشاکانیش دەمرن ( ئەنجام)

لەبیرکردنەوەی هەڵهێنجاندا؛ تەنها ئەو شتانە ڕێکدەخرێن کە پێشتر زانراون. ئەگەر پێشـەکییەکان ڕاسـت بوون، ئەوا بەزەرورەت ئەنجامیش ڕاسـت دەردەچێت، ئینجا بۆ ئەوەی ئەنجام ڕاست دەربچێت پێویستە لەپێشەکییە ڕاسـتەکانەوە دەسـتپێبکرێت. بەڵام هەمووجارێك پێشـەکییە ڕاسـتەکان بەئەنجامی ڕاست و دروستمان ناگەیەنن. بۆ نموونە:

هەموو نەهەنگەکان لەئاودا دەژین ( پێشەکی گەورە ڕاستە)
هەموو ماسییەکان لەئاودا دەژین ( پێشەکی بچوك ڕاستە)
کەواتە هەموو ماسییەکان نەهەنگن (ئەنجام هەڵەیە)

## بیرکردنەوەی پێوانەیی

هەروەك زانیمان ئەنجامەکان لەبیرکردنەوەی هەڵهێنجاندا هەموو جارێك ڕاست دەرناچن؛ بەڵام چۆن دەزانین پێشەکییەکان ڕاستن؟.

**فرانسیس بیکۆن** (1561- 1626)و دواتریش کەسانیتر بۆ گەیشتن بەمەعریفە، ڕێگایەکی نوێیان هێنایە ئاراوەو دەیانووت: "نابێت خۆمان بەو پێشەکییانەوە ببەستینەوە کە لەکەسانی بڕواپێکراوەوە بۆمان ماوەتەوەو ناکرێت وەك حەقیقەتی ڕەها بۆیان بڕوانین". بیکۆن پێیوابوو ئەبێت توێژەر لەڕێی تێبینیکردنی ڕاستەوخۆوە بەئەنجامە گشتییەکان بگات. لەسیستەمی بیکۆندا تێبینی ڕوداوێکی دیاریکراو لەناو دەستەیەك ڕوداودا دەکرێت؛ پاشان سەرجەم ڕوداوەکان هەڵدەهێنجرێن. بەواتا لەڕێی سامپڵەوە؛ گشتاندن دەکرێت. بۆیە بیرکردنەوەی هەڵێنجان بیرکردنەوەی ئەگەرایەتییەو نامانگەیەنێتە بێگومانی، تەنها ئەو کاتانە نەبێت کە هەموو سامپڵەکان تێبینی بکرێن. بۆ نموونە:

هەموو ئەو کەروێشکانەی تێبینیمان کردوون سییان هەیە.

کەواتە، هەموو کەروێشکێك سی هەیە.

ئەم حاڵەتەش بۆخۆی لەسیستەمی بیکۆندا پێیدەوترێت: پێوانەی تەواو. دیارە ئەمەش زەحمەتو مەحاڵەو ناکرێت یەکە بەیەکەی کەروێشکەکانی سەرئەم زەمینە بپشکنین بۆ ئەوەی دڵنیا بین لەوەی سییان هەیە یان نییانە. لێرەوە پێوانەی ناتەواو بەباشتر دەزانرێت، واتا تێبینی ناتەواو بۆ سامپڵێك کە لەکۆمەڵگەی توێژینەوە وەردەگیرێت، مەگەر لەحاڵەتێکدا کە کۆمەڵگەکە بچوك بێت، ئەو دەمە باشتروایە سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگەکە وەربگیرێت.

لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا پێوانەی تەواو، کارێکی سەختو دژوارە تەنها لەکۆمەڵگە بچوکەکاندا کە بەژمارە کەمن، کاری پێدەکرێت. لەجێی ئەو پێوانەی ناتەواو

بەکاردەهێنرێت، لەم رێگایەدا تێبینی سامپلێك دەکرێت لەنێو کۆمەڵگەیەکدا؛ بەمەرجێك ئەو سامپڵە هەڵگری خەسڵەتەکانی هەموو ئەندامەکانی کۆمەڵگەکە بێت. هەریەك لەبیرکردنەوەی هەڵهێنجان‌و بیرکردنەوەی پێوانەیی ئەگەر بەتەنها بەکارهێنران، ئەوا بەهایەکی سنوورداریان هەیە. بۆیە توێژەران رێگای زانستییان پەیرەو کرد کە ئاوێتەکردنی هەردوو رێگاکەیە بەیەکەوە.

## رێگای زانستی

لەمێژە فەیلەسوف‌و زانایان لەهەوڵی پێناسەکردنی رێگای زانستیدان. هەندێکیان لەپێناسەکردنیدا دەڵێن:" ئەو رێگایەیە کە پشت بەبیرکردنەوەی پێوانەیی‌و دەرئەنجام گەیشتن دەبەستێت‌و لەچارەسەرکردنی کێشەکاندا؛ شێوازەکانی تێبینی زانستی‌و؛ گریمان کردنی گریمانەو ئەزموون بەکاردەهێنێت بەمەبەستی گەیشتن بەئەنجامێکی دیاریکراو". هەندێکیتر دەڵێن:" رێگای زانستی بەکارهێنانی شێوازی شیکاری رەگەزەکانە بۆ سادەترین پێکهێنەری دیاردەو کێشە ئاڵۆزەکان. یاخود شێوازی پێوانەی وردو چارەسەری ئامارییە؛ بۆ داتاو زانیارییەکان کە بەچەند هەنگاوێکدا
تێدەپەرێت.

رێگای زانستی جیاواز لەهەر رێگایەکی دیکە، بەو داتایانەمان دەگەیەنێت، کە دوورە لەلایەنگرییەوە. واتا بابەتیەو هیچ خودگەراییەکی پێوە دیارنییە.

## زانست‌و ئامانجەکانی

زانست چالاکییەکی مرۆڤە، کە ئامانجی تێگەشتنی دیاردە سروشتییە هەمەجۆرەکانە؛ لەرێی دۆزینەوەی ئەو پەیوەندی‌و یاسایانەی کە کۆنترۆڵ‌و پێشبینی دیاردەکان دەکەن‌و؛ پەیبردنن بەو رێگایانەی کە گونجاون بۆ کۆنترۆڵ‌و پێشبینیکردنی دیاردەکان. زانست چالاکییەکی ئاراستەکراوە بەمەبەستی وەسف‌و پۆلێنی ئەو دیاردانەی کە لێیاندەکۆڵێتەوە، لەوەش

زیاتر پەیوەندی نێوان دیاردە جیاوازەکان دەدۆزێتەوە؛ چونکە بەتەنها تێگەشتن لەدیاردە؛ بەس نییە بۆ بەرقەرارکردنی زانست.

**زانست سێ ئامانجی بنەڕەتی هەیە کە بریتین لە:**

1.**تێگەشتن**: ئامانجی سەرەکی زانستەو جیایە لەوەسفکردن، چونکە تێگەشتن بەمانای پەیبردن دێت بەهۆکارەکانی دیاردەو فاکتەرەکانی ڕوودانی‌و بەتەنها ژماردنی خەسڵەتەکانی نییە. گرنگ ئەوە نییە وەسفی دیاردەیەك بکەین، لەوەش گرنگتر زانینی چۆنێتی ڕوودان‌و هۆکارەکانی ڕوودانیەتی. بەواتا زانینی پەیوەندی دیاردەکەیە بەو دیاردانەوە کە هۆکارن‌و؛ بەوانەشەوە کە بەهۆیەوە؛ ڕوویانداوە.

2.**پێشبینیکردن**: توێژەر کە لەیاساکانی ڕوودانی دیاردەیەك تێگەیشت، ئەو کاتە بەهۆی زانیارییەکانیەوە، دەتوانێت دەرئەنجام هەڵبهێنجێنێت‌و پێشبینی بکات. کەواتە پێشبینیکردن: وێناکردنی ئەو ئەنجامانەیە کە ئەشێت ڕووبدەن ئەگەر یاسا دۆزراوەکانمان بەسەردا پراکتیزە کردن. هەتا لێکچوون لەنێوان دیاردەکەو ئەو دیاردانەدا هەبێت کە یاساو زانیارییە دۆزراوەکانیان بەسەردا پراکتیزە دەکرێت؛ ئەوا توانای پێشبینیکردنیش زیاتر دەبێت. هەموو پێشبینییەکیش پێویستە بەشێوەیەکی ئەزموونگەری تاقیبکرێتەوە بۆئەوەی بسەلمێنرێت کە ڕاستی‌و دروستە.

3. **کۆنترۆڵکردن**: زانست لەهەوڵی کۆنترۆڵکردنی دیاردە جۆراو جۆرەکاندایە، ئەم ئامانجەش پشت بەهەردوو ئامانجەکەی پێشتر دەبەستێت. بۆ نموونە: ئەگەر پەروەردەکاران لەدیاردەی زیرەکی تێگەشتن‌و توانیان پەیوەندی زیرەکی بەخێرایی فێربوون‌و بەدەستهێنانی نمرەی بەرزەوە بدۆزنەوە، ئەوسا دەتوانن توێژینەوەی تایبەت بەخاوەن زیرەکی باڵاو؛ ئەوانەش کە ئاستی زیرەکییان نزمە؛ ئەنجام بدەن‌و هەلومەرجی فێربوون بۆ هەردوو گروپەکە دەستەبەر بکەن.

## یاساو تیۆرە زانستییەکان

کاتێك توێژەر ئەو گریمانەیەی کردوویەتی، ڕاستو دروستو؛ هیچ گومانێکی لەسەر نەما. ئەو کاتە گریمانەکە وەك تیۆر دەناسێنرێت. خۆ ئەگەر تیۆرەکەش توانرا بەسەر تەواوی دیاردە لێکچووەکاندا بگشتێنرێتو بەسەر هەموویاندا بچەسپێو ڕاست دەربچێت، ئەوا دەچێتە چوارچێوەی یاسای زانستییەوە.

یاسا بەبەڵگەی زانستی پشت ئەستورەو لەبەرانبەر ڕەخنەکاندا نالەرزێت. شایانی باسە ناجێگیریی‌و فرە ڕەهەندیو تێکهەڵکێشی دیاردەکان لەزانستە مرۆڤایەتییەکاندا، وایکردووە یاساکان لەبەرانبەر تیۆرەکاندا ژمارەیان کەمتر بێت، ئەم ڕەوشە لەزانستە سروشتییە ئەبستراکتەکاندا پێچەوانەیە، چونکە دیاردەکان زیاتر جێگیرو چەسپاوترن. بۆ نموونە: دەرنەچوونی خوێندکار بۆ دەیان هۆکاری جۆراو جۆر دەگەڕێنرێتەوە لەوانە: (ئامادەنەبوونی خوێندکار لەوانەکاندا، ئاستی عەقڵی خوێندکار، کێشەی خێزانو؛ داراییو؛ دەروونیو تەندروستی، شێوازی وانەوتنەوە، پرۆگرامی خوێندن، هۆکاری فیزیاوی وەك سەرماو گەرماو هەوای پیسو...تاد.) بەڵام لەفیزیادا ئەم گۆڕاوانە کەمترنو باشتر کۆنترۆڵ دەکرێن. بۆ نموونە: بەزیاترکردنی پلەی گەرمی کانزاکان دەکشێن. ئەم یاسایە جێگیرەو ڕوونو ئاشکرایەو گومان هەڵناگرێت.

**یاسا** بریتییە لەپەیوەندییەکی زەروریی لەنێوان دوو دیاردە یان زیاتردا. بۆ ئەوەی باشتر لەیاسا تێبگەین، لێرەدا دیارترین خەسڵەتەکانی دەخەینەڕوو:

1. یاساکان هیچیان ڕەهانین؛ واتا مەرج نییە بۆ هەموو کاتو هەموو شوێنێك؛ ڕاستو دروست دەربچن. ڕەنگە بۆ سەردەمو بۆ شوێنێك ڕاست بنو بۆ سەردەمێکیترو شوێنیکتر ڕاست دەرنەچن.

2. یاسا زانستییەکان بەگشتی مەزەندەکراونو سەد لەسەد وردنینو؛ لەگەڵ بەرەو پێشــچوونی مەعریفەدا؛ گۆڕانکاریو هەموارکردنیان بەســەردا دێتو وردتر دەبنەوە.
3. یاســاکان لەگۆڕاندان، کاتێك یاســایەك دەگۆڕێت یاســایەکی دیکە دێتە ئاراوە کە لەسەر ئەو بنیاتنراوەو بەڵام وردتر.
4. یاســـاکان توانای پێشــبینکردن لەخۆ دەگرنو مەبەســتیانە کۆنترۆڵی کێشـەکانی ئاینده بکەن ئەگەر سـەرلەنوێ سـەریانهەڵدایەوە، تاکو بتوانرێت بەئاسانی چارەسەر بکرێن.
5. هەر یاسایەك بۆخۆی چەندین ڕاستی لەخۆ دەگرێت. بۆ نموونە: یاسای لویس پاستۆر دەڵێت: میکرۆب هۆکاری بۆگەنکردنی زۆرێك لەمادەکانە وەك شلەو تەنە ئەندامییەکان.
6. یاساکان کورتو پوختنو دورن لەدرێژایەتیو درێژدادرییەوە.
7. تیۆر ســەرەڕای ئەوەی لەیاســا دەچێت بەڵام ئاســتی ڕێژەییەکەی زیاترە. تیۆر گریمانێکی زیرەکانەیە ڕەنگە لەهەموو ســەردەمو شــوێنێکدا پراکتیزە نەبێتو؛ بەبەراورد لەگەڵ یاسادا کەمتر ڕاستی لەخۆدەگرێت.
**تیۆر** بریتیە لەچوارچێوەیەکی هزری بۆ ڕاڤەکردنی گروپگەلێـك حەقیقەتی زانســتی. ئەو حەقیقەتانەش وا پێویســت دەکات جۆرێك لەپەیوەندییان لەنێواندا هەبێت، ئەکرێت گشــتاندنی بۆ بکرێتو ڕەنگە توانای پێشــبینی کردنیشی هەبێت. هەر تیۆرێکی زانستی دەبێت ئەم ڕەگەزانە لەخۆبگرێت:
1. بوونی چەمك تایبەت بەخۆی. هەر تیۆرێکی زانســتی کۆمەڵێك چەمکی تایبەت بەخۆی هەیە. بۆ نموونە: تیۆری شیکاری دەروونی سیگمۆند فرۆید چەنـدین چەمکی لەگەڵ خۆیـدا هێنـا وەك (نەســـت، منی بـاڵا، گرێی ئۆدیبو...تاد).

2. دەبێت تیۆر پەیوەندی نێوان دوو دیاردە یان زیاتر دەربخات‌و لەنێوان چەند گۆڕاوێکدا پەیوەندی بدۆزێتەوە.
3. تیۆر واقیعمان بۆ لێکدەداتەوەو باشترین تیۆر زۆرترین ڕاستی لەخۆدەگرێت.
4. ئەو تیۆرە دروست‌و کاملە کە ئەم تایبەتمەندێتیانەی خوارەوەی هەبێت:
- کورت‌و پوخت بێت‌و درێژایەتی لەخۆنەگرێت.
- گشتگیر یاخود سەراپاگیر بێت.
- تاکگەرایی‌و سەربەخۆیی هەبێت، واتا هەر تیۆرێك حەقیقەت‌و بابەتی تایبەت بەخۆی‌و مەیدانی لیکۆلینەوەی خۆی هەیە.
- توانای پێشبینیکردنی هەبێت، واتا لەهەناوی خۆیدا؛ ڕێنمایی بۆ ئایندە هەڵگرتبێت.
- زۆرترین چەمك‌و ماناو حەقیقەت لەخۆبگرێت‌و کورتیان بکاتەوە.

تیۆری زانستی بەم ئەرکانە هەڵدەستێت:
1. بەرەو پێش بردنی زانست‌و گەشەپێکردنی بوارەکەی خۆی.
2. دیاردە ئاڵۆزو نادیارەکانمان بۆ لێکبداتەوەو ڕوونیان بکاتەوە.
3. تیۆری زانستی لەچەند چەمك‌و زاراوەیەکی تەکنیکی پێکدێت، لەهەر بوارێکدا ئەگەر چەمکی زیاتر هاتەئاراوە، مانای وایە زانین و مەعریفە لەو بوارەدا هەنگاوی بەرەو پێشەوە ناوە.
4. تیۆرەکان مەیدانی توێژینەوە دەست نیشان دەکەن تاکو بەرچاوی توێژەران ڕۆشن بێت‌و بتوانن مەیدانی پسپۆڕی خۆیان بناسنەوە، گەر وانەبێت ئەوا جۆرێك لەتێکەڵی دێتە ئاراوەو پسپۆڕی نامێنێت.

## کتێبخانەو ڕۆڵی لەتوێژینەوەی زانستییدا

بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە، توێژەر پێویستی بەسەرچاوەی زانستییە، لەیەکەم هەنگاودا ڕوو لەکتێبخانەکان دەکات. بەهۆی زۆری بڵاوکراوەو بەرەو

پێشـچونی چاپو تەکنۆلۆژیای تایپکردنەوە، ئەمڕۆ ژمارەی کتێبو نامیلکەو گۆڤـارو ڕۆژنـامەو توێژینەوەکـان هێنـدە گەورەو بەرفراوانەو بەجۆرێکە نـاتوانرێـت بەبێ ڕێکخســـتنو پۆلێن کردن، بەئـاســـانیو بەزوترین کات؛ ســـەرچـاوەی پێویســـتمـان دەســـت بکەوێـت، بۆیە چەنـدین هەوڵ بۆ ڕێکخسـتنو پۆلێنکردنیان؛ دراوە ، لەناویاندا پۆلێنی فەیلەسـوفی ناودار جۆن دیۆی لەهەموویان نـاسراوترەو؛ لەهەموو کتێبخـانە جیهـانیو نیشـــتمـانیو ئەکادیمیەکاندا کاری پێدەکرێتو پشـــتی پێدەبەســـترێتو بەپۆلێنی (دەیی) ناوبانگی دەرکردووە. لەم ســـیســـتمەدا هەر کتێبو بڵاوکراوەیەك ژمارەی تایبەتی بەپێی گروپو تایبەتمەندێتی؛ بۆ دانراوە. لێرەدا بەکورتی ئاماژەیەکی بۆ دەکەین:

پۆلێنی دەیی جۆن دیۆی بۆ ڕێکخستنی مەعەریفە بوارەکانی کتێب

| بوار | ژمارەی ڕیزبەندی |
|---|---|
| مەعریفەی گشتی | 00 – 99 |
| فەلسەفەو سایکۆلۆژیا | 100 – 199 |
| ئایینەکان | 200 – 299 |
| زانستە کۆمەڵایەتییەکان (بەپەروەردەو فێرکردنەوە) | 300 – 399 |
| زمانەکان | 400 – 499 |
| زانستە ئەبستراکتەکان (ماتماتیك) | 500 – 599 |
| زانستە سروشتییەکان | 600 – 699 |
| هونەرە جوانەکان | 700 – 799 |
| ئەدەبییات | 800 – 899 |
| جوگرافیاو مێژوو | 900 – 999 |

ئەگەر لەو زنجیرەیەدا؛ زانســـتە کۆمەڵایەتییەکـان بەنموونە وەربگرین؛ ئەویش بۆخـۆی پۆلێنی تـایبەتی بۆ کراوە کە لەنێوان (300 - 399)دا ڕیزبەندی خۆی هەیەو بەم جۆرەیە:

| بوار | ژمارەی ڕیزبەندی |
| --- | --- |
| سۆسیۆلۆژیا/ کۆمەڵناسی | 309 – 300 |
| ئامار | 319 – 310 |
| ڕامیاری | 329 – 320 |
| ئابوری | 339 – 330 |
| یاسا | 349 – 340 |
| کارگێری گشتی | 359 – 350 |
| خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی | 369 – 360 |
| پەروەردەو فێرکردن | 379 – 370 |
| بازرگانیو گواستنەوە | 389 – 380 |
| نەریتەکان | 399 – 390 |

ئەم بەشـــانەش بۆ بەشـــە وردەکان پۆلێن کراون. بۆ نموونە بەشی تایبەت بەپەروەردەو فێرکردن بەسـەر چەند بەشێکی وردتردا دابەش کراوەو ئەمانەی خوارەوە؛ لەو بەشانەن:

| بوار | ژمارەی ڕیزبەندی |
| --- | --- |
| تیۆرو فەلسەفەکانی فێرکردن | 370،1 |
| سایکۆلۆژیای پەروەردەیی | 370،15 |
| پەروەردەی مامۆستایانو ڕاهێنانیان | 370،7 |

| | |
|---|---|
| توێژینەوە پەروەردەییەكان | 370،78 |
| وانەوتنەوە | 371 |
| پەروەردەی وەرزشی | 371،73 |
| پرۆگرامەكان | 375 |
| خوێندنی باڵاو زانكۆیی | 378 |
| تاقیكردنەوەكان | 371،37 |
| نەهێشتنی نەخوێندەواری | 374 |
| فێركردنو دەوڵەت | 379 |

ه

**چۆنیەتی نوسینەوەی یادداشت**

دوای دەستكەوتنی سەرچاوەكە، توێژەر ئەم هەنگاوانە دەگرێتەبەر:

1. وەرگرتنی دەق: توێژەر ووشـەو دەسـتەواژەكانی نووسـەر وەك خۆی بەبێ دەستكاری وەردەگرێتو دەیخاتە نێوان دوو جووت كەوانەوە "........" .

2. سـەرلەنوێ دارشـتنەوەی بیرۆكەو هزری دیاریكراو: توێژەر جارێكی تر بیرۆكەكەی نووسـەر بەدەسـتكاری كردنو بەشـێوازی تایبەت بەخۆی؛ سەرلەنوێ دادەرێژێتەوە.

3. پوخت كردنەوە: توێژەر بەشـێوەیەكی كورت بیرۆكە سـەرەكییەكان یان ئەو ناوەرۆكەی لەووتارەكەدایە، كورتو پوختی دەكاتەوە.

4. هەڵسـەنگاندن: لێرەدا توێژەر سـەرنجو تێبینییەكانی خۆی (هاوڕا یان جیاوازو دژ) سەبارەت بەدیدو بۆچونەكانی نووسەرەكە؛ تۆمار دەكات.

سـەرجەم تێبینیو بابەتە نوسراوەكانیش كە لەسـەرچاوەكانەوە وەرگیراون، لەكارتی تایبەتدا تۆمار دەكرێن. ئەو كارتەش پێوانەكەی نزیكەی (25×20)سـمو؛ كاغەزێكە؛ ئەسـتورترە لەكاغەزی ئاسـاییو بە

ئارت(مقەبایەکی تەنکە) ناسراوەو بەکارهێنانی ئاسـانەو نادڕێتو نافەوتێت.
کارت وەك دیارە دوو ڕووی هەیە بەم شێوەیە بەکاردەهێنرێت:
ڕووپەڕی یەکەم: ئەو بابەتەی تێدایە کە دەقاودەق لەسـەرچاوەوە هێنراوە، وەك ئەم نموونەیە:

| |
|---|
| " ترس... بزوێنەری حەزی دەسەڵاتخوازانەی کەسێتی توندوتیژە. ئەو گەورانەی ئەمڕۆ توندوتیژن، لەڕابردوودا تـاڵاو و ئـازاری سزای قورسی دەسـەڵاتێکیان چەشـتووە کە بەزۆر ملکەچی کردوون. ئەو سزایە مەرج نییە لەڕابردوویەکی نزیکـدا بوو بێـت، لەوانەیە بۆ قۆنـاغی منـداڵی بگەڕێتەوەو سـەرچاوەکەی باوکێکی دڵڕەق یان مامۆسـتایەکی سـتەمکار بووبێت. گرنگ نییە لەچ کاتێکدا ڕوویدا بێتو لەلایەن کێوە بوو بێت، لەهەموو حـاڵەتەکانـدا ملکەچێکی نـاعەقڵانی بەرهەم هێنـاوە کە بەلای بیرکردنەوەی عاتیفیی ویژدانیدا ئارەزووومەندەو، ڕق وکینەی پەنگخواردوو، وای لێکردووە کە خوازیـار بێـت ئەزموونی ڕابردووی خۆی، بەسـەر کەسانیتردا دوبارە بکاتەوە. بۆیە لەهەلپەی دەسەڵات گرتنەدەستدایەو بۆ ئەو مەبەسـتەش هێزو توندوتیژی بەکاردەهێنێـت. ئەو ئـاواتەشی کە هـاتەدی، ملکەچـایەتی لەخەڵکی دەوێـت. ملەکەچ نەبووانیش ڕوبەڕوی سزای توندی ئەو دەبنەوە." |

ڕووپەڕی دووەم: ئەمانەی لەسەر تۆمار دەکرێت:

| | |
|---|---|
| ناوی سەرچاوە: | ترسو خۆشەویستی |
| ناوی نوسەر: | د. سابیر بۆکانی |
| ساڵا چاپ: | 2008 |
| دەزگای بڵاوکردنەوە: | خانەی چاپو بڵاوکردنەوەی چوارچرا، زنجیرە 177 |
| چاپ: | یەکەم |
| شوێنی چاپ: | عێراق، هەرێمی کوردستان، سلێمانی |
| لەکوێی سەرچاوەکەی دەستکەوتووە: | کتێبخانەی ناوەندیی زانکۆی سلێمانی |
| هەر تێبینییەکی تر........................................................ | |

ئاشکرایە لەرۆژگاری ئەمرۆدا، زۆربەی توێژەران ئامێری کۆمپیوتەری تاکەسیو تایبەت بەخۆیان هەیەو؛ بۆ مەبەستی جۆراوجۆر بەکاریدەهێنن. ئەکرێت لەتەواوی هەنگاوەکانی توێژینەوەشدا، سوود لەم تەکنۆلۆژیایە وەربگرنو هەر بابەتێکیان لەسەرچاوە زانستییەکانەوە هێنا، تایپی بکەنو لەشوێنێکدا؛ فایلو فۆڵدەری تایبەت بەخۆیانی بۆ بکەنەوەو بیپارێزن. شایانی باسە لەئێستادا بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاوە؛ بەکارهێنانی سیستمی کارت؛ لەکۆکردنەوەو نووسینەوەی یاداشتی توێژینەوەدا؛ کەمبۆتەوەو وەکو ساڵانی رابردوو نەماوەتەوەو کۆمپیوتەر جێگای گرتۆتەوە.

## توێژینەوەی زانستی

زۆرجـار هەردوو چەمکی (توێژینەوە) و (ڕێگای زانســتی) وەك دوو چەمکی هـاوواتـا؛ تێکەڵ بەیەکتری دەکرێن، گەرچی ڕەگەزی هـاوبەش لەنێوانیانـدا هەیە، بەڵام جیاکردنەوەیان بایەخی خۆی هەیە.

توێژینەوە پرۆســەیەکی فەرمی ڕێکخراوو چڕە بۆ درێژەدان بەشــیکـار؛ بەپەیڕەوکردنی ڕێگای زانســتی لەچـارەســەرکردنی کێشــەیەکـدا. یـاخود پراکتیزەیەکی نـافەرمییە بۆ نـاســینو زانینی کێشــەو دارشــتنی گریمـانەو تێبینکردنو شیکارو دەرئەنجام. کەواتە دەکرێت لەپێناسـەکردنی توێژینەوەدا بڵێین: چـالاکییەکی ڕێکخراوو ئـاراســتەکراوە بۆ دۆزینەوەو پەرەپێـدانی دەستەگەلێك لەداتای ڕێکخراو.

بۆئەوەی قوڵتر لەتوێژینەوە تێبگەین، بـاشــتروایە بەکورتی خەســڵەتو ناوەڕۆکەکەی لێرەدا بخەینەڕوو:

1. توێژینەوە بۆ چارەســەرکردنی گرفتێك ئاراســتە دەکرێت؛ کە ئامانجی کۆتـایی؛ دۆزینەوەی پەیوەنـدیە لەنێوان (هۆکـارو ئەنجـام) یـان لەنێوان گۆڕاوەکاندا.

2. توێژینەوە جەخت لەســەر گرنگی پەرەپێدانی گشــتاندنو بنەماو تیۆرەکان دەکاتەوە؛ کە ڕەنگە بەهۆیانەوە پێشــبینی بۆ ڕوداوەکانی ئاینده بکرێت. واتا توێژینەوە بریتی نییە لەکۆمەڵێـك بـابەتی دیـاریکراو، یـان گێڕانەوەی زانیارییەکان، یان کۆکردنەوەو گرێدانەوەی زانیاریو لەخشــتەنانیان، ئەم کارانە توێژینەوە نین شتی دیکەن.

3. توێژینەوە پشــت بەو شـارەزاییە دەبەســتێت کە دەشـێت تێبینی بکرێت یاخود لەســەر بەڵگەی ئەزموونی بنیات بنرێت. توێژینەوە (بەهرەو خورپە) وەك ڕێگایەك بۆ بنیاتنـانی مەعریفە ڕەتـدەکاتەوەو؛ تەنهـا ئەوانەیان قبوڵ دەکات کە دەکرێت لەڕێی تێبینیکردنەوە؛ بسەلمێنرێن.

4. توێژینەوە پێویســـتی بەتێبینیو وەســـفی ورد هەیە، توێژەران پێوانەی ژمارەییان؛ لە شـــێوەکانی وەســـفی چۆنێتی پێباشـــترە، خۆئەگەر دیاردەکە لەرووی چەندێتییەوە ژمارە نەکرێت، ئەو دەمە وەســـفکردنی چۆنێتی پەنای بۆدەبرێت.

5. توێژینەوە کۆکردنەوەی زانیاریی نوێ لەسـەرچاوە سـەرەتاییەکانەوە لەخۆ دەگـرێـت، یـاخـود زانـیـاری بەردەســـــتو فەراهەم بـۆ ئـامـانـجی نـوێ بەکاردەهێنێت. ڕەنگە خوێندکار هەندێك ئینسـکلۆپیدیاو کتێبو سـەرچاوە بخوێنێتەوەو پاشـان زانیارییەکانی ناویان لەشـێوەیەکدا بنوسـێتەوەو ڕێکیان بخات. ئەم کارانە هیچی نوێ لەخۆناگرنو؛ تەنها ڕێکخســـتنو دارشـتنەوەی ئەو نوسراوانەن کە پێشتر نوسراون؛ هەرگیز توێژینەوە نین. با ناوێکی دیکەیان لێبنرێت. ئیدی هەر ناوێکە.

6. لەوانەیە هەنـدێکجـار چـالاکی توێژینەوە نـارێـكو هەرەمەکی بێـت، بەڵام هەردەم چالاکییەکە کە بەوردی نەخشـــەی بۆ کێشرـــاوەو شـــێکاری ورد لەخۆدەگرێت.

7. توێژینەوە پێویستی بەئەزموونە، پێشتر توێژەر دەزانێت کێشەکەی چییەو کەسانیتر لەپێش ئەودا؛ چۆنو بەچ شێوەیەك لەو جۆرە کێشـــانەیان کۆڵیوەتەوە. چونکە ناکرێتو نابێت توێژەر ئاگای لەو چەمكو توێژینەوەو زانیارییانە نەبێت کە لەکارەکەیدا پێویستی پێیانە.

8. توێژەر بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدایە بـابەتیـانەو لۆژیکی بێـت، ئەویش بەسـەلماندنی ڕاسـتی هەنگاوەکان، یان ئەو داتایانەی کۆی کردونەتەوە، یان ئەو ئەنجـامـانەی پێیگەشـــتووە. بۆیە هەردەم بۆ نەهێشـــتنو سڕینەوەی لایەنگیریی تاکەکەسی خۆی تێدەکۆشێت.

9. توێژینەوە بەدوای وەڵامدانەوەی ئەو کێشـانەدا دەگەڕێت کە چارەســەر نەکراون. ڕەسەنایەتی نیشانەیەکی زاڵی توێژینەوەی سەرکەوتووە.

10. توێژینەوە چالاکییەکی وردو لەسەرخۆیەو دوورە لەکاری پەلەپەلیو هەڵەشەییەوە. کەمجار دەستخۆشی پیاهەڵدانو ئافەرین دەخوازێت. توێژەران نائومێد بوونیان لەبەرچاودایەو توشی شۆك نابن، بۆیە هەردەم تێدەکۆشنو ماندوو بوون نازانن.

11. توێژینەوە تۆمار دەکرێتو راپۆرتەکانی؛ زۆر بەوردیو وردەکارییەوە دەنوسرێتەوە، دەبێت تەواوی چەمکە گرنگەکانی ناوی پێناسە بکرێتو بناسێنرێنو دەکرێت ئاماژە بۆ ئاستەنگییەکان بکرێنو هەنگاوەکان بەدرێژی وەسف بکرێنو، سەرچاوەکان بەوردی پیشان بدرێنو، ئەنجامەکان بابەتیانە بخرێنەڕوو، دەرئەنجامەکان بەشێنەییو بەئاگاوە پێشکەش بکرێن.

12. هەندێجار توێژینەوە پێویستی بەئازایەتییە. مێژووی زانست گەواهی بەدۆزینەوە گرنگەکان دەدات؛ سەرەڕای سانسۆرو دژایەتی

13. دەسەڵاتە سیاسیو ئایینییەکان. دەسەڵاتی کەنیسە سەرکۆنەی زانای پۆڵەندی کۆپەرنیکۆس (1473-1543)ی کرد سەبارەت بەسروشتی کۆمەڵەی خۆر، کاتێك رایگەیاند خۆر نەك زەوی، سەنتەری کۆمەڵەی خۆرە. ئەم دۆزینەوە نوێیەش؛ ڕاستەوخۆ دژ بەتیۆری بەتلیمۆس بوو کە لەگەڵ بۆچوونی کەنیسەدا هاوڕابوو. ئەمڕۆش توێژەرە نوێیەکان لەهەندێك بواری وەك بۆماوەو ڕەفتاری سێکسیو...هتد، ڕوبەڕوی ڕەخنەی توندی ئەو کەسانە دەبنەوە کە بۆچوونو شارەزاییو ئەزموونەکانیان، لەگەڵ دەرئەنجامی ئەو توێژینەوە نوێیانەدا یەکناگرێتەوە.

دەکرێت بڵێین: میتۆدی توێژینەوەی زانستی: بریتیە لەبەکارهێنانو گرتنەبەری ڕێگاو شێوازی زانستی بۆ گەیشتن بەڕاستییە نوێیەکانو سەلماندنیان، لەپێناو دەوڵەمەندکردنو گەشەکردنی مەعریفەی مرۆڤایەتیدا.

**ڤان دالین**؛ لەپێناسـەی میتۆدی توێژینەوەی زانسـتیدا دەڵێت: "هەوڵدانێکی وردو ڕەخنەگرانەیە بۆ گەیشتن بەچارەسەری ئەو کێشانەی ڕوبەڕوی مرۆڤ دەبنەوەو ڕێگرن لەبەردەمیدا".

**ڕۆمل** دەڵێت:" ئامارو پشـــکنینی وردە بۆ دۆزینەوەی زانیاریو پەیوەندی نوێو لێکۆلینەوەیان، تاکو مەعریفەی مرۆڤایەتی گەشەبکاتو بەرەو پێشەوە بچێت".

**هەنگاوەکانی توێژینەوەی زانستی**

زۆرینەی شـــارەزایـان هەنگاوەکانی توێژینەوە لەحەوت هەنگاودا پوخـت دەکەنەوە کە بریتین لەمانە:

1. **دیاریکردنی کێشـــە**: هەنگاوی یەکەمەو تیایدا کێشـــەکە دەناســـێنرێت، کێشـــەی توێژینەوە ڕەنگە پرســـیارێك بێت لەبابەتێکی دیاریکراو، یان خاڵی نـاکۆکی نێوان ئەنجـامی توێژینەوەکـان بێـت، یـان لایەنێکی تەواونەکراوی مەعریفە بێت. دەبێت توێژەر بەوردی: سروشـتو بواری کێشـەکەی دیاری بکات.

2. **پیاچوونەوەی توێژینەوەکانی پێشوو**: لێرەدا توێژەر دەگەڕێتەوە سەر ئەو توێژینەوەو سەرچاوانەی لەبوارەکەیدا لەبەردەستدانو ئەنجامدراون.

3. **دارشـــتنی گریمانە**: توێژەر بۆ چارەســـەرکردنی کێشـــەکەی، کۆمەڵێك گریمانە دادەڕێژێت. لەوانەشـە بەهۆی هەندێك پرسـیارەوە، کە دایرشـتوون زانیاریو داتا کۆبکاتەوە.

4. **دارشتنی دیزاینی توێژینەوە**: توێژەر بەهۆی نەخشەو دیزاینێکەوە، هەوڵ دەدات وەڵامی چەند پرسیارێك بداتەوە یاخود گریمانەکانی تاقیبکاتەوە.

5. **تـاقیکردنەوەی گریمـانەکـان**: لێرەدا توێژەر بـابەتیـانە داتـاو زانیـاری کۆدەکاتەوە تـاکو ڕاســـتیو دروســـتی گریمـانەکانی، هەڵبســـەنگێنێتو دەریانبخات. خۆئەگەر ئەنجامەکان پاڵپشـــتی گریمانە بکەنو پشـــتڕاســـتی

بكەنەوە، ئەوا توێژەر گریمانەكە وەك چارەسەرێكی پەسەند بۆ لێكدانەوەی ئەنجامەكان قبوڵ دەكات. بەڵام ئەگەر لەگەڵ ئەنجامەكاندا یەكیان نەگرتەوە، لەم حاڵەتەدا ئەو گریمانەیە دور دەخاتەوە.

6. **شیكاری داتاكان:** لەدوای كۆكردنەوەی داتاكان، توێژەر بەبەكارهێنانی كەرەسەی ئاماری هەمەجۆر، داتاكان شیكار دەكات.

7. **لێكدانەوەی ئەنجامەكان:** لەدوا هەنگاودا توێژەر ئەنجامەكان لێكدەداتەوەو ڕاڤەیان دەكات تاكو بەو پوختەیە بگات كە پەیوەستە بەكێشەو گریمانەكانی توێژینەوەوە.

## ئیتیكی توێژینەوەی زانستی

ساڵانێكە، بەشێوەیەكی بەرچاو توێژینەوەی مەیدانی ئەنجامدەدرێتو بەتایبەتیش لەبواری كۆمەڵایەتیدا؛ كەسانێكی زۆر بەسامپڵ وەردەگیرێن. پێویستە لەتوێژینەوەكاندا؛ مافی ئەو خەڵكەی بەشدارییان پێدەكرێت؛ بەهەند وەربگیرێنو بزانینو ئاگادارببین كە:

1. هەموو كەسێك ئەو مافەی هەیە كە نەبێتە ئەندام لەسامپڵو ئەتوانێت لەتوێژینەوەدا بەشدارییپێكردن؛ ڕەتبكاتەوە.

2. مافی هەر كەسێكە وەڵامی هەندێك لەپرسیارەكان نەداتەوە ئەگەر ڕۆچوونە نێو تایبەتمەندێتی ژیانی تاكەكەسییەوەو هەستیارو شەرمهێن بوون. باشتروایە هەرلەسەرەتاوە ئەو جۆرە پرسیارانە دوور بخرێنەوە. لەم ڕووەوە پێویستە توێژەر:

- ڕەزامەندی گەورەكانو كەسوكار؛ یان مامۆستاو سەرپەرشتیارانی ئەو منداڵانە وەربگرێت كە بەنیازە لەتوێژینەوەكەیدا بەشدارییان پێبكات.
- پارێزگاری لەنهێنی وەڵامی تاكەكانی سامپڵی توێژینەوەكەی بكاتو زیاتر بایەخ بەتێكڕاو كۆی وەڵامەكان بدات نەك؛ بەیەكەیەكەی وەڵامی تاكە كەسەكان.

• بەهێما تاکەکانی توێژینەوەکەی بناسێنێت نەك بەناوی خۆیانەوە.
• مافی تاکەکەســـە لەپێش و لەدوای بەشـــداریکردنیەوە، ئاگای لەئامانجی توێژینەوەکە بێت و بیزانێت.
• ئەندامی سامپڵ هیچ تێچوونێکی ماددی توێژینەوە لەئەستۆ ناگرێت، وەك کۆپیکردن و بردن و هێنانەوەی لاپەڕەی وەڵامەکان.
• دیاریکردنی کات و رۆژو شـوێنی بەشـداریکردن لەتوێژینەوەدا، مافی تاکەکانی سامپڵی توێژینەوەیە نەك توێژەر.

رەهەنـدێکی دیکەی ئیتیکەکانی توێژینەوە تـایبەتە بەرێکاریی و ئەنجامەکانی توێژینەوەوە، ئەمانە دەگرێتەوە:

1. هەر گۆڕین و دەســـتکاری و ســـاختەکردنێکی ئەو داتـاو زانیـارییـانەی کۆکراونەتەوە، توێژینەوەکە بێبایەخ دەکەن و شکۆیەکی بۆ ناهێڵنەوە. توێژەر بۆی نییە هیچ لایەنێك لەداتاو زانیارییەکان بشـــارێتەوەو تەنها جەخت لەسەر ئەو لایەنانە بکاتەوە کە پاڵپشتی لەئەنجامەکانی دەکەن.
2. نابێت توێژەر لەدوای پوختەکردنی ئەنجامەکانی توێژینەوەوە، گریمانەکانی دابڕێژێت، ئەبێت رێکارییەکانی توێژینەوەکەی بۆ بەدیهێنانی راســـتی ئەو گریمانانە بن کە لەسەرەتاوە داینـاون.
3. پێویســـتە توێژەر لەگشـــت هەنگاوەکانی توێژینەوەکەیدا؛ خۆی لەهیچ کەموکورتی و ناتەواوییەك گێل نەکات، بەتایبەتیش لەهەڵبژاردنی ســـامپڵ و چارەســـەری ئاماریی و رێگاکانی پێوانەدا. لەهەر قۆناغێکدا ئەگەر هەڵەیەك روویدا، ئەبێت زووبەزوو چارەسەری بکات و لەیادیان نەکات.
4. دەسـتپاکی و راسـتگۆیی زانسـتی؛ بنەمای سـەرەکین لەگەیشـتن بەئەنجامی توێژینەوە، ئەنجامەکان ئەرێنی بن یان نەرێنی؛ پێویســـتە راســـتگۆیانەو بەبێ گۆڕین بخرێنەڕوو. وەکچۆن پێویسـتە رەنج و ماندووبوونی توێژەرانیتر نادیدە نەگیرێت و ئەبێت لەوەرگرتنی ســـەرچاوەو هێنانی دەقاودەقی تێکســـتەکاندا،

ئاماژەیان بۆ بکرێتو بەرهەمی هیچ کەسێك نەکرێت بەناوی کەسیترەوە بەتایبەتیش بەناوی خودی توێژەرەوە.

5. توێژەر نابێت ئەو رێکارییانەی توێژینەوەکەی ئەنجامبدات کە شوێنەواری نێگەتیڤ بەسەر تەندروستی جەستەیی و عەقڵیو دەروونی بەشداربووانەوە بەجێدەهێڵن، پێویستە هەموو بەرپرسیارێتییەك لەئەستۆ بگرێت کە رەنگە ئایدیاو بەهای بەشداربووان بڕوشێنێتو لەکەداریان بکات.

6. ئامانجی هەر توێژینەوەیەکی بابەتی؛ پێشخستنی مەعریفەیە بەبێ ئەوەی سووکایەتی بەدابونەریتو بیروباوەڕی کەسانیتر بکات. بۆیە هەر هەنگاوێکی توێژینەوەکە ئەگەر دژو ناکۆك بێت لەگەڵ سیاسەتو بۆچوونی باودا؛ ئەوا پێویستە توێژەر رەزامەندی لایەنی پەیوەندداروتایبەتمەند وەربگرێتو بەرپرسیارێتی تەواوەتی لەئەستۆ بگرێت.

## هەڵبژاردنی کێشەی توێژینەوە

تێزی دکتۆرا یان ماستەرنامە یان هەر توێژینەوەیەکی زانستی لەکێشەیەك دەکۆڵێتەوەو توێژەر لەهەوڵی چارەسەرکردنیدایە. قۆناغی گەیشتن بەکێشەو دیاریکردنی، یەکەمینو گرنگترین هەنگاوە لەتوێژینەوەدا. ئەم هەنگاوە زۆر لەوە قورسترە کە خوێندکار چاوەڕوانی دەکاتو کاتێکی زیاتریشی. پێوستە لەو کاتەی کە بۆی تەرخان کردوە. لەم قۆناغەدا پێویستە توێژەر لەسەرخۆو بەبێ پەلەکردن بابەتەکەی هەڵبژێرێتو؛ رەنگە زیاتر لەجارێك بابەتەکە بگۆڕێت تا بەبڕیاری کۆتایی دەگاتو لەسەر یەکێکیان جێگیر دەبێت.

ئەگەر بۆ توێژینەوەکانی پێشوو بگەڕێینەوەو لاپەڕەکانیان هەڵبدەینەوە؛ لەزۆریاندا بەناونیشانێکی سەربەخۆ کێشەی توێژینەوەمان بەرچاو دەکەوێت، لەوانەشە ئەو ناونیشانە نەبینین بەڵام لەشوێنێکی دیکەداو بەتایبەتی لەگەڵ بایەخی توێژینەوەدا؛ ئاماژە بەکێشەی توێژینەوە کرا بێت. ئاستەنگی هەڵبژاردنی کێشەی توێژینەوە بەزیرەکیو وریایی توێژەر چارەسەر

دەبێتو يەكلا دەبێتەوە، چونكە وەك قۆناغەكانيتر نييە كە ڕێو شـــوێنى دياريكراويان هەبێتو هەنگاوەكانيان ديارى كرا بێت.

لەهەڵبژاردنى كێشـــەى توێژينەوەدا؛ چەندين هۆكار هەيە كە ڕۆڵى ديارو زۆر كاريگەر دەبينن‌و توێژەر پێويســـتە ئاگاداريان بێت تاكو ناونيشـــانێك بۆ توێژينەوەكەى هەڵنەبژێرێت كە بەرفراوان‌و فرە ڕەهەنـدە بێت‌و؛ نەزانێت بەرەو كوێ هەنگاو هەڵبگرێت.

كەواتە ئەو ســـەرچـاوانە كامـانەن؛ تـاكو توێژەر بۆ هەڵبژاردنى كێشـــەى توێژينەوەكەى پەنايان بۆ بەرێت‌و، ياخود يارمەتى بدەن تاكو گونجاوترين بـابەت ديـارى بكـات‌و كەمترين ئـاســـتەنگى بێتە ڕێگـا؟. لێرەدا ئـامـاژە بەگرنگترينيان دەدەين:

• ئەزموونەكـانى تـاكەكەس‌و پســـپۆڕى؛ بەپيتترين زەمينەن بۆ هەڵبژاردنى كێشـــەى توێژينەوە. ڕەنگە لەڕێى ئەزموونى كەســێتييەوە پێشـنيارى گەلێك كێشە بكرێت كە تێبينى كراون‌و وەكو پێويست لێكدانەوەيان بۆ نەكرابێت.

• زۆرێـك لەو بـابەتـانەى كە ڕۆژانە لەهۆڵەكـانى خوێنـدنـدا گفتوگۆو مشـــتومڕيان لەســـەر دەكرێت، شـــايانى لێكۆڵينەوەن. پێويســـتە خوێندكار بەوردى مـامەڵەيـان لەگەڵدا بكات‌و لاى خۆى تۆمـاريـان بكـات‌و؛ لەكاتى پێويستدا بگەڕێتەوە لايان.

• لەڕوپێوى كردنى توێژينەوەكانى پێشـوترەوە زۆر بابەتمان دەسـتدەكەوێت كە ڕەنگە ســـەرلەنوێ توێژينەوەيان بوێت، يان پێويســـتيان بەدەســـتكارى هەمواركردن بێت. ياخود جێى گومان بن‌و ســـەلماندنى تازەيان گەرەك بێت. توێژەر دەتوانێـت بۆ هەڵبژاردنى بـابەتى توێژينەوەكەى؛ بۆ پێشـــنيـارەكـانى (المقترحات) توێژينەوەكانى پێشـوو بگەڕێتەوە، كە لەزۆر لەتوێژينەوەدا لەژێر ناوى (توێژينەوەكانى ئايندەدا) ئاماژە بۆ چەند كێشـــەك كراوە تاكو نەوەكانى ديكە كاريان لەسەر بكەن.

• گەڕانو پرسیارکردنو ڕاوێژکردن بەشارەزایانو پسپۆڕان سەرچاوەگەلێکن بۆ دیاریکردنی ئەو کێشانەی شایانی توێژینەوە لەسەر کردنن.
هەندێك لەشارەزایان؛ لەژێر ڕۆشنایی چوار پێوەردا گونجاویو دروستی کێشەی توێژینەوە دیاری دەکەن، ئەو پێوەرانەش بریتین لە:
1. پێویستە کێشەکە لەدەستەواژەیەکی دیاریکراو یان پرسیارێکی ڕوونو ئاشکرادا؛ دابڕێژرێت.
2. پێویستە کێشەکە پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو یان زیاتر ڕوون بکاتەوە سەرەڕای دیاریکردنی ئەو کۆمەڵگەیەی کە توێژینەوەکە دەیگرێتەوە.
3. پێویستە ئەو گۆڕاوانەی کێشەکە دیاری کردوون؛ هاوتا بێت لەگەڵ ئەو گۆڕاوانەدا کە کەرەسەو ئامرازەکانی توێژینەوە لەبەشی تایبەت بەڕێکارییەکان (اجراءات) چارەسەری کردوون. هەروەها دەبێت ئەو کۆمەڵگەیەش کە لەکێشەکەدا دیاریکراوە لەگەڵ تاکەکانی سامپڵی توێژینەوەدا، گونجاو بێت.
4. پێویستە کێشەکە شایانی توێژینەوە یاخود قابیلی لێکۆڵینەوەی ئەزموونگەری بێت.
لێرەدا ئەو پرسیارانە دەخەینەڕوو کە دەبێت توێژەر لەپێش هەڵبژاردنی کێشەیەکی گونجاو بۆ توێژینەوەکەی؛ وەڵامی دروستی دابێتنەوە، ئەوانیش بریتین لە:
1. ئایا ئەو کێشەیەی هەڵمبژاردووە ئەتوانم لەڕێی توێژینەوەکەمەوە چارەسەری بۆ بکەم؟ ئایا دەتوانرێت زانیاریو داتای پێویستی بۆ کۆبکرێتەوەو تیۆرێکی بۆ بدۆزرێتەوە تاکو وەڵام بەپرسیاری کێشەی توێژینەوەکە بدرێتەوە؟
2. ئایا کێشەکە نوێیە؟ واتە ئەو بابەتەی کە توێژەر هەڵیدەبژێرێت؛ تازەو ڕەسەنەو پێشتر لەلایەن توێژەرانی دیکەوە لێکۆڵینەوەی بۆ ئەنجام نەدراوە؟ ئەم هەڵبژاردنەش پەیوەستە بەزیرەکیو وریایی توێژەرەوە؛ سەرەڕای ڕوپێویکردنی توێژینەوەکانی پێشترو؛ ئاگاداربوون لەو بابەتانەی کە بەئەنجام

گەیەنراون. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە هەر كێشەیەك پێشتر لێكۆڵینەوەی بۆ كرابێت؛ ئیتر هیچ كەسێك بۆ نییە جارێكیتر لێیبكۆڵێتەوە. چونكە بەهۆی پەرەسەندنەكانی مەعریفەو رۆشنبیریو؛ گەشەكردنو سەرهەڵدانی ئامرازو كەرەسەی نوێی توێژینەوە، دوبارە كردنەوەی توێژینەوەكانی پێشوو كارێكی زەرورەو بایەخی زانستی خۆیان هەیە. ئەمەو جگە لەوەی؛ ئەگەر توێژینەوەیەك زەمەنێكی بەسەردا تێپەڕی بێت یاخود لەژینگەیەكی دیكە ئەنجامدرابێت، ئەنجامدانەوەی لەزەمەنێكیترو لەژینگەیەكی دیكەدا هیچ لەبەهای توێژینەوە نوێیەكە؛ ناهێنێتە خوارەوە.

3. ئایا كێشەكە ئەوە ئەهێنێتو گونجاوە؛ توێژینەوەی بۆ بكرێت؟ ڕەنگە كێشەكە گونجاو بێت، ئایا بۆ منیش گونجاوەو لەتوانامدایە بەئەنجامی بگەیەنم؟

4. ئایا دەتوانم نەخشەو پلانی بۆ دابڕێژم؟ ئایا زانیاری پێویستم لەسەری هەیە تاكو سەرجەم بوارو ڕەهەندەكانی تێبگەمو بەشێكاری ئەنجامەكانم بگەم؟ ئایا دەتوانم دیزاینی بۆ بكەمو بەباشترین شێوە چارەسەری ئاماریی بۆ بدۆزمەوە؟

5. ئایا زانیاریو سەرچاوەو بەڵگەنامەی پێویستم دەستدەكەوێت؟ ئایا ڕاستی (الصدق)و جێگیریی (الثبات) ئامرازەكانیم بۆ دەردەهێنرێت؟

6. ئایا ڕێگام پێدەدرێت بەسامپڵ بگەمو ڕەزامەندیو لاری نەبوونم دەدرێتێ؟

7. ئایا مادەو داراییی پێویستم دەستدەكەوێت بۆ بەجێ هێنانی توێژینەوەكەم؟ ئەو داراییە چەندە كە دەمەوێت بۆ خەرجیو گواستنەوەو تایپو كۆپیو سەرچاوە كڕینو...هتد؟ ئایا خەرجییەكانم زۆر زیاتر نابێت لەو دەستكەوتەی كە دەستم دەكەوێت؟

8. ئایا کات بەشم دەکاتو ناکەومە پەلەپەلو بەنیوەو ناتەواوی بەئەنجامی ناگەیەنم؟ یاخود بەهۆی بێ کاتیەوە؛ بەیەکجاریو بەتەواوەتی دەستبەرداری نابم ؟
9. ئایا سەرپەرشتیار هەیە تاکو سەرپەرشتیم بکاتو ڕێنماییم بداتێ؟ ئەگەر سەرپەرشتیار هەیە، ئایا ئامادەیەو کاتی هەیە بۆ سەرپەرشتی کردنی توێژینەوەکەم؟ ئایا یاساو ڕێنماییەکان؛ ڕێی پێدەدەن سەرپەرشتی توێژینەوەکەم بکات؟ ئایا باری تەندروستی سەرپەرشتیار؛ ڕێگر نابێت لەسەرپەرشتی کردنی.
10. ئایا بەرگەی زەحمەتو ئاستەنگو دژوارییەکان دەگرمو لەنیوەی کارەکەدا نارِوخێمو؛ بەهۆی قورسی کێشە چاوەڕوان نەکراوەکانەوە؛ سارد نابمەوەو واز لەبابەتەکەم ناهێنم؟ لەگەڵ وەڵامی چەندین پرسیاری هاوشێوەیتردا.

**چۆنێتی دارِشتنی ناونیشانی توێژینەوە**

دوابەدوای هەڵبژاردنی کێشە یان بابەتێکی گونجاو بۆ توێژینەوە، زۆرجار لەناونیشانی توێژینەوەکەدا ڕاستەوخۆ ڕەنگدەداتەوە. لەڕاستیدا هەر کێشەکەیە دەبێتە ناونیشانی توێژینەوەکە، خۆئەگەر بەتەواوەتیش نەبێتە ناونیشان ئەوا بەڕێژەیەکی زۆر ناونیشانی توێژینەوەکە ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ کێشەکەو ئەو بابەتەی توێژینەوەکەی بۆ دەکرێت. نەبووەو ناشبێت کە ناونیشانی توێژینەوە هیچ پەیوەندییەکی بەکێشەی توێژینەوەکەوە نەبێتو لەگەڵیدا یەکنەگرێتەوە. پسپۆڕو شارەزایان چەند مەرجێکیان دیاری کردووە کە دەبێت لەدارِشتنی ناونیشانی توێژینەوەدا بەهەند وەربگیرێن. مەرجەکانیش بریتین لەمانە:
1. لەڕووی زمانەوانییەوە: پێویستە بەباشی دارێژرابێتو مانادار بێو ووشەی نەگونجاوو نەشیاوی تێدا نەبێت. هەروەها زاراوەی بێگانە (بۆ نمونە

زاراوەی عەرەبی ئەگەر توێژینەوەکە بەکوردی نوسرا بوو) نابێت بەکاربهێنرێت ئەگەر لەبەرانبەردا زاراوەکە بەزمانی کوردی هەبوو.

2. ووشەکان ڕوونبن واتا هەر ووشەیەك کە لەناونیشانەکەدایە ئاڵۆزو تەمومژاوی نەبێتو؛ بەیەك شێوە لێك بدرێتەوە.

3. ناونیشانی توێژینەوە لەشێوەی پرسیاردا داناڕێژرێتو ناخرێتەڕوو.

4. دەبێت توێژەر لەخۆی بپرسێت: ئایا ناونیشانەکەی مەیدانی کێشەی توێژینەوەی بەباشیو بەوردی دەسنیشان کردووە؟ ئایا گۆڕاوە سەرەکیو بنەڕەتییەکانی لەسەرەتای دەستەواژەی ناونیشانەکەدا داناوە؟

5. پێویستە ناونیشانەکە کورتو پوخت بێتو ووشە زیادەو ناپێویستەکان دور بخرێنەوە. لێرەدا بۆچونێك هەیە کە دەڵێت: باشتروایە ناونیشان لەپانزە ووشە زیاتر نەبێت.

6. پێویستە ناونیشانەکە ئەوەندە ڕوونو ئاشکرا بێت، بتوانرێت بەهۆیەوە توێژینەوەکە بخرێتە نێو خانەی خۆیەوە. واتا بتوانرێت لەگەڵ هاوشێوەکانیدا پۆلێن بکرێتو ڕاستەوخۆ بزانرێت: مێژووییە یان وەسفییە یاخود ئەزمونییە، یان ڕوپێوییە یاخود بەراوردکاریی یان مۆنۆگرافییە.

7. پاش کۆتایی هێنانو تەواوکردنی توێژینەوەکە، پێویستە ناونیشانەکە لەشێوەی قوچەکی هەڵگەڕاوەدا بنوسرێتەوە. وەك ئەم ماستەرنامەیە:

**ڕۆڵی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لەپاراستنی مافەکانی ژندا**

توێژینەوەیەکی مەیدانییە لەڕێکخراوە ناحکومییەکانی شاری سلێمانی

نامەیەکە پێشکەش بەبەشی کۆمەڵناسی سکوڵی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی کراوەو، بەشێکە لەداواکارییەکانی بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر لەکۆمەڵناسیدا

لەلایەن خوێندکار
عمر علی احمد

بەسەرپەرشتی
پ. د. صباح احمد محمد نجار

2012 زایینی ... 2712 کوردی

ئەگەر بەوردی سەرنج لەو شێوەیەی رابردوو بدەین، دەبینین تایبەتمەندێتیەك لە نوسینەکەدا هەیە. واتا لەسەر بەرگ یان لاپەڕەی یەکەمی توێژینەوەکە هەندێك مەرج دانراوە کە دەبێت توێژەر پەیڕەویان بکات. ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ :

1. جیاكردنەوەی توێژینەوە لەهەر بڵاوكراوەیەكی دیكە وەك كتێبو نامیلكەو گۆڤارو هەر چاپكراوێكیتر.
2. هەروەك ئاشكرایە چەمكی توێژینەوە (البحث) بۆ لێكۆڵینەوە زانستییەكانو بروانامەی بەكالۆریۆس بەكاردەهێنرێتو، بۆ ماستەریش؛ نامە (الرسالة)و لەگەڵ دكتۆراشدا؛ تێز (الاطروحة) بەكاردەهێنرێت. كاتێك دەنوسرێت: توێژینەوەیەكە پێشكەش بەو شوێنە كراوە، مەبەست دیاریكردنی ئەو سەنتەرو بەشو كۆلێجو زانكۆیەیە كە توێژینەوەی وەرگرتووەو بروانامەی پێدەبەخشێت. ئیتر پێویست ناكات لەهیچ جێگەیەكی تردا دوبارە بنوسرێتەوە. كە دەنوسرێت پێشكەش (كراوە) واتا فرمانەكە لەحاڵەتی ڕابردوودایە، بۆیە نابێت بنوسرێت: پێشكەش دەكرێت، چونكە (دەكرێت) بۆخۆی فرمانی ڕانەبردووی بەردەوامەو مانای وایە ئەو توێژینەوەیە بەردەوام هەر پێشكەش دەكرێت.
3. كاتێك ناوی بەشو كۆلێجو زانكۆكە؛ دەخرێتە پێش ناوی خوێندكارەكەوە. ئەمەش لەخۆڕا نییە چونكە ئەو سەنتەرو ناوەندە زانستییانە پلەو پایەیان لەخوێندكارەكە بەزرترەو مەبەست ڕێزگرتنو بەزر ڕاگرتنیانە.
4. ناوی خوێندكار كە دەخرێتە پێش ناوی سەرپەرشتیارەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە خوێندكارەكە خاوەنی توێژینەوەكەیەو؛ خۆی بەرپرسی یەكەمو كۆتایی لایەنە پۆزەتیفو نێگەتیفەكانی كارەكەیەتیو؛ ڕەنگە سەرپەرشتیار ناوەكەشی لەسەر بەرگی توێژینەوەكە هەر نەنوسرێت. سەرپەرشتیار ڕۆڵی لاوەكی هەیەو ڕاستەوخۆ هیچ لێپرسراوێتییەك لەئەستۆ ناگرێت، مەگەر لەئایندەدا یان بۆ سەرپەرشتیكردنی توێژینەوەی دیكەدا؛ بەشێوەیەك لەشێوەكان باجی هەڵەو كەموكورتیەكانی توێژینەوەی خوێندكارەكەی پێشوی بداتەوە كە ئەم سەرپەرشتی كردووەو لەژێر ڕێنمایی ئەمدا نووسیویەتی، یاخود شانازی بەتوێژینەوەی خوێندكارەكانیەوە بكات ئەگەر لەئاستی بەرزو باڵادا بوون.

5. ناوی سـەرپەرشـتیار پێویسـتە لەپاش نازناوە زانسـتیەكەیەوە بنوسرێت. ئاشــكرایە نازناوی زانســتیو ئەكادیمی لەبەرزەوە بۆ نزم بەم شــێوەیەیە: (پرۆفیســۆر، پرۆفیســۆری یاریدەدەر، مامۆســتا، مامۆســتای یاریدەدەر). ئاشــكرایە ماســتەرو دكتۆرا نازناوی زانســتی نین بەڵكو بڕوانامەن. بۆیە (دكتۆر) لەپاش نازناوەكەوە دەنوسرێت. بۆ نمونە: پرۆفیسۆر. دكتۆر سەباح ئەحمەد نەجار. زیاتر پیتەكانی یەكەم دەنوسرێت (پ: پرۆفیسۆر، د: دكتۆر) بەدوایدا ناوی ســیانیو؛ ئەگەر ســەرپەرشــتیارەكە نازناوی هەبوو ئەویش دەنوسرێت. هەروەك لەنموونەكەی پێشوودا هەیە.

6. مانگو ساڵی زایینی لەبەرانبەریشدا مانگو ساڵی كوردی یان كۆچی. ئەو مانگو ساڵەیە كە تیایدا توێژینەوەكە پێشكەش بەبەشەكە كراوە. ڕەنگە ئەو توێژینەوەیە تێزی دكتۆرا بێتو خوێندكارەكە زیاتر لەسێ ساڵ پێوەی خەریك بوو بێت. ئەو ساڵانە گرنگ نینو لەسەر بەرگ نانوسرێن. ئەوەی كە دەنوسرێت وەك ئاماژەمان پێدا. تەنها ساڵەكەیەو دەكرێتو مانگیشی لەگەڵدا نەبێت.

7. شــایانی باســە لەســەر لاپەڕەی یەكەمی پاش بەرگی پێشــەوە؛ بەبێ دەستكاری؛ هەمان شت دەنوسرێتەوە (واتا هەرچییەك لەبەرگەكەدا هەیە). بەڵام لەســەر بەرگی پشــتەوە، هەمان ئەو نوسراوانەی بەرگی پێشــەوە دەقاودەق دەنوسرێنەوە بەڵام بەزمانێكی دیكە. دیارە ئەو زمانەیتر؛ زمانێكی زیندووی جیهانییە.

**ئامانجەكانی توێژینەوە**

ئامانجەكانی توێژینەوە بەشـێوەی گشـتی دادەنرێنو هەوڵدەدرێت لەپرۆژەی توێژینەوەكەدا بەدی بهێنرێن؛ یـاخود ســـنوردارترو وردتر دەكرێنەوەو؛ مەبەســـتە تایبەتەكانی توێژینەوە دیاری دەكەن. شــارەزایان وایان پێباشــە ئامانجی گشتی بۆ پێكهاتەی بچوكتر؛ ورد بكرێتەوە تاكو بتوانێتو هاوكار لە:

1. دیاریکردنی میتۆدی توێژینەوەکە.
2. ئاراستەکردنی توێژەر لەکۆکردنەوەی داتاو زانیارییەکاندا.
3. شیکارکردنی داتاو زانیارییەکان؛ بەبەرنامەو پلانی وردەوە.
4. یارمەتیدانی توێژەر تاکو ئەنجامەکان؛ لەگەڵ ئامانجەکانی توێژینەوەدا؛ بەراورد بکات. ئەگەر هاتوو ئامانجەکان بەوردیو بەڕۆشـنی دیاری نەکران، ئەو کاتە ئاســـتەمو مەحاڵە بتوانرێت توێژینەوەکە هەڵبســـەنگێندرێتو بزانرێت بەچی گەشتووەو چی بەدیهێناوە.

ئەگەر بۆ ئـامـانجی گشـــتیو ئـامـانجە تـایبەتەکـانی؛ هەر توێژینەوەیەك بگەڕێتەوەو سەرنجیان لێ بدەین؛ بۆمان دەردەکەوێت: تاچەند کێشەکەیان لەخۆگرتووەو؛ قەبارەی کێشـەی توێژینەوە چەندەو لایەنەکانی کامانەن؟ ئەو فـاکتەرانە چین کە کـاریـان تێکردووەو هۆکـارن لەڕوودانیـدا؟ دواجـار بەچ شێوەیەك دەتوانرێت کێشەکە چارەسەر بکرێت؟.

• ئایا ئامانجەکان بەچەمکی زانستی دارێژراونو بەوردی؛ نەخشـەو کارنامەی توێژینەوەیـان دیـاریکردەوە؟ تـاکو بزانرێـت ئـاراســـتەی هەنگاوەکـان روو لەکوێن؟

• ئـایـا ئـامـانجەکـان واقیعینو تێکڕای بـاروزوف بەهەنـد وەرگیراونو لێکدراونەتەوە (کات، بودجەو تێچوون، ماندووبوون...هتد).

• فرمانەکانی نێو دەســـتەواژەو رســـتەی ئامانجەکان؛ ئایا دەکرێت پێوانە بکرێنو لەجۆرە فرمـانەن (دیـاریکردن، بەراوردکردن، ژمـاردن، پۆلێنکردن، روونکردنەوە، .. هتد). دەبێت توێژەر لەو فرمانانە دوور کەوێتەوە کە ئاڵۆزو نازانستینو نایەنە پێوانە کردن وەك: خەملاندن، تێگەشتنو ...هتد.

دیارترین جۆری ئامانجە تایبەتەکان، ئەم دوو جۆرەن:

1. **ئامانجە خەملێنراوەکان** (وەســـفییەکان): ئەو ئامانجانەن کە جۆرو بڕی دیاردەو شـتەکان دیاری دەکەنو ئەیخەملێنن، وەك دیاریکردنی رێژەی تاوان،

ژمارەی تووشـبووان بەنەخۆشـییەکی دیاریکراو، ئاسـتی بڵاوبوونەوەی مادە هۆشبەرەکانو...هتد.

2. **ئامانجە هۆکارییەکان** (پەیوەسـتگەرایی): ئەم جۆرە لەهەوڵی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان فاکتەرو دیاردەکانداندان، وەك دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان سـەرهەڵدانی قەیرانی کۆمەڵایەتیو جۆری تاوان، یان ئاسـتی زیرەکیو نمرەی خوێندکار، یاخود ناهاوسەنگی هەڵچوونیو جیابوونەوەی ژنو مێرد.

کەواتە ئـامـانجەکانی توێژینەوەی زانســتی؛ هەموو رێکاریو هەنگاوێکی بەشەکانی توێژینەوە؛ بەشێوەیەکی وردو ڕۆشن؛ دیاری دەکەنو؛ تەواوی ئەو زانیاریو داتایانەی کە گرنگ نین؛ دوور دەخەنەوە.

**گریمانەکانی توێژینەوە**

گریمـانە بریتییە لەخەمڵانـدن یـان پێشـنیـارێکی زیرەکـانە کە توێژەر؛ بەشـێوەیەکی کـاتی پێوەی وابەسـتەیەو زیـاتر لەڕای توێژەر دەچێـت بۆ چارەسـەرکردنی کێشـەی توێژینەوەکەی، یـان وەڵامە بۆ پرسـیـارەکانی توێژینەوە. لەسـەرەتای ئەنجامدانی توێژینەوەدا؛ دادەرێژرێتو هەمیشە دوو گۆڕاوی تێدایە ئەوانیش گۆڕاوی سـەربەخۆو گۆڕاوی پاشـکۆن کە توێژەر بەدوو شێوە ئاماژە بۆ پەیوەندی لەنێوان گۆڕاوەکان دەکات کە بریتین لە:

1. **گریمانی ڕاستەوخۆ**: ئاماژەی تێدایە کە پەیوەندی پۆزەتیف لەنێوان دوو گۆڕاوەکەدا هەیە، بۆ نموونە:

- پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان ئاسـتی زیرەکیو بەرزی نمرەی خوێندکاردا هەیە.
- نزمی ئاسـتی زانسـتی خوێندکارانی زانکۆ پەیوەسـتە بەنزمی ئاسـتی زانسـتی مامۆستای زانکۆوە.

2. **گریمانەی سـفری**: واتا پەیوەندی لەنێوان دوو گۆڕاوەکەدا نێگەتیفو پێچەوانەیە، بۆ نموونە:

• هیچ پەیوەندییەك لەنێوان بارگاوی بوونی زانكۆ بەسیاسەتو؛ نزمی ئاستی زانكۆدا نییە.

• هیچ پەیوەندییەك لەنێوان جگەرەكێشانو نەخۆشی شێرپەنجەدا نییە.

**خەسڵەتەكانی گریمانەی سەركەوتوو**

1. پێویستە گریمانە لەگەڵ حەقیقەتە زانستییە باوەكاندا، تەباو گونجاو بێتو نابێت دژایەتیان بكاتو؛ خەیاڵیو مەحاڵ بێت.
2. واقیعی بێتو بتوانرێت تاقیبكرێتەوەو بخرێتە بواری جێبەجێكردنەوە.
3. توانای هەبێت لەدیاردەكە بكۆڵێتەوەو ڕاڤەی بكاتو پێشنیار بێت بۆ چارەسەركردنی كێشەكە.
4. سادەو ساكارو كورتو پوخت بێت، نابێت لەداڕشتنندا تەمومژاویو ئاڵۆز بێت.
5. هەرگیز گریمانە لەشێوەی پرسیاردا دانارێژرێت.
6. دوور بێت لەدەمارگیریو حەزو ئارەزووی تاكەسییەوەو لایەنگیری تێدا نەبێت.

**دیاریكردنی چەمكو زاراوەكان**

لەتوێژینەوەی زانستیدا چەمكە سەرەكییەكان واتا ئەو چەمكانەی كە لەناونیشاندان یاخود بەشێوەیەك لەشێوەكان دەچنەوە سەریو نزیكن لێیانەوە؛ پێویستە پێناسە بكرێنو بەوردی مەبەست لێیان؛ بخرێنەڕوو. لەبەر ئەوەی چەمكە مرۆڤایەتییەكان بەچەندین شێوەو واتای جیاواز مانایان بۆ دادەنرێتو لێكدەدرێنەوە. ئەمەش بۆخۆی بۆ جیاوازی لەدیدوبۆچونو باگراوندی تیۆری ئەو زاناو پسپۆڕانە دەگەڕێتەوە كە پێناسەیان بۆ چەمكەكان كردووە.

هەموو چەمكێك زاراوەیە، بەڵام مەرج نییە هەموو زاراوەیەك چەمك بێت. ئەگەر چەمك جەخت لەسەر وێنەی زەینی بكاتەوە، ئەوا زاراوە جەخت

لەســەر ئاماژەی دەربڕین‌و گوزارشــتی چەمکەکە دەکاتەوە. چەمك ناوەڕۆکی ووشــەکەیەو لەڕووی مەعریفییەوە؛ ماناو ئاماژەکانییەتی. خەســڵەتەکانی ئەبستراکت‌و گشـتاندن؛ گرنگترین دوو خەسڵەتی چەمکن. بەڵام زاراوە زیاتر لایەنی زمانەوانی‌و بنەچەی ووشەکە دەگرێتەوە.

**چەمك** بریتیە لە کەرەســـتەیەکی ڕەمزی بۆ گوزارشـــت کردن لەماناو هزرو بیری جیـاواز؛ بەمەبەســـتی گەیـانـدیـان بەکەســـانی دیکە. لەزانســـتە مرۆڤایەتییەکاندا؛ توێژەران ناچارن زیاتر لەپێناســـەیەك بۆ هەر چەمکێك بکەن؛ چونکە:

1. چەمك لەئەزموونی کۆمەڵایەتی خەڵکییەوە ســـەرچاوە دەگرێت. هەر کۆمەڵە خەڵکێك؛ ئەزموونی هاوبەشی خۆیان هەیەو لەســـەری پێکدێن‌و مـانـایەك بۆ چەمکەکە دیـاری دەکەن. ئینجـا بەپێی جیـاوازی ژینگە کۆمەڵایەتییەکان، جیاوازیش لەمانای چەمکەکاندا دروست دەبێت.

2. هەندێك چەمك زیاتر لەمانایەکی هەیەو بەچەندین شێوە لێکدەدرێتەوە. بۆ نموونە: چەمکەکانی وەك: یەکســـانی، دیموکراسی، زیرەکی، ڕۆشـــنبیری، کولتور...هتـد. هەریەك بەجۆرێـك لێی تێـدەگـات‌و ڕاڤەی دەکـات، بۆیە ئاستەمە لەسەر یەك مانا ڕێککەوتن ڕوو بدات‌و بەرقەراربێت.

3. هەنـدێـك چەمـك تەمومژاوین‌و گوزارشـــت لەچۆنێتی دەکەن، بەپێی گۆڕانکاری لەهەست‌و ئارەزوو باری دەروونیمان؛ گۆڕانکاریش بەسەر مانای ئەوانیشـــدا دێت. وەك چەمکەکانی: زۆر، کەم، باش، خراپ، ســـارد، گەرم،...تاد.

4. چەمکەکان بۆ خۆیان بەپێی زەمەن گۆڕانکاری بەســـەر ماناکەیاندا دێت‌و بەجێگیری نامێننەوە.

لەبەر ئەو هۆکارانەو هۆکاری دی، دەبێت لەیەك پێنـاســـە زیـاتر بۆ هەر چەمکێك لەتوێژینەوەدا بخرێتەڕوو. پاش خستنەڕووی پێناسەکان وا باشترە

پێناسە بەهێزو بەناوبانگەکان لەپێشەوە بنوسرێن و لەکۆنەوە بۆ تازە ڕیزبەند بکرێن، ئەو سەرچاوانەش دەستنیشان بکرێن کە لێیانەوە وەرگیراون‌و بۆ هەر چەمکێك توێژەر پێناسەیەکی هاوبەش لەو پێناسانەوە هەڵدەهێنجێنێت کە نمایشی‌ـ کردوون. ئەم پێناسەیەش بەپێناسەی تیۆری ناوزەد کراوەو لەو مەبەستەوە نزیکە کە توێژەر هەیەتی سەبارەت بەچەمکەکە.
شایانی باسە لەتوێژینەوەی مەیدانیدا، دەبێت پێناسەی ڕێکاریی (اجرائي) بۆ چەمکەکان بکرێت. ئەم پێناسەیەش پشت بەو کەرەستەو ئامرازە دەبەستێت کە توێژەر لەلایەنی مەیدانیدا بەکاری هێناوەو؛ بەهۆیەوە داتاو زانیاری کۆکردۆتەوە. کەواتە پێناسەی کارڕایی پێناسەی توێژەرەو ئاماژەیە بۆ لایەن‌و بواری مەیدانی چەمکەکە. دوای خستنەڕووی ئەم پێناسەیە ئیدی کۆتایی بەپێناسەی ئەو چەمکە دێت‌و هەمان هەنگاو سەبارەت بەچەمکەکانیتریش دەگیرێتەبەر.

### سنوری توێژینەوە

هەر توێژینەوەیەکی زانستی‌و ئەکادیمی لەهەر بوارو بەشێکی زانست‌و مەعریفەدا ئەنجامدرابێت‌و ئەنجام بدرێت، سنورێکی دیاریکراوی هەیەو هەر بەپێی ئەو سنورەش گشتاندن بۆ ئەنجامەکانی دەکرێت‌و؛ نابێت لێی تێپەڕێت. ئەو سنورەش دەبێت زۆر بەڕوونی لەتوێژینەوەکەدا ئامارەی پێبدرێت ئیتر لەشوێن‌و بەشێکدا دەنوسرێتەوەو دەخرێتەڕوو ئەمەیان ڕای جیاوازی لەسەرەو کێشەیەکی ئەوتۆ نییە.
سنوری توێژینەوە ئەگەر بەکورتی باسی لێوە بکرێت خۆی لەچەند ڕەهەندێکدا دەبینێتەوە کە گرنگترینیان بریتین:
**ڕەهەندی مرۆیی**: مرۆیی واتا ئەو مرۆڤانەی کە توێژینەوەکە دەیانگرێتەوەو دەکرێت ئەنجامەکانیان بەسەردا بگشتێندرێت‌و کۆمەڵگەی توێژینەوەکە پێك دەهێنن.

**رەهەنـدی بـابەتی**: رەنگە کۆمەڵگەی توێژینەوە، رۆژنـامە یـان گۆڤـار یـان رادیۆ یـان هەر بـابەتێکیتر بگرێتەوە، لەم حـاڵەتەدا رەهەنـدەکە مرۆیی نییە بەڵکو بە رەهەندی بابەتی ناودەبرێت.

**رەهەندی زەمەنی**: واتا ئەو زەمەنەی کە توێژینەوەکەی تێدا ئەنجامدراوەو بواری گشتاندنیش هەر لەو زەمەنەدایە و بۆ زەمەنی دیکە نییە.

**رەهەندی جوگرافی**: مەبەست لەو شوێنەیە کە توێژینەوەکەی تێدا کراوە، واتـا لەجوگرافیـایەکی دیـاریکراودا ئەنجـامـدراوە، هەر لەو سـنورەشـدا گشتاندنەکە ڕاستو دروستە.

بۆ نموونە: ئەگەر توێژینەوەك بۆ (کێشەکانی خوێندکارانی زانکۆی هەڵەبجە) بۆ سـاڵی خوێندنی (2015 - 2016) بکەین. دەکرێت ڕەهەندەکانی سـنوری توێژینەوە؛ بەم شێوەیە دیاری بکەین:

سـنوری مرۆیی: سـەرجەم ئەو خوێندکارانە دەگرێتەوە کە سـەرقاڵی دەوامن بەهەموو( قۆنـاغو پسـپۆڕیو ڕەگەزو تەمەنو دەوامی بەیـانیـانو ئێواران‌و خوێنـدنی بـاڵاو...هتـد) لەکاتی ئەنجـامـدانی توێژینەوەکەدا، مۆڵەتی دەوام نەکردنی ساڵانەیان وەرنەگرتووە.

سـنوری زەمەنی: ئەو سـاڵی خوێندنەی کە توێژینەوەکەی تێدا کراوە واتا (2015 - 2016) نەك هیچ ساڵێکیتر.

سـنوری جوگرافی: مەبەسـت لەو زانکۆیەیە کە لەپارێزگای هەڵەبجەدایە، نـاکرێـت زانکۆیەکی دیکە بگرێتەوە کە لەشـارێکی دیکەیە، یان نـاوێکیتری هەیەو لەهەمان شـاردایە. گشـتاندنیش تەنها بەسـەر زانکۆی ناوبراویشـدا دەکرێت.

بەپێی ئامانجی توێژینەوەکان، سـنورەکانیش دەگۆڕێن‌و لەهەندێکدا سـنوری مرۆیی نییە، تەنها سـنوری زەمەنی‌و جوگرافی هەیە. بۆ نمونە لەتوێژینەوەی شـیکاری ناوەڕۆکدا کە توێژەرێك بەئامانجێکی دیاریکراو؛ شـیکاری ناوەڕۆکی

چەند ژمارەیەکی ڕۆژنامەیەك یان گۆڤارێك یان چەند هەڵقەیەك لەبەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی دەکات. لێرەدا سنورەکان دەگۆڕێن. سنورەکە سامپڵێکە لەڕۆژنامە یان گۆڤارەکە یان بەرنامە تەلەفزیۆنیەکەیە. سنوری زەمەنیش ئەو ماوە دیاریکراوەیە کە وەك سامپڵ وەرگیراوە. ڕەنگە سێ مانگ یان شەش مانگ یان سالێك بێت. لەمێژوویەکی دیاریکراوەوە تا مێژوویەکی تر کە بەوردی دیاریکراوە. ئیتر لەو ماوەیەدا چەند ژمارەی لەرۆژنامە یان گۆڤارەکە یان بەرنامە تەلەفزیۆنییەکە بەردەکەوێت، وەك کۆمەڵگەی توێژینەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

**توێژینەوەکانی پێشوو**

بەمەبەستی شارەزا بوونو سوود وەرگرتنو دەوڵەمەندکردنی پرۆژەی توێژینەوەی زانستیو ئەکادیمی، لەوەش زیاتر بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە بەجۆرێك کە چارەسەری پەسەندو داهێنەرانەی کێشەیەك لەکێشەکانی بواری پسپۆڕی توێژەر بکات. وا پێویست دەکات توێژەر بەوردی ئاگاداری ئەو توێژینەوانە بێت کە پێشتر لێرەو لەوێ ئەنجامدراون لەهەمان بوار؛ یان لەو بوارانەدا کە هاوشێوەو نزیکن لێیەوە. دەبێت توێژەر هەردەم لەگەڕانو پرسیارکردنو بەدواداچووندا بێت تاکو زۆرترین توێژینەوەی نوێی دەست بکەوێت. ڕەنگە ئەو توێژینەوانە ماستەرنامە یان تێزی دکتۆرا بن، لەوانەشە توێژینەوەی پسپۆڕو شارەزایان بێت کە لەگۆڤارو بلاوکراوە ئەکادیمیەکاندا یان لەبەرگی کتێبدا بلاویان کردونەتەوە. دەستکەوتنی هەرچی زیاتری توێژینەوە؛ بەرچاوی توێژەر بەرانبەر بەکێشەکەی ڕۆشنتر دەکەنەوەو؛ لەرووی تیۆرییەوە ڕۆشنبیری دەکەنو سەرجەم لایەنە نادیارەکان روناك دەکەنەوەو هەنگاوە نەنراوەکانی، ئاشکرا دەکەنو گوروتاوی کارکردن بەتینتر دەکەنو، باشترین هاندەرو یاریدەدەرن بۆ توێژەرو لەکارەکەیداو؛ وەلامی دەیان پرسیاری بۆ دەدەنەوە.

کەوابوو توێژەر پاش دەستکەوتنی هەر توێژینەوەیەك، بۆئەوەی بەزووترین کات کەڵکی لێوەربگرێت، باشتروایە ڕاستەوخۆ لەدووتوێی توێژینەوەکەی پێشوودا؛ کورتە یان پوختەی توێژینەوەکە بدۆزێتەوە، کە لەهەموو توێژینەوەیەکدا لەچەند لاپەڕەی کەمدا ئاماژەیان پێکراوە. چونکە خوێندنەوەی سەرجەم لاپەڕەکانی ئەو توێژینەوانە؛ هیچ زەرورەتێکی نییەو خوێندنەوەیان کاتێکی زۆر دەبات. دوای بینینی پوختە یان کورتە؛ دواتر پێویستە ئەم خاڵانە بەئەمانەتەوە وەربگیرێن:

- ناوی توێژەر: مەبەست لەنازناو یاخود ناوی باپیرە یان دوا ناوی کەسەکەیە.
- ساڵی ئەنجامدانی توێژینەوەکە.
- ناونیشانی توێژینەوەکە.
- ئامانجەکانی توێژینەوە. خۆئەگەر لەو توێژینەوەیەدا چەند ئامانجێك هەبوون، لەنێویاندا یەك یان دوو ئامانج نزیك بوون لەکارەکەی توێژەرەوە، ئەو کاتە گرنگترین‌و نزیکترینیان وەردەگرێت.
- کۆمەڵگەو سامپڵی توێژینەوە: ئەگەر توێژینەوەکە مەیدانی بوو؛ ئەو دەمە کۆمەڵگەو سامپڵی توێژینەوەکە بەووردی‌و بەژمارە وەردەگیرێن.
- ئامرازی توێژینەوە: ئەو ئامراز یان ئامرازانەیە لەتوێژینەوەکەدا بۆ کۆکردنەوەی داتاو زانیاری؛ بەکارهێنراون.
- کەرەستە ئامارییەکان: ئەو کەرەستەو یاسا ئامارییانە وەردەگیرێن کە توێژەرەکە لەچارەسەرکردنی داتاو زانیاریەکاندا بەکاریهێناون‌و سودی لێوەرگرتوون.
- ئەنجامەکانی توێژینەوە: ئەنجام یان ئەنجامەکان یاخود گرنگترین ئەنجام لەتوێژینەوەکەوە وەردەگیرێت، دیارە مەبەست لەوانەیە کە زیاتر نزیکن لەتوێژینەوەی توێژەرەوە.

پاش ئەوەی توێژینەوەی یەکەم وەردەگیرێت، بەهەمان شێوە هەمان لایەنو بوار لەتوێژینەوەکانی دیکەش وەردەگیرێن. ئەوەی لێرەدا گرنگە زۆری ژمارەی توێژینەوەکانی پێشـوو نییە، بەڵکو هاوشـێوەیی‌و؛ نزیکی زەمەنی توێژینەوەکانە کە هەتا تازەو هاوشـێوەبن باشـترە. ئەگەر تازە یان نزیك پەیدا نەبوون؛ ئەوا لەناچاریدا بۆ توێژینەوەی کۆن دەچین‌و دوور دەکەوینەوە. ئەمانە هەموو دەبن ئەوەی کە نـابێـت ئەوەیە کە بۆ توێژینەوەی پێشـــوو نەگەڕێین‌و بۆ دەسکەوتنیان خۆ ماندوو نەکەین.

پـاش خســـتنەڕووی توێژینەوەکـانی پێشـــوو (ئیتر بەپێی هەر ڕێســـایەك بخـرێنەڕوو: لە کۆنەوە بۆ نوێترین یـان بەپێچەوانەوە، یـان بەپێی نزیکی جوگرافی بۆ نمونە: کوردســـتانی، عیراقی، عەرەبی، جیهـانی ...هتـد). توێژەر دەبێت لەبڕگەیەکی دیکەدا گفتوگۆیان لەسەر بکات. گفتوگۆکەش لەم چەند خاڵانەدا دەکرێن‌و دەخرێنەڕوو:

- **ســـەبارەت بەئامانج:** لێرەدا توێژەر ئامانجی توێژینەوەکەی خۆی لەگەڵ ئامانجی توێژینەوەکانی پێشـوودا بەراورد دەکات‌و دەیســەلمێنێت کە تاچەند لەگەڵیاندا کۆکە؟؛ لە چ خاڵێك‌و لەگەڵ کامیاندا جیاوازی هەیە؟؛ لەچیداو لەگەڵ کامیاندا دژ بەیەکن؟. باشــتروایە خاڵی هاوبەشی نێوانیان زۆر بێت. خۆ ئەگەر یەکێك لەو توێژینەوانە لەڕووی ئامانجەوە هیچ جۆرە لێکچوون‌و پەیوەندی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوەی توێژەردا نەبێت؛ ئەوا باشـتروایە لاببرێت‌و زەرورەتی دانانی لەناو توێژینەوەکاندا، نامێنێت.
- **لەڕووی میتۆدی پەیڕەو کراوەوە،** لەگەڵ کامیانـدا هـاوبەشـــەو هەمان میتۆدیان بەکارهێناوە. هەروەها کام توێژینەوەیان میتۆدەکەی جیاوازە لەو میتۆدەی کە توێژەر بەکاریهێناوە؛ پێویستە ئاماژەی پێ بکرێت. لێرەدا دەبێت ئەوە بخرێتەڕوو، کە لەڕووی میتۆدەوە تاچەند سـود لەتوێژینەوەکانی پێشـوو وەرگیراوە.

• **سەبارەت بەژمارەی سامپڵو ڕێگاکانی وەرگرتنی.** توێژەر سود لەقەبارەو ژمارەی ئەندامانی سامپڵی توێژینەوەکانی پێشوو وەردەگرێت (ئیتر ئەو سامپڵە مرۆڤە، یان بڵاوکراوەو لاپەڕەیە، یاخود زەمەنی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی یان ڕادیۆیی.. هتد). دوای تاوتویێو بەراوردی ژمارەی سامپڵو ڕێگای وەرگرتنیان، بۆی دەردەکەوێت بۆ توێژینەوەکەی خۆی؛ گونجاوترین ژمارە؛ چەندەو کامەیە کە پێشتر وەرگیراوەو پەیڕەو کراوە؟. هەروەها باشترینو گونجاوترین ڕێگا لەوەرگرتنی سامپڵدا؛ کامەیە کە ئەوان پەیڕەویان کردوە.

• **سەبارەت بەئامرازی بەکارهێنراو بۆ کۆکردنەوەی داتاو زانیارییەکان،** توێژەر سود لەتوێژینەوەکان وەردەگرێتو دڵنیا دەبێت چ ئامرازێك لەبارو گونجاوە بۆ توێژینەوەکەی خۆی، کە بەکورتترین ڕێگاو بەکەمترین کاتو ماندووبوونو تێچوون؛ زۆرترین داتاو زانیاری بۆ کۆدەکاتەوە. لێرەدا توێژەر ئاماژە بەئامرازەکانی ئەوانو ئامرازەکانی خۆی دەکاتو دەیانخاتەڕوو.

• ئەوەی کە بۆ ئامرازەکانی توێژینەوە خستمانەڕوو. سەبارەت **بەکەرەسەو یاسا ئامارییەکانیش** هەر ڕاستەو توێژەر بۆ دیاریکردنی کەرەستەو بەکارهێنانیان؛ سود لەتوێژینەوەکانی پێشوو وەردەگرێت.

• ڕەنگە لە زۆر لایەنو بواو خاڵی دیکەشدا سود لەتوێژینەوەکانی پێشوو وەربگیرێت وەك دۆرزینەوەو دەرهێنانی جێگیریو ڕاستی پێویستە ئاماژەیان بۆ بکرێتو بخرێنەڕوو.

• ئەمانەو جگە لە **لایەنی تیۆریو ئەدەبییاتی** بابەتەکەوە کە بێگومان سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندنو لەڕووی تیۆرییەوە توێژینەوەکە لەبوارەکەی خۆیدا، دەخەنە ئاستێکی بەرزترەو سودو کەڵکی ئێجگار گەورەیان لێوەردەگرێت.

• تەنها لایەنێك کە لەگفتوگۆی توێژینەوەکانی پێشوودا؛ لێرەدا گفتوگۆیان لەسەر ناکرێت؛ ئەنجام یان ئەنجامەکانی توێژینەوەکانی پێشووە. کە

پێویســـتە توێژەر لەکۆتاییداو؛ لەگەڵا خســـتنەڕوی ئەنجامی توێژینەوەکەی خۆیدا؛ لەیەکێك لەبەشـــەکانی داهاتوودا؛ مشـــتومڕو گفتوگۆیان لەســـەر بکات.

**پلانی توێژینەوە**

پلانی توێژینەوە بریتیە لەو پرۆژەیەی کە توێژەر دەیـدات بەو لایەنەی کە توێژینەوەکەی بۆ دەکات یان پێشـــکەشی دەکات، بۆ نمونە خوێندکار پلانی توێژینەوەکەی پێشـکەش بە بەشـە زانسـتییەکەی یان بەسـەرپەرشـتیاری توێژینەوەکەی دەکات، کە بەشـەکەی بۆی دیاری کردووە تا سـەرپەرشـتی توێژینەوەکەی بکات؛ یاخود خۆی بەسـەرپەرشـتیار هەڵیبژاردووە. ئەم پلانە نەخشـــەڕێگاو هەنگاوەکانی کارەکەی تێدا بەکورتیو بەپوختی خراوەتەڕوو. لەپلانی توێژینەوەدا وا پێویست دەکات توێژەر ئاماژە بەم لایەنانەی خوارەوە بدات.

1.**کێشـــەی توێژینەوە**: دەبێت توێژەر بۆ بەرانبەرەکەی (ئەگەر خوێندکار بوو بۆ سـەرپەرشـتیارو لیژنەی زانسـتی بەشـەکەی) هۆکارەکانی هەڵبژاردنی بابەتەکەی بخاتەڕوو. پاساو بۆ هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوەکەی بهێنێتەوەو؛ تێیانبگەیەنێتو بڕوایان پێبهێنێت کە ئەو کێشـــەیەی ئەم هەڵیبژاردووە؛ پێویست بەوە دەکات توێژینەوەی لەسەر ئەنجام بدرێت.

2.**گرنگی توێژینەوە**: لێرەدا توێژەر زۆر بەوردیو بەڕوونی ئەو کەڵكو سودانە باس دەکات کە دەشـــێت لەتوێژینەوەکەیەوە بکەنەوەو؛ هاوکات ئاماژە بەو لایەنو گروپو کەسـێتیو ...تاد. دەدات کە ڕەنگە لەسـودی توێژینەوەکەی ئەم بەهرەمەند ببن.

3. **ئامانج یان ئامانجەکانی توێژینەوە**: لەم قۆناغەدا لەسەر توێژەر پێویستە کە ئامانج یان ئامانجەکانی توێژینەوەکەی بەڕوونیو ئاشـــکرایی بخاتەڕوو. واتا بەژمارە (یەك، دوو، سێ) ئامانجەکان دیاری بکات بەجۆرێکی ئەوتۆ

ڕوون بێت کە هەموو کەسێك لێی تێبگاتو؛ بەیەك ماناو ئاراستە ڕاڤەی بکەن. ڕەنگە لەشێوەی پرسیاردا، چەند پرسیارێك بکاتو وای بخاتەڕوو کە توێژینەوەکەی لەهەوڵی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەدایە..

4. **سنوری توێژینەوە**: دەبێت لەسنوری توێژینەوەدا ئاماژە بە ڕەهەندەکانی (مرۆیی یان بابەتی، زەمەنیو جوگرافی) بدرێتو ئەو سنورانە بەوردیو بەتەواوی ئاشکرا بکرێن.

5. **دیاریکردنی چەمکەکان**: لێرەدا ئەو چەمکانە پێناسە دەکرێن کە لەناونیشانی توێژینەوەکەدا هاتوون، یاخود لەچەمکەکانی نێو ناونیشانەکەوە نزیکنو لەگەڵیدا یەکدەگرنەوە. بۆ هەرچەمکێك زیاتر لەپێناسەیەك دەنوسرێتو بەوردیش ئاماژە بۆ خاوەنی پێناسەکەو؛ ئەو سەرچاوەیەش دەکرێت کە پێناسەکەی لێوەرگرتووە.

6. **توێژینەوەکانی پێشوو**: توێژەر دەبێت لەو توێژینەوانە ئاگادار بێت، کە لەبواری بابەتی توێژینەوەکەیدا پێشتر ئەنجامدراون. لێرەدا دەبێت هەندێك ئەو توێژینەوانە ئاماژەیان پێدەدرێت کە دەست توێژەر کەوتوون، هەروەها بواری ئەوەش بهێڵێتەوە کە بەدوای توێژینەوەی دیکەدا دەگەڕێتو لەهەوڵی دەستکەوتنیاندایە.

7. **میتۆدی توێژینەوە**: میتۆد یان ئەو میتۆدانەی کە توێژینەوە پشتی پێدەبەستێت، باس دەکرێتو لەچەند دێڕێکی کەمدا دەخرێتەڕوو.

8. ئامرازی توێژینەوە: واتا ئامراز یان ئەو ئامرازانەی کە لەتوێژینەوەکەدا بەکاردەهێنرێن بۆ کۆکردنەوەی داتاو زانیاری وەك (چاوپێکەوتن، فۆرمی ڕاپرسیو، پێوەرو تێبینی)، دەبێت دەستنیشان بکرێنو هۆکاری بەکارهێنانیان؛ دیاری بکرێت.

9. **کەرەستە ئامارییەکان**: ئەگەر لەتوێژینەوەدا پشت بەئامار ببەسترێت؛ دەبێت ئەو کەرەسەو یاسا ئامارییانە دیاری بکرێن کە ئەگەری بەکارهێنانیان لەتوێژینەوەکەدا هەیە.

10. **سـەرچاوەکان:** بەبێ دەسـتکەوتن و بینین و خوێندنەوەی سـەرچاوەو ژێدەرەکان، توێژەر بۆی نییە کێشـەو بابەتی توێژینەوەکەی دیاری بکات. بۆیە پێویسـتە توێژەر ئاگای لەو توێژینەوەو کتێب و گۆڤارو بڵاوکراوانە بێت کە بەشێوەیەك لەشێوەکان لەسەر بابەت و کێشەی توێژینەوەکەی؛ نوسراون و بڵاوکراونەتەوە. لێرەدا توێژەر ژمارەیەك لەو سـەرچـاوانە دەخـاتەڕوو کە لەبەردەسـتیدان و ئـامـاژە بەوە دەکـات کە لەهەوڵی پەیـداکـردنی سەرچاوەیتردایە.

ئەو خاڵانەی سـەرەوە، ئەو نەخشـەیەن کە توێژەر دایڕشـتووەو بەنیازە لەسـەری بڕوات. مەرج نییە ئەو نەخشـەیە بەجێگیری بمێنێتەوەو هیچ گۆڕانکارییەکی بەسـەردا نەیەت و دەقاودەق وەك خۆی جێ بەجێ بکرێت. بەڵکو بەپێی کارکردن و چوونە ناو بوارەکانی ئیشـەوە، زۆر لایەن و بوار دێنە پێشـەوە کە توێژەر لەکاتی ئامادەکردنی پلانی توێژینەوەدا، هەرگیز بەیادیدا نەهـاتوون. بۆیە بەپێی ئەو ئەگەرانە؛ ڕەنگە گۆڕانکـاریش لەپلانەکەدا ڕووبدات؛ بۆیە دەرگاکان بەکراوەیی بەجێ دەهێڵرێن. گۆڕانکاری کەم تەنانەت گۆڕانکاری ڕیشەیش ئەگەرێکن و لەوانەیە ڕووبدەن.

## میتۆدی مێژوویی

هەر دیاردەیەك لێی بکۆڵینەوەو لەڕابردوودا روویدا بێتو؛ هەموو ئەو دیاردانەش کە باکگراوندی مێژووییان هەیە، پێویستە بەمیتۆدی مێژووی توێژینەوەیان لەسەر بکرێت.

مێژوو بریتیە لەتۆمارێکی نوسراو بۆ رابردوو، کە لەزەمانی دۆزینەوەی نوسینەوە دەست پێ دەکات، وەسفکردنی رووداوو راستییەکانی رابردووەو؛ نوسینەوەیانە بەگیانێکی رەخنەگرانەوە. (گۆچاڵك)ی فەیلەسووف لەبارەی مێژووە دەڵێت:

ئەوانەی رابردوویان دیوە؛ بەشێکیان دەکەوێتەوە یاد. لەو بەشەی کە یادیان دەکەوێتەوە؛ تەنها بەشێکی تۆمار دەکەن. لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژگاردا؛ بەشێك لەتۆمارکراوەکە دەمێنێتەوە. مێژوونووسانیش سەرنجیان بۆ بەشێکی ئەو پاشماوە تۆمارکراوە نەفەتاوە دەچێت. بەشێك لەوانەی سەرنجی مێژوونووسانی راکێشاوە راستو دروستە. ئەوانیش بەشێك لەوەی کە راستە؛ لێی تێدەگەن. بەشێکیش لەوەی کە لێی تێگەیشتوون؛ ئەتوانن لێکی بدەنەوەو راڤەی بکەن.

کەواتە مەعریفەی مێژوویی؛ بەش (جزئي)یە نەوەك گشت (كلي) بێت. ئەمە لەکاتێکدایە کە کەسەکە لەناو رووداوەکەدا بوو بێت؛ بەشێك لەوانەی بیردەکەوێتەوە کە بینیونی، بەشێکیش لەو رووداوانە سەرنجیان لێنادرێت. هەرشتێك کاریگەری لەسەر مرۆڤ نەبوو بێت لەیاد ئەچێتەوەو ناتوانرێت یادبکرێتەوەو تۆمار بکرێت. لەم روانگەیەوە بەشێکی زۆرکەم لەمێژوو راستە. کە لەسەردەمێکدا رووداوێك رووئەدات دواترو لەسەردەمانیتردا دەگێڕدرێتەوە؛ لێی کەم و زیاد ئەکرێتو دەقاودەق وەك خۆی نامێنێتەوە.

زەمەن یەك ئاراستەی هەیەو ناگەڕێتەوەو؛ هیچ روداوێکی مێژوویی؛ کتومتو وەك خۆی؛ دووبارە نابێتەوە. خۆ ئەگەر ڕووداوێکیش سەرلەنوێ دووبارە بووەوە، ڕەنگە لەدووەم جاردا؛ هەمان کاریگەری جاری یەکەم؛ بەسەر مرۆڤەکانەوە؛ بەجێ نەهێڵێت، بۆیە ناتوانین بڵێین: مێژوو دووبارە بۆتەوە. لەمبارەیەوە کارڵ مارکس دەڵێت:" مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە، یەکەمجار وەك تراژیدیاو؛ جاری دووەمیش وەك گاڵتەجاڕی".

هەموو دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ڕەگێکی مێژووییان هەیە، بۆ دەستنیشانکردنی هۆکارەکان، (ڕەنگە کۆمەڵێك هۆکار ئەنجامێك دروست بکەن یان لەیەك هۆکار چەند ئەنجامێك بکەوێتەوە) دەبێت بگەڕێینەوە بۆ مێژوو، هەر چرکەساتێك کە ڕۆیشتو تێپەڕی؛ دەکەوێتە مێژووەوە. هەر روداوێکیش توێژینەوەی بۆ بکرێت؛ باکگراوندێکی مێژوویی هەیە.

لەنێوان میتۆدی مێژوویی‌و خودی مێژوودا، پەیوەندی هەیە. ئەگەر مێژوو تۆماری تەواوی دەستکەوتەکانی مرۆڤ بێت (تاکایەتی‌و بەکۆمەڵ)، یاخود تۆماری ئەو ڕووداوانە بێت کە مۆرکی سەردەمێکی ژیانی مرۆڤایەتی پێوەنراوەو؛ ئاستەمە بەهەمان فۆرمو لەسەردەمێکیتردا دووبارە ببێتەوە. بەڵام میتۆدی مێژوویی بریتیە لەپراکتیزەکردنی ڕێگای زانستی بۆ وەسفو شیکاری ئەو ڕووداوانەو هەڵێنجانی دەرئەنجامی لۆژیکی بۆ تێگەشتن‌و ڕاڤەکردنیان، ئەمەش بەتوێژەرێك دەکرێت کە خاوەنی سەلیقەو عەقڵو ئەندێشەیەکی کارا بێت تا بتوانێت بەکاری بەراوردکاری هەڵبسێتو؛ بەمەبەستی تێگەشتن لەئێستاو پێشبینی کردنی ئاییندە؛ دادوەری بکات.

لەرۆژگاری ئەمرۆدا توێژەران بایەخ بەمیتۆدی مێژووی دەدەن. ئەم میتۆدە تەنها لەبواری مێژوودا بەکارناهێنرێت، بەڵکو پەلیکێشاوەتە مەیدانەکانی زانستە سروشتییەکان‌و یاساو پزیشکی‌و ڕاگەیاندن‌و ئابوری‌و ئایین‌و سایکۆلۆژیاو کۆمەڵناسی‌و... هتد، تاکو لەراستی‌و دروستی زانیاری‌و مەعریفە کۆنەکان بکۆڵرێتەوە. بەڵام زۆرێك لەتوێژەران لەرێڕەوی زانستی ئەم میتۆدە

لایانداوەو خۆیان بەنووسینەوەو نمایشکردنی سەروەری دەسەڵاتداران و دەوڵەتمەدارانەوە سەرقاڵ کردووە؛ بەبێ ئەوەی هیچ راستییەکی زانستی بدۆزنەوەو بیخەنەڕوو. مێژوونووسان لەهەوڵی ئەوەدان ئەزموونەکانی رابردوو بگێڕنەوەو بەبێ ئەوەی بارودۆخی رووداوەکان بشێوێنن، واتا زانیارییەکان کۆدەکەنەوە؛ بەپێی پێوەری تایبەت؛ پشکنینی بۆ دەکەن و پاشان شیکارو راڤەی دەکەن و راستگۆیانە دەیخەنەڕوو، ئەمەش لەو پێناوەدا تا میتۆدی مێژووی ببێتە پەنجەرەیەك بەسەر حەقیقەتدا تەنانەت لەو توێژینەوانەشدا کە مێژوویی نین.

ئینجا بۆئەوەی میتۆدی مێژوویی تەنها بریتی نەبێت لەکۆکردنەوەی داتاو زانیاری و؛ بۆ ئەوەی ببێتە رێبازێکی زانستی؛ پێویستی بەلێهاتووی و توانایەکی وردی تێبینیکردن هەیە؛ تاکو ئامانجەکانی توێژەر بەدی بهێنێت، هەندێك راستی هەیە ئەبێت لەبەرچاو بگیرێن کە بریتین لە:

1. حەقیقەت و رووداو و داتاکان بۆخۆیان ئامانج نین و کەرەستەن بۆ گەیشتن بەو ئەنجامانەی کە پشت بەلێکۆڵینەوەو راڤەکردن و سەلماندن دەبەستن، بۆیە ناکرێت بەشێوەیەکی دابڕاو لێیان بڕوانین و؛ لەپێکهاتەو رەهەندەکانی ژیانی سەردەمەکەی جیایان بکەینەوە، ئەوان کاریگەریشیان هەبووەو کەوتوشنەتە ژێرکاریگەرییەوە.

2. مادەی مێژوویی ئەزموونێك نییە دووبارە بکرێتەوە تا بتوانین لەراست و دروستییەکەی دڵنیا بین؛ بۆیە توێژەر پەنادەباتەبەر تۆمارە جێماوو ئەو بینراوانەی کە دەگێڕدرێنەوە. بۆیە پێویستی بەپێوەری ورد هەیە تاکو رەخنەی دەرەکی و رەخنەی ناوەکییان بۆ ئەنجام بدات و؛ لەراستی و دروستییان دڵنیا بێت.

3. زۆرێك لەدیاردە مێژووییەکان ناکرێت بەیەك هۆکار شیکاریان بۆ بکرێت و؛ چەندین هۆکاری هەمەجۆر رۆڵیان لەبەرقەرارکردنیدا گێڕاوە. بۆیە توێژەر

دەبێت جەخت لەســەر گرنگترین ئەو فاکتەرانە بکاتەوە کە پەیوەســتن بەرووداوەکەوەو کارلێکیان لەگەڵدا کردووە.

4. هەندێك خەســڵەتو بۆچوون هەیەو پێویســتە لای هەموو توێژەرێك هەبێت بەتایبەتیش لەبواری توێژینەوەی مێژوویدا، ئەویش بۆ دڵنیابوون لەراســتی ئەو بیرۆکەیەی کە نـاشــێـتو نـاکرێـت بخرێتەوە ژێر تێبینی راســتەوخۆوە. ئەو خەســڵەتانەش بریتین لە (وردی، راســتیو دروســتی، راســتگۆیی هزری، دورکەوتنەوە لەدەمارگیریو حەزو ئارەزووی تاکەکەسی، هەروەها بێلایەنی لەڕووی نەژادی بیروباوەڕەوەو، بوونی بەڵگەی پێویســت بۆ گەیشتن ئەنجامو بریاردان).

هیچ گومانێك لەبایەخی زانستیی توێژینەوەی مێژوویدا نییە ئەگەر بنەماکانی (وردی، بـابەتیبوون، دورســتی، راســتگۆییو ئەمـانەتی هزری، پێوانەی چەنـدێتی، پەیبردن بەپەیوەنـدیـیەکـانو...هتـد) لەخـۆگرتبێـت، جگە لەبەکـارهێنـانی گریمـانە بۆ وەســـفو لێکۆڵینەوەو شــیکـارو راڤەکردنی ئەنجامەکان، ئەمانەش دوای دیاریکردنی کێشـەو کۆکردنەوەی داتاو زانیاری. بەهەموویـان میتۆدی مێژووی دەکەن بەمیتۆدی زانســتیو مـادەکەشی دەکەن بەمادەی زانستی.

توێژینەوەی مێژوویی یارمەتیمان دەدات بەو یاســـایانە بگەین کە دەتوانین لەرێگەیانەوە پێشــبینی ئەو رووداوانە بکەین، کە لەکۆمەڵگەدا روودەدەن.

ئەو بنەمایانەی کە پێویستە لەتوێژەری مێژوویدا بوونیان هەبێت:

1. پێویســتە توێژەر زمـانی بنچینەیی بـابەتی توێژینەوەکەی بزانێـت، جگە لەزانینی یەکێك لەزمانە زیندووەکانی جیهان.

2. ئەبێت بتوانێت بەشــێوەیەکی تەواوەتی لەپرسو رەوشــەکان تێبگاتو راڤەیان بکات.

3. لەزانستی دۆکیومێنتو دیپلۆماتیدا توانای هەبێتو؛ لەچەمكو زاراوەکانی ئەو سەردەمە تێبگات کە بەڵگەنامەکانی تێدا نووسراوە.

4.پێویســـتە لەزانســـتی مۆرو دراوو ئابووریو جوگرافیاو ئەو زانســـتانەشـــدا شارەزا بێت کە تایبەتن بەبابەتی توێژینەوەکەوە.

**هەنگاوەکانی توێژینەوەی مێژوویی**

- هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوە.
- کۆکردنەوەی ماددەی مێژوویی.
- رەخنەگرتن لە ماددەی مێژوویی.
- دارشتنی گریمانە بۆ لێکدانەوەی رووداوەکان.
- لێکدانەوەی ئەنجامەکانو نووسینی راپۆرتی توێژینەوە.

1: **هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوە:**

بەبێ بوونی کێشـــە، توێژینەوە بوونی نابێت، توێژینەوەی رەســـەن بریتی نییە لەکۆمەڵێك ئامرازو رێکاریی زانســـتی کە ببێتە هۆی کەڵەکە کردنی برێکی زۆر ئامارو داتاو گشـــتاندنی بریقەداری بێ مانا. چارەســـەرکردنی کێشـــەکان گەمەکردن نیە بەئامرازەکانی توێژینەوە. ئامرازەکانی توێژینەوە کەرەســـتەن بۆ هێنانەدی ئامـانج، بۆیە پێویســـتە ئامانجـداربنو زیرەکانە بەکاربهێنرێن، ئەمانەش نایەنەدی ئەگەر توێژەر نەزانێت ئەو کێشـــەیە چییە کە لەهەوڵی چارەسەرکردنیدایە؟

زۆرێك لەتوێژەران بەرووداوێکەوە دەنوســـێنو بەکێشـــەی دادەنێنو دەیان هەفتەو مـانـگ، زانیاری لەســـەر کۆدەکەنەوە، یاخود خۆیان بەبابەتێکی ئاڵۆزی تەمومژاوییەوە ســـەرقاڵ دەکەنو نازانن چی دەکەنو ئاراســـتەیان لەکوێیە؟ هەموو ئەمانە پەیوەســـتن بەوەوە کە پێشـــوەخـت کێشـــەی توێژینەوەیان بەوردی دیاری نەکردووە.

**جۆن دیوی** دەڵێت: کێشـە بریتیە لەهەسـتکردن بەئاسـتەنگیو دژواری، یان شـتێکە تاکەکەس ســـەرســـام دەکاتو دەیخاتە دڵەڕاوکێوەو ناهێڵێت هزرو بیرکردنەوەی ئارام بێت تا بەوردی ئەو شـتە نەزانێتو دیاری نەکات. کێشـە

ئەو کاتە لای توێژەر بەرجەستە دەبێت؛ کە هەست بکات شتێك راست نییەو پێویستی بەلێکدانەوەی زیاترە. خۆئەگەر ئەم هەستە وای لێبکات حەز بەوە بکات وێنەیەکی رۆشنی رووداوە سەرسام یان ئاساییەکەی؛ لەلا گەڵاڵە بێت، ئەو کاتە ئەتوانین بڵێین توێژەرەکە هەنگاوی سەرەتایی ناوە بەرەو ناسینی کێشەو دیاریکردنی.

پێویستە توێژەری مێژوویی کێشەکەی بەوردی دیاری بکات؛ بەجۆرێك لەگەڵ توانای زانستی خۆیدا بێتەوەو؛ بتوانێت بەکەرەسەی پێویست چارەسەری بکاتو؛ بنەماکانی شیکاری بۆ دابنێت بەرلەوەی هەنگاوە کارراییەکان جێبەجێ بکات. هەندێك مەرج لەپرۆسەی هەڵبژاردنی کێشەی توێژینەوەدان، پێویستە بەهەند وەربگیرێن، ئەوانیش:

1. توێژەر باوەڕی بەو کێشەیە هەبێت کە لێیدەکۆڵێتەوە.
2. بەروونی کێشەکە دیاری بکات، تاکو توانای شیکاری هەبێت.
3. نابێ کێشەکە بەهەرەمەکیو سەرپێیو ڕاگوزاری دیاری بکرێت.
4. ئەبێت ئارەزوومەندانە کێشە هەڵبژێرێتو فشاری تێدا نەبێت.
5. ئەبێت کێشەکە ئەوەندە بهێنێت، کەلێی بکۆڵرێتەوە.
6. پێویستە سەرچاوەی زانیاری لەبەردەستدا بێت.
7. ئەبێت ئەوەند کات هەبێت کەبەشی ئەنجامدانی توێژینەوەکەی بکات.

**2: کۆکردنەوەی ماددەی مێژوویی**

سەرەتاییترین کاری توێژەری مێژوویی بریتیە لەدەستکەوتنی مادەی زانستی بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەی کە لێیدەکۆڵێتەوە. ئەم هەنگاوە پڕ بایەخەو کۆکردنەوەی سەرچاوەش لەتوێژینەوەی مێژوویدا؛ کارێکی ئاسان نیە. چۆن زانیاری کۆدەکرێتەوە دەربارەی سەردەمێك کە خۆی تیایدا نەژیاوەو بوونی نەبووە؟ ڕەنگە توێژەر زۆرترین سەرچاوەی لاوەکی دەستبکەوێت، بەڵام ئامانجی کۆتایی گەیشتنە بەسەرچاوەی سەرەتایی ڕەسەن. ئەم کارەش

تارادەیەکی زۆر بەندە بەلێوەشـــاوەیی‌و توانای توێژەرەوە بۆ جیاکردنەوەی سـەرچاوەی سـەرەتایی لەسـەرچاوەی لاوەکی؛ ئەرکێکە هەروا ئاسـان نییە.
بەگشتی سەرچاوەکان دوو جۆرن:

**یەکەم: سەرچاوەی یەکەمین یان سەرەتایی (المصادر الاولیة):**

ئەو سەرچاوانەن کە هاوچەرخی رووداو یان ئەو کەسانەن کە لەو سەردەمەدا هەبوون‌و نزیکترین بوون لەرووداوەکەوەو زانیاری‌و داتای راست‌و واقیعییان لەلایە. واتا دەســـتکاری‌و گۆرانکاری‌و راڤەکردن‌و کەم‌و زیادیان بۆ نەکراوەو؛ بـریـتـین لەووتەی ئەو کەســـە کارایـانەی کە خـودی خـۆیـان رووداوە مێژووییەکەیان بینیوەو بیسـتووە. یاخود ئەو شـتومەکانەی لەو سـەردەمەدا بەکارهێنراون‌و بەمەبەسـت‌و بێ مەبەسـت پارێزراون‌و، دەکرێت بپشـکنرێن‌و تێبینی بکرێن، ئەمانیش دوو جۆرن:

**أ.تۆمارەکان:** ئەو بیرۆکەو رووداوانەی رابردوون کە بەمەبەســـت پارێزراون تاکو بگوێزرێنەوە، ئەمانە دەگرێتەوە:

**تۆماری فەرمی:** بریتیە لەو بەڵگەنامەی دادوەری‌و جێبەجێکارییانەی؛ کە لەلایەن حکومەتە ناوەندی‌و لۆکاڵییەکانەوە دەرچوون‌و بڵاوکراوەتەوە وەك (دەسـتورو یاسـاکان، پەیماننامە، کۆنووسی دادگاو بریارەکانیان، لیسـتی باج‌و ئامارەکان، تۆمارەکانی بودجە، رێنمایی فەرمی، زانیاری تایبەت بەرووپێوی قوتابخانەو خوێندنگاکان، راپۆرتی سـاڵانەو راپۆرتی ئاسـایش‌و رووداوەکان‌و ... هتد).

**تۆماری کەسـێتی:** یاداشــت‌و وتارو وەســێتنامەو وانەو دەســتنووســەکان‌و گرێبەســـــت‌و؛ کتێـب‌و نووسراوەکانیتری کەســـێك دەگرێتەوە کە خۆی نووسیبێتی‌و خاوەنی بێت.

**1. تـۆمـاری وێـنەدار:** ئەوانـیـش وێـنەو نـیـگـار، فـۆتـۆگـراف، فـیـلـم‌و هەڵکۆڵراوەکان‌و... هتد، دەگرێتەوە.

**2. تۆماری زارەکی:** پەندو ئەفسانەو چیرۆکی میللیو خورافەو یاریو سەما... هتد، ئەم شتانە ئەنجام ئەدرێنو نوسراوە نین.
**3. بڵاوکراوەکان:** گۆڤارو رۆژنامە، نامیلکە، گۆشەوتارو کارە ئەدەبیو هزریو فەلسەفییەکان...هتد.
**4. تۆماری میکانیکی:** کاسێتو شریت کە دەنگیان لەسەر تۆمارکراوە، لەسەردەمی کۆن هەر ئەمە هەبووە، بەڵام ئێستا کەرەستەی پێشکەوتووتر هەیە.
**5. تۆماری دەنگییو وێنەیی:** کەدەنگدارو وێنەدارن کاسێتی ڤیدیۆیی، سی دیو دیڤیدی...هتد.
**ب. شوێنەوار:** ئەو جێماوە مێژووییانەیە کە پەیوەندییان بەکەسێك یان گروپێکەوە هەیەو دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمێکی مێژوویی کۆن یان بۆ شارستانیەتێکیتر وەك: خانوبەرە، کەرەستە، جلوبەرگ، قاپ و قاچاغ، دراو، چەكو تفەنگو پەیکەری ئێسکی... هتد. ئەم کەرەستانە لەبنەڕەتدا بۆ ئەوە دروست نەکراون تا زانیاریو داتا بگوێزنەوە؛ بەڵام سەرچاوەیەکی راستگۆن بۆ دەرخستنی ژیانی کۆمەڵایەتیو دەروونی هەر گرۆپێکی مرۆیی. توێژەر زۆر سود لەم سەرچاوانە وەردەگرێت چونکە راستگۆنو درۆیان تێدا نییە کەرەستەی ماددین، بۆ نموونە: لەڕێگەی گۆڕستانی فیرعەونیەکانەوە توانرا مەزنترین زانیاری لەسەر ئەو شارستانییە کۆبکرێتەوە.
لە توێژینەوەی مێژوویدا؛ ئەم سەرچاوەیە بەتەنها بەس نییەو ئەبێت پشت بەسەرچاوەیتریش ببەسترێت، وەك بەڵگەنامە (دۆکیومێنت) بەپێچەوانەی شوێنەوارەوە بۆ ئەوە هاتۆتەبوون کە زانیاریو داتا لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکیتر بگوێزنەوە، واتە ئەو کەسانەی ئەو بەڵگەنامانە دەنووسنەوە؛ بۆ خۆیان لە رووداوەکەدا ژیاونو؛ لەسەردەمی ئەواندا بوونو بۆ ئەوە نوسراون تا زانیاری بۆ نەوەیتر بگوێزرێتەوە. باشتروایە توێژەر ئەوەندەی

دەتوانێت؛ هەوڵبدات ئەم سەرچاوە رەسەنانەی دەست بکەوێت چونکە تارادەیەکی زۆر راستگۆنو، ئەگەری دەستکاری لەمانەدا کەم و لاوازە.

**دووەم: سەرچاوەی دووەمین یان لاوەکی** (المصادر الثانوية):

سەرجەم ئەو سەرچاوانە دەگرێتەوە، کە زانیاریو داتای ئەو کەسانەی تێدایە کە خودی خۆیان رووداوەکانیان نەدیوەو تیایدا نەژیاون، بەڵکو وەرگیراونو گواستراونەتەوە، واتە لەسەرچاوە یەکەمو رەسەنەکەوە هێنراون، واتە: کەسێك لەزاری کەسێکیترەوە یان لە نوسراوەکانی کەسێکیترەوە کەرەستەکانی وەردەگرێت. هەتا ئەم سەرچاوانە لەرووی زەمەنەوە؛ لەسەرچاوە رەسەنەکەوە دوور بکەونەوە، ئەوا گومان زیاتر هەڵدەگرنو بەهای زانستییان لاواز دەبێتو؛ زیادەیان دەخرێتەسەر یاخود لێیان لائەبرێ، بۆیە هەمیشە سەرچاوەی رەسەن لە سەرچاوەی لاوەکی باشترە، ئەمەش بەو مانایە نایەت کە سەرچاوەی دووەم خراپە، توێژەر ناچارە لەسەرەتادا پەنای بەرێتەبەر، واتا یەکەمجار پەنابەرێتەبەر سەرچاوەی لاوەکی بۆئەوەی بەسەرچاوەکانیتر بگاتو ئاشنایەتیان لەگەڵدا پەیدا بکات. زۆربەی زۆری کتێبە مێژووییەکان لەم جۆرە سەرچاوەیەن. هەروەها ئەنسکلۆپیدیا (دائرة المعارف)و بیبلۆگرافیاش دەگرێتەوە کە سەرچاوەی گەورەن بۆ زۆربەی بوارەکانی زانستو ئەدەبو هونەرەکان.

3: **رەخنەگرتن لە ماددەی مێژوویی:**

ئەم هەنگاوە بۆ زانینی راستیو دروستی ئەو سەرچاوانەیە کە توێژەر کۆیکردونەتەوە، ئەویش لەرێی ئەنجامدانی پشکنینی وردو رەخنەی قوڵو توندەوە. پشت بەست بەو بنەمایەی کە دەڵێت: (لەتوێژینەوە مێژووییەکاندا، گومان سەرەتای داناییە). ئەبێ لە گومانەوە دەست پێبکرێت، بەبێ گومان بردن ناکرێت بابەتی توێژینەوەی مێژوویی قبوڵ بکرێت، ئەبێ رەخنەی لێ بگریتو راستی بسەلمێنرێت. گومان بەو مانایەی

چیت دەستکەوت گومانت لێی هەبێت، ئەویش بۆ دۆزینەوەی باشتر نەك بەمەبەستی رەتکردنەوە، ئەم گومانە کاتێك زۆر ئەبێت کە سەرچاوەکە زیاتر دوور بێت لەزەمەنی ئەنجامدانی توێژینەوەکەوە.

### 1. رەخنەی دەرەکی

بریتیە لەدڵنیابوون لەراستی بەڵگەنامەو شوێنەوارەکان بەمەبەستی برواپێکردن یان دوورخستنەوەیان، لێرەدا ئەبێت دڵنیابینەوە لەوەی کە لەرووی فۆرمو پێکهاتەو ستراکتۆرو زانیارییەوە، هاوتاو هاوشێوەی ئەو سەردەمەنو لەودەچن، واتا (بەروارو شوێنی دەرچوون، هۆکاری دەرچوونو خاوەنەکەی) ئەویش لەرێی ئەم پرسیارانەوە:

1.کەیو بۆچی ئەم بەڵگەنامەیە دەرکەوتووە؟

2. ئایا وێنەی رەسەنو ئۆرجیناڵە یان کۆپیو لەبەرگیراوەیە، ئەگەر کۆپییە ئایا دەقاودەق وەك رەسەنەکەیە؟ ئەی ئۆرجیناڵەکە لەکوێیە؟

3. کێ نووسیویەتی؟

4. ئایا زمانی بەڵگەنامەو دەستوخەتو رێنووسو تایپەکە، وەك بەرهەمو کارەکانیتری نووسەرەکەیە؟

5. ئایا گۆڕانکاری مەبەستدارو بێ مەبەست بەسەر بەڵگەنامەکەدا هاتووە؟

ئەمانەو چەندین پرسیاریتر کە پێویستیان بەئەزموونێکی باشی توێژەر لەو بوارەدا هەیە؛ تاکو وەڵامیان بداتەوە، بەتایبەتیش کە تێکەشتن لەرەفتاری مرۆڤو راڤەکردنی، خۆڕاگریو ئارامی دەوێتو توێژەر لەم رووەوە؛ پێویستی بەهاوکاری پسپۆڕو شارەزایانیترە. ئامانجی ئەم جۆرە رەخنەیە؛ گەڕانە بەدوای راستیو دروستی بەڵگەنامەکانو ئەو کەسانەی نوسیویانەو؛ ئەو سەردەمەش کە تیایدا نوسراوەنەتەوە.

کۆنیو دێرینی بەڵگەنامەیەك مانای راستیو دروستی بەڵگەنامەکە ناگەیەنێت، بۆ نموونە لەسەردەمی باباندا شتێك رویداوەو نووسراوێکی

لەسەر نووسراوە، لەدوای (100) ساڵیش لەسەر هەمان رووداو جارێکیتریش نووسراوەتەوە. ئەمە مانای ئەوە نیە کۆنەکە راستە، رەنگە تازەکە راستربێ، گەرچی وەکو زەمەن؛ ئەوەی یەکەم لەرووداوەکەوە؛ نزیکترە.

**2. رەخنەی ناوەکی**

لێکۆڵینەوەیە لەماناو راستی ئەو مادەیەی کە لەناو بەڵگەنامەکەدایە، واتا دڵنیابوونەوە لەدروستی زانیارییەکانی ناو بەڵگەنامەکە. ئامانجی رەخنەی ناوەکی شیکارو رافەکردنی زانیاریو داتاکانی نێو بەڵگەنامەکانە، ئەویش لەرێی ئەم پرسیارانەوە:

1.مەبەستی نووسەر لەهەر ووشەو رستەو دەستەواژەیەك؛ چییە؟.

2.ئایا دەکرێت بڕوا بەو دەستەواژانە بکرێت کە نووسیویەتی؟

دیاریکردنی مانای دەستەواژەو چەمكو زاراوەکان؛ پێویستی بەمەعریفەیەکی بەرینو فراوانە سەبارەت بەمێژووی سروشتی کۆمەڵگە. ئاشکرایە زۆرێك لەو ووشانەی لەنێو بەڵگەنامە کۆنەکاندان، ئێستا ئەو مانایە ناگەیەنن. بۆ نموونە (پەروەردەی پێشکەووتووخواز) ئەو مانایەی نییە کە لەرابردوودا هەیبووە. بۆیە ئەبێت بەچاوی خاوەن بەڵگەکە، بیخوێنینەوە، ئەوکاتە ئەتوانین بەوردیو دروستی ووشەکان لێکبدەینەوە، بۆ هێنانەدی ئەوەش؛ ئەم پرسیارانە لەشوێنی خۆیاندان:

1. ئایا ئەکرێت بڕوا بەنووسەرەکە بکەین، ئایا بۆ ئەو بوارە؛ لەو ئاستەدا بووەو ئەو توانایەی هەبووە؟

2. ئایا پێگەو تواناکانیو ئەو مەشقەی لەسەر تێبینی کردن کردوویەتی، یارمەتییانداوە بۆ نووسینی ئەوەی تۆماری کردووە؟

3. ئایا لەتێبینیکردنو راپۆرتەکانیدا، بەهۆی تەمەنو؛ نائارامی هەڵچوونیو؛ باری تەندروستییەوە، نەکەوتۆتە هەڵەوە؟

4. ئایا لەنووســـینی تێبینییەکاندا؛ پشـــتی بەچیرۆكو گێڕانەوەی بیســـتراو بەستووە، یان خودی خۆی تێبینی کردوون؟
5. ئایا راستەوخۆ لەگەڵ تێبینیکردندا، بەڵگەنامەکەی نووسیوە، یان دوای هەفتەو مانگو ساڵ؟
6. لەنووســـیندا پشـــتی بەیاداشـــتە نووسراوەکانی بەســـتووە یان بەیادگاو یادەوەری؟
7. ئایا لەبابەتی نووسینەکەیدا دەمارگیری ئایینیو نەتەوەیىو سیاسیو هیتر؛ بەدی ناکرێت؟
8. ئایا کەسێك لەڕووی مادییەوە یارمەتی نەداوە تاکو لەبەرژەوەندی پرسو کەیسێك بنووسێت؟
9. ئایا توێژەرەکە لەبارورزروفێکی وەهادا نەبووە کە هەندێك راستی فەرامۆش بکات یان بەخراپ لێکیان بداتەوەو بیبانشێوێنێت؟.
10. ئایا نووســـینەکەی دەرئەنجامی لەخۆبایی بوونو بڕوبیانوو هێنانەوەوە نەبووە بۆ کارەکانی خۆی؟.
11. ئایا ئامانجی نووسینەکەی بۆ هاوسۆزی نەوەکانی ئاینده یان رازیکردنی گروپ یاخود تورەکردنیان نەبووە؟.
12. ئـایا بەمەبەســـتی جوانکاریو بەجێهێشـــتنی شـــوێنەواری ئەدەبی، حەقیقەتی نەشێواندووە؟
13. ئایا لەگەڵ خۆیدا؛ ناکۆکیو دژایەتی بەدی ناکرێت؟
14. ئایا لەسەر هەمان بابەت نووسینی کەسانیتر هەیە، کە لەم بەتواناترو جیاوازتر بن؟

## 4: دارشتنی گریمانە بۆ لێکدانەوەی رووداوەکان

گریمانە چارەسەری پێشنیارکراوە بۆ کێشەیەكو؛ لەشێوەی گشتاندنو پێشنیازدا دەردەبڕرێت. یاخود گوزارشتێکە کە رەگەزەکانی سیستمێك لەپەیوەندی؛ لەخۆدەگرنو هەوڵدەدەن ئەو رووداوانە راڤە بکەن کەهێشتا لەرێی حەقیقەتو راستییەکانەوە؛ پشتگیری ناکرێنو نەسەلمێنراون. هەندێك لەو رەگەزو پەیوەندییانە رەنگە حەقیقەتی باوو ناسراو بن لەوانەشە حەقیقەتی وێناکراوبن.

گرمانەکان ئەو حەقیقەتانە لەخۆدەگرن کە باڵاترن لەحەقیقەتە ناسراوو باوەکان؛ چونکە لێکدانەوەی پەسەندو شیاون بۆ بارورەوشی نادیارو تەمومژاوی. ئەم هەنگاوە واتا دارشتنی گریمانە وەك چۆن لەمیتۆدەکانیتردا پڕ بایەخە؛ لەمیتۆدی مێژوویشدا بایەخێکی گەورە هەیە. بەلای زۆرێك لەتوێژەرانەوە؛ ئەم هەنگاوە راستەوخۆ دەکەوێتە دوای دیاریکردنی کێشەوەو؛ بەهۆیەوە زانیاری کۆدەکرێتەوە بەمەبەستی سەلماندنی راستی یان چەوتی گریمانە. هەروەها گریمانە یارمەتی توێژەر دەدات داتاو زانیارییەکانی بەشێوەیەکی لۆژیکیو دروست رێکبخات، بەبێ گریمانە کۆکردنەوەی زانیاری کارێکی بێ کەڵكو بێ بەرهەمەو؛ توێژەر لەنێوان شیکارو هەڵێنجانی رووداوەکانی ئایندەدا؛ چەواشەو سەرلێشێواو دەبێت.

دیاردە مێژووییەکان بەهۆی هەمەجۆریو ئاڵۆزەییانەوە، توێژەر ناچار دەکەن هۆکارە جۆراوجۆرەکانیان بخاتەڕوو، ئەمەش رەنگدانەوەی بەسەر گریمانەکانەوە بەجێدەهێڵێت، بۆیە گریمانەکانی توێژینەوەی مێژوویی زیاتر تەمومژاوینو ئاڵۆزترن لە گریمانەی دیاردە سروشتییەکان. هەرئەمەش کاریگەری بەسەر گشتاندنەکانەوە بەجێدەهێڵێتو وەك توێژینەوەی زانستە سروشتییەکان وردو بابەتی نابن.

توێژەرانی بابەتی مێژوویی دوای پشکنینی وردی مادەو بابەتەکانیان:

1. ئەبێت گریمانەکانیان ســـەبارەت بەرووداوو فاکتەکانی رابردوو، دابڕێژنو دیاری بکەن.
2.ئەبێت تەواوی دیدوبۆچوونو پاشخانی سیاسیو کۆمەڵایەتی هەموو ئەو توێژەرو کەسو لایەنانە بخاتەڕوو کە بەجۆرێك لەجۆرەکان کاریگەرییان بەسەر پرۆسەی رەخنەگرتن لەمادە زانستییەکەوە؛ هەیە.

**5: لێکدانەوەی ئەنجامەکانو نووسینی راپۆرت**

دوای ئەوەی توێژەر کۆتایی بەداواکارییەکانی هەنگاوەکانی پێشـــوو دەهێنێت، دەســـتدەکات بەلێکـدانەوەی ئەنجـامەکـانیو نووســـینەوەی راپۆرتی توێژینەوەکەی. ئەبێت لێکدانەوەکانی؛ تەواو گونجاوبن لەگەڵ بیرکردنەوەی لۆژیکیی داهێنەرانەداو بابەتیبن.

ســـەبـارەت بەراپۆرتیش، بەو جۆرە دەنووسرێتەوە کە لەمیتۆدەکـانی توێژینەوەدا پەیڕەو دەکرێتو ڕێوشـوێنی بۆ دیارێژراوە، ســەرەتا وەســفی ئەو کێشـــەیە دەکـات کە لێیکۆڵیوەتەوەو ئەو چەمکـانە دیـاریـدەکـات کە لەتوێژینەوەکەیدا بەکاریهێناون، پاشان ئەدەبیاتی تیۆریو ئەو توێژینەوانەی پێشـــووتر نمایش دەکات کە لەهەمان بواردا ئەنجام دراون، ئینجا میتۆدو ئـامرازەکـانی توێژینەوەکەی دەخـاتەڕوو کە بەهۆیـانەوە بەئەنجـامەکـانی گەیشـــتووە. دواجار ئەنجامەکانی نمایش دەکاتو مشـــتومڕیان لەســـەر دەکات. لەکۆتـاییشـــدا ئـامـاژە بەلیســـتی ئەو ســـەرچـاوانە دەکـات کە لەتوێژینەوەکەیـدا پشـــتی پێبەســـتوون، ئەگەر پـاشـــکۆی هەبوو، بۆ دەوڵەمەندکردنی توێژینەوەکەی؛ دایدەنێت.

خســتنەڕووی ئەنجامەکانی توێژینەوە؛ پێویســتە توندو تۆڵو ڕێکخراو بێت، بەجۆرێك توێژینەوەکە وەك یەکەیەکی تەواو و کامڵ پیشـــان بداتو، هەر بەشـێك ســـەرەتا بێت بۆ بەشـــەکەی دوای خۆیو پشـــتی پێ ببەســـتێت. نووسینی زانستی وەك نووسینی بابەتی ئەدەبی نییە کە رازاندنەوەو جوانکاری

تێدا بێت، لێرەدا هەر شتێك زیادە بێت لادەبرێت‌و بەزمانێکی زانستی رەوان دەنووسرێت‌و؛ چەمکەکان هەموویان رۆشنن‌و لەمانایەك زیاتر هەڵناگرن.

لەپاشکۆی ئەم کتێبەداو؛ بەمەبەستی روونکردنەوەی هەنگاوەکانی ئەم میتۆدە زانستییە، توێژینەوەیەك خراوەتەڕوو کە بەمیتۆدی مێژوویی ئەنجامدراوە. بەناونیشانی: فێرگە و ناوەندە فێرکارییەکانیی مسیۆنەریی ئەمریکی و کاریگەرییان لەسەر رەوشی پەروەردە و خوێندن لە کوردستانی دەوڵەتی عوسمانی لەسەدەی نۆزدەدا. پ .ی . د . سامان حسێن ئەحمەد 2020

## میتۆدی وەسفی

دیارترین ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتیەکانە، بەتایبەتیش لەبواری پەروەردەو سایکۆلۆژیاو کۆمەڵناسیی و ڕاگەیاندندا، بەرفراوانترین میتۆدەو؛ تەواوی ئەو توێژینەوانە دەگرێتەوە کە جەخت لەسەر دیاردەو ڕووداوەکانی ئێستا دەکەنەوە. واتا هەر دیاردەیەك کە لەئێستای ژیانی تاك و گروپ و کۆمەڵگەدا بوونی هەبێت و لەئارادا بێت و؛ هەنووکەیی و بەرقەراربێت؛ بەو ئامانجەی دیاریی بکات و؛ لایەنەکانی بدۆزێتەوەو؛ پەیوەندی نێوان ڕەگەزەکانی دەربخات، یاخود پەیوەندی دیاردەکە بەدیاردەکانیترەوە بخاتەڕوو. سنورەکانی ئەم میتۆدە تەنها لەوەسفکردندا ڕاناوەستێت بەڵکو شیکارو لێکدانەوەو بەراوردو هەڵسەنگاندنیش بۆ دیاردەکان دەکات. لەوەش زیاتر هەر بەئێستاوە ڕاناوەستێت لەهەوڵی ئەوەدایە پێشبینی بۆ ئاینده بکات.

### هەنگاوەکانی توێژینەوەی وەصفی

یەکەم: شوناسی توێژینەوە

1. دیاریکردنی کێشە.
2. دەرخستنی گرنگی کێشە.
3. ئامانجەکانی توێژینەوە.
4. سنوری توێژینەوە.
5. دیاریکردنی زاراوەو چەمکەکان.

**دووەم: چوارچێوەی تیۆری توێژینەوە:**

1. ئەو تیۆرانەی لەبابەت و گۆڕاوەکانی توێژینەوەکە دوواون.
2. تاوتوێی تیۆرەکان.
3. توێژینەوەکانی پێشوو.
4. تاوتوێی توێژینەوەکانی پێشوو.

**سێیەم: ڕێکارییەکانی توێژینەوە**

1.دیاریکردنی میتۆدی بەکارهاتوو.
2. دیاریکردنی کۆمەڵگەی توێژینەوە.
3. دیاریکردنی سامپڵو شێوازی هەڵبژاردنی.
4. دیاریکردنی ئامرازی توێژینەوە.
5. کەرەستە ئامارییەکان.

**چوارەم: ئەنجامەکانی توێژینەوەو تاوتوێکردنیان**

1.خستنەڕووی ئەنجامەکان؛ بەپێی ڕیزبەندی ئامانجەکانی توێژینەوە، ئەنجامەکانیش دەخرێنەڕوو.
2.تاوتوێی ئەنجامەکان لەژێر ڕۆشنایی چوارچێوەی تیۆریو توێژینەوەکانی پێشوودا.

**پێنجەم: دەرئەنجامو ڕاسپاردەو پێشنیارەکان:**

**دەرئەنجامەکان:** دەرئەنجام بڕیارو وێناکردنی ئەو پەیوەندییە زانستییانەیە کە توێژەر لەسەر بنەمای ئەنجامەکانی توێژینەوە، بنیاتیان دەنێتو؛ پشت بەداتاو زانیاریو ژمارەو ڕێژەکانی شیکارکردنەکانی توێژەر دەبەستێت. لێرەدا ئەو ئەنجامانەی لەسامپڵەوە پێیگەشتووە؛ بەکۆمەڵگەی توێژینەوەوە دەبەسترێتەوەو گشتاندنیان بۆ دەکرێت. بەشێوەیەکی گشتی دەرئەنجامەکان:

1. هەر دەرئەنجامێك پەیوەستە بەئەنجامێکی توێژینەوەوە، وەکچۆن، ئەنجامەکانیش تایبەتن بەئامانجەکانەوە.
2. پوختەی ئەنجامەکانی توێژینەوەن؛ دوور لەبەکارهێنانی ئامارو ژمارەو ڕێژەو خشتەو شێوەکان.
3. مەرج نییە هەموو دەرئەنجامەکان باشو پۆزەتیف بن، ڕەنگە هەندێکیان نێگەتیفو خراپ بن.

4. ئەبێت توێژەر لەزیادرەوی و خۆبردنەپێشەوە؛ دوور بکەوێتەوەو کەموکورتی و ناتەواوی دەزگاو لایەنی پەیوەندداربەتوێژینەوەکەی؛ بابەتیانە بخاتەڕوو.
5. بەشی زۆریان تایبەتن بەلایەنی مەیدانی توێژینەوەوە؛ خۆ ئەگەر هەندێکیان تایبەت بوون بەلایەنی تیۆرییەوە، باشتروایە بەجیا بنووسرێن.
**راسپاردەکان**: پشت بەدەرئەنجامەکان دەبەستێت و لەتوێژینەوەدا لەدوایانەوە دەنووسرێت؛ بەپێی ئەم مەرجانە:
1. هەر راسپاردەیەك تایبەتە بەدەرئەنجامێکی توێژینەوەوە کەواتە راسپاردەکان ئەو چارەسەرانەن کە بۆ کێشەی توێژینەوەوە دەستدەدەن.
2. نابێت راسپاردە دەستەواژەی گشتی بێت و بۆ هەموو توێژینەوەیەك ببێت.
3. پێویستە لەشێوەی پێشنیاردا ئاراستەی لایەنی پەیوەندداربکرێت و؛ ناشبێت لەشێوەی فەمانکردندا (پێویستە، دەبێت) بخرێنەڕوو.
4. پێویستە واقیعی و گونجاو بێت و بتوانرێت جێبەجێ بکرێت.
**پێشنیارەکان**: پێشنیاری توێژەرن بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەیتر لەئایندەداو؛ تەواوکردنی ئەو بوارو لایەنانەی کە توێژەر نەیتوانیوە لێیان بکۆڵێتەوە، لەهەندێك بەشی زانستیدا لەجێی پێشنیارەکان، توێژینەوەکانی ئایندە دەنووسرێت.
**شەشەم: سەرچاوەکان**: لەکۆتایی ئەم کتێبەدا بەشێوەیەکی زانستی لەسەر چۆنێتی خستنەڕووی سەرچاوەو ژێدەرەکان دەدوێین.
**حەوتەم: پاشکۆکان**: هەندێك لەتوێژەران چەند پاشکۆیەك بۆ توێژینەوەکانیان زیاد دەکەن بەمەبەستی روونکردنەوەی زیاتر بۆ ئەو بابەت و بوارانەی کە نەکراوە لەناوەڕۆکی بەشەکانی توێژینەوەکەدا دابنرێن. رەنگە هەندێکیش بەمەبەستی زیادکردنی ژمارەی لاپەڕەکان و گەورەکردنی قەبارەی

توێژینەوەکە، زۆرترین پاشکۆ دابنێن. ئەمەش کارێکە خزمەت بەتوێژینەوەکە ناکات و ئەمانەتی زانستی تێدا نییەو فێڵێکی هەرزانەو لەتوێژەی زانستپەروەر ناوەشێتەوە.

## جۆرەکانی توێژینەوە وەسفی

توێژینەوەی وەسفی بەسەر چوار گروپدا دابەش دەبێت کە بریتین لەمانە:

**یەکەم: توێژینەوەی رووپێوی:**

ئەم چەمکە لە زانستی ئەندازیاری و جیۆلۆجییەوە وەرگیراوەو تێکەڵ بەزانستە مرۆڤایەتییەکان بووە. بەم پێیەش روپێوی رێبازێکی لێکۆڵینەوەی زانستییە بۆ بارو رەوشی بوارە جیاجیاکانی کۆمەڵگە؛ بەمەبەستی پیشکەشکردنی بەرنامەیەکی دارێژراو بۆ چاکسازی و چاککردنیان.

بەلای زۆرێك لەشارەزایانەوە؛ روپێوی لەزنستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا، بایەخێکی ئەوتۆی نیە چونکە زانیاری روکەش و رواڵەتیمان پێدەبەخشێت، بەڵام بەلای هەندێکیترەوە؛ جێگەی بایەخەو وەکو رێبازێکی زانستی تەماشا دەکرێت. بەشێوەیەکی گشتی پێویستە توێژەر لەکاتی بەکارهێنانی ئەم لقەی میتۆدی وەسفیدا ئەم راستیانە لەبەرچاوبگرێت:

1. بزانێت کە روپێوی بۆ تاك نابێت و تەنها بۆ گروپ بەکاردێت.
2. لێکۆڵینەوە لە رەوشی هەنوکەیی ئەو گروپە دەکات، واتە بۆ دیاردەیەك نابێت لەرابردوودا رویدا بێت، هەروەها بۆ ئایندەش نابێت، کەواتە بۆ دیاردەیەکە لەئێستادا هەبێت و؛ کاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکەدا لەئارادا بێت.
3. لەکاتی بەکارهێنانی ئەم میتۆدەدا؛ لایەنی پراکتیکی تیایدا دیارو ئاشکرایەو؛ هەوڵا دەدرێت بارودۆخی هەنووکەیی بەشێوەیەکی پراکتیکی مەیدانی دیاری بکرێت.

## بایەخی توێژینەوەی رووپێوی

توێژینەوەی رووپێوی وەك هەر جۆرێكی تری توێژینەوە بایەخی خۆی هەیە، گرنگترینیان ئەمانەن:

1. بەرێگەی رووپێوی زانیاریو داتاو راستییەكان كۆدەكرێتەوەو لێك دەدرێتەوە؛ بەمەبەستی گشتاندنیان.
2. لەبواری پلاندانانی نەتەوەییدا سوودی هەیە، كاتێك پلان دادەنرێت بۆ دەستنیشان كردنی لایەنەكانی ژیانی خەڵك، ژیانی كۆمەڵگەو بۆ گەشەپێدانی، هەروەها كاتێك پلان دائەنرێت بۆ گەشەی ئابوریو تەندروستی كۆمەڵگە بۆ ماوەیەكی دیاریكراو؛ هەنگاوی یەكەمو سەرەتا؛ رووپێوی كردنە.
3. بۆ دەستنیشان كردنی كێشەكانی كۆمەڵ و كاریگەری كێشەكان لەسەر كۆمەڵ بایەخدارە تاكو چارەسەریان بۆ بدۆزرێتەوە بەپشتبەستن بەو كەرەستە ماددییانەی لەبەردەستدان.
4. لەبواری دۆزینەوەو دیاریكردنی بۆچونەكانی خەڵكو رای گشتیدا بەكاردەهێنرێت.

## جۆرەكانی رووپێوی

ئەمانەی خوارەوە، دیارترین جۆری روپێوین:

**رووپێوی گشتی**: زۆرترین بوار لەخۆدەگرێتو زۆربەی لایەنەكانی ژیان دەگرێتەوە: ئاینی، كۆمەڵایەتی، رۆشنبیریو تەندروستی...هتد، واتە رووپێوییەكی گشتییەو ئەركێكی گەورەو قورسەو تەنها دەزگاكانی دەوڵەتو حكومەت ئەتوانن پێی هەڵدەستن، بەو پێیەی بوارو رەهەندی زۆر لەخۆدەگرێت؛ بۆیە بودجەو توانایەكی زۆریشی- پێویستەو لەتوانای توێژێكی ئاساییدا نییە.

**رووپێوی تایبەت**: تایبەتە بەبوارێكەوە، واتە تەنها بۆ یەك بوارو لایەن دەكرێت، وەك خوێندەواریو تەندروستیو ئابوریو ...هتد.

**رووپێوی گشتگیر:** لەم شێوەیەی روپێوییەدا، هەموو ئەندامانی کۆمەڵگەی توێژینەوە وەردەگیرێن ئیتر ئەو کۆمەڵگەیە ژمارەی هەر چەند بێت، بەواتە سامپڵو گروپێکی دیاریکراو وەرناگیرێت، بەڵکو هەموو ئەندامان وەردەگیرێت. ئەم رووپێوییە بەدەوڵەتو رێکخراوی نێودەوڵەتی نەبێت؛ ناکرێت. بودجەو تواناو کاتی زۆری پێویستە. بەڵام ئەگەر کۆمەڵگەی توێژینەوە، ژمارەکەی کەمو بچووك بوو، ئەکرێت توێژەر روپێوی گشتگیر بەکاربهێنێت. بۆ نموونە: سەرجەم بەڕێوەبەرانی قوتابخانە بنەڕەتییەکانی پارێزگای هەڵەبجە، لێرەدا توێژەر تەواوی بەڕێوەبەرەکان وەردەگرێت کە رەنگە ژمارەیان؛ چەند سەد کەسێك بێت.

**رووپێوی سامپڵ:** نموونەیەك لە کۆمەڵگەی توێژینەوە وەردەگیرێتو روپێوی بۆ دەکرێت بەمەرجێك ئەو سامپڵەی وەرئەگیرێت بەتەواوەتی نوێنەرایەتی خەسلەتەکانی کۆمەڵگەکەی بکات.

بۆ ئەو توێژەرانەی کە بەتەنها کاری توێژینەوەکەیان ئەنجام دەدەن؛ شیاوترە کە پشت بە روپێوی سامپڵ ببەستن، چونکە تواناکانیان دیاریکراوە بەمەرجێك ئەو نموونەیەی کە وەریدەگرن بەتەواوەتی نوێنەرایەتی کۆمەڵگە بکاتو؛ بەشێوەیەکی زانستی لەکۆمەڵگەوە وەریبگرنو؛ بۆ ئەوەش باشترە پشت بەپسپۆرانی بواری زانستی ئامار ببەسترێت بۆ دیاری کردنی ئەو رێژەیەی کە وەرئەگیرێت.

**بوارەکانی رووپێوی**

**1. رووپێوی کۆمەڵایەتی:**

ئەم بوارە لەبەر ئەوەی زۆر فراوانەو زۆرترین بەکارهێنانی هەیە، بۆیە کەمێك بەدرێژی باسی دەکەین. بەشێوەیەکی گشتی ئەو بابەتانەی دەکرێت توێژینەوەیان لەسەر بکرێت زۆرن لەوانە:

1. بۆ دەســت نیشــانکردنی خەسـڵەتە دیمۆگرافیەکانی کۆمەڵگە، تا بزانرێت لەچەند خێزان پێك هاتووە، تەمەنی ئەندامانی چەندە، تێکڕاو ڕێژەی لەدایك بوونو مردن، ژمارەی کچو کوڕ، ...هتد.
2. دەســت نیشــان کردنی لایەنەکانی ژینگەی کۆمەڵایەتیو ئابوری کۆمەڵگە، لەرێگەی رووپێوییەوە دەکرێت، ئاســـتی گوزەرانو بژێویو داهاتی خەڵكو پێداویستی ماددیو جۆری ئەو کارەی کە ئەکرێت؛ دیاری بکرێت.
3. بوارەکانی چالاکی مرۆڤ لەژیانی رۆژانەیدا، بەسەربردنی کاتی بێ ئیشی؛ ئەو کاتانەی بۆ خوێندنەوەی رۆژنامەو گۆڤارو تەماشـــاکردنی تەلەفزیۆن یان گوێگرتن لەرادیۆ؛ تەرخانی دەکەن.
4.بواری بـازاڕ:- بوارێکیترە کە لەوڵاتـانـدا روپێوی زۆری بۆ کاڵاو شـــمەکە بەرهەم هاتووەکان دەکرێت، ئیتر ئەو کاڵایە هەرشـــتێکە. بەرهەم هێنەران رای خەڵك وەرئەگرن، تابزانن چینی بەکاربەر حەزیان لە چ جۆرو چ رەنگو شـــێوەو مۆدێلێکە. ئەم رووپێویە پەیوەندی زۆری بەئابورییەوە هەیە بۆیە ئێستا ریکلام لەدەزگای راگەیاندنەوە دەکرێت رۆڵی مەزنو گرنگی لەراکێشـانی سەرنجی کڕیاراندا هەیە.

**قۆناغەکانی رووپێوی کۆمەڵایەتی**

بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە بەشـــێوازی روپێوی کۆمەڵایەتی، پێویســـتە توێژەر چەند هەنگاوێك بنێتو؛ بەچەند قۆناغێکدا تێپەرێت کە بریتین لە:

دارشتنی پلان: لەم قۆناغەدا پێویستە توێژەر:-

1.ئامانجی رووپێوییەکە؛ بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا ئامانجی سەرەکی دیاری بکات، ئەبێت ئامانجە لاوەکییەکانیش، کە لەو ئامانجە دەبنەوە؛ دەســـت نیشانیان بکات.

2. دەبێت سنورەکانی توێژینەوە دیاری بکات. سـنوری مرۆیی، واتە رووپێوی بۆ کێ دەکات، ئەو کەســـانە کێن کە توێژینەوەیان لەســـەر دەکات. هەروەها

ســـنوری شـــوێنی واتە روپێوی لە چ شـــوێنێكو بۆ چ جێگەیەکی دەکات.
سنوری زەمەنی، چ کاتێك روپێویەکە دەکات.
3. دەبێت ئامرازی توێژینەوە دەســت نیشــان بکات کە بۆ کۆکردنەوەی داتا بەکاری دەهێنێت. کەرەســـتەی لەبارو گونجاو لەگەڵ ئامانجی توێژینەوە ســنوری گونجاودا بگونجێنێتو دەبێت بوجەو تێچوون؛ دەســت نیشــان بکات.
4. هەموو ئەو قۆناغانەی باســکران؛ لەخشــتەی کاردا دیاری دەکرێت، واتە ئەبێت توێژەر ئەوە دیاری بکات کە لەچییەوە دەست پێ دەکات؟ کەی وەچ کاتێك ئەچێتە سەر قۆناغێکیتر.
کۆکردنەوەی داتــای مەیــدانی: لەم هەنگاوەشـــدا توێژەر دەبێــت چەنــد هەنگاوێك بنێت کە بریتین لە :-
1. پەیوەندی بەو کەسانەوە بکات کە لێیان دەکۆڵیتەوە.
2. چاودێر یان ســەرپەرشــتیار دیاری بکات بۆ رێکخســـتنی کاروباری هاوکارەکانی کە ناردونی بۆ کاری مەیدانی تا رێنماییان بداتێو بەدواداچوونی هەبێت بۆ ئەو شتانەی کە کۆی دەکاتەوە.
شـــیکردنەوەی داتاکان: دوای کۆکردنەوەی زانیاریو داتاکانو گەڕانەوەیان بۆ توێژەر، پێویسـتە لەراسـتیو دروسـتیان دڵنیابێتەوەو هەر وەڵامێك بێ کەڵکە لای ببات، هەروەها ئەو وەڵامانەی لە پرسیاری کراوەدا گەڕاونەتەوە؛ ئەبێت توێژەر پۆلێنیان بکات، واتە پرســـیارەکان پۆلێن بکرێنو؛ هەریەکە وەڵامی خۆی تێدا دابنرێتو خشتەی بۆ دروست بکرێت. هەروەها داتا وەسفییەکان بۆ داتای چەندێتی؛ بگۆڕدرێن؛ تا لەرووی ئامارەوە چارەســـەریان بۆ بکرێت.
نموونە: پرســـیارێك کراوە سێ وەڵامی بۆ نوسراوە، ئـامـار مـامەڵە لەگەڵا چۆنێتی (وەڵام) ناکات، بەڵکو لەگەڵ ژمارە مامەڵە دەکات، لەباشـــترینو خراپترین حــاڵەتــدا ژمــارە دائەنرێــت. دواتر ئەو ژمــارانە لەکۆمپویتەردا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.

خســـتنەڕووی ئەنجامەکان: ئەو ئەنجامەی کە توێژینەوەکە دەریخســـتووە ئەبێت بەبێ دەســـتکاریو بەوپەڕی راســـتگۆیی‌و ئەمانەتەوە بخرێتەڕوو؛ تەنانەت ئەگەر تەواو دژبە دیدو بۆچونی ئەو توێژەرانە یان ئەو لایەنە بێت کە بەتوێژینەوەکە هەستاون.

نوسینەوەی راپۆرت بەشێوەیەکی زانستی: دوای خستنەڕووی ئەنجامەکان توێژەر دەســـت بە نوســـینەوەی راپۆرتەکەی دەکات، بەشـــێوەی زانســـتی‌و روون کە خوێنەر لێی تێ بگات. ئەم شـــێوازە ئەکادیمیە جیاوازە لەنووســـینی بواری ئەدەب‌و دارشـــتن، ئەبێت وشـــەکان یەك لێکدانەوەو؛ مانای تایبەت بەخۆیان هەبێت. ئەگەر وشـــەی داتاشراو و دوور لەئاســـتی تێگەیشـــتنی خوێنەرو؛ ئالۆزی تیادابوو دەبێت لەپەراوێزدا ئاماژە بەمەبەستی ئەو ووشەیە بدات تاکو بەهەڵە ماناکەی لێکنەدرێتەوە.

## 2. رووپێوی فێرکاری

ئەم جۆرە توێژینەوانە ئـامـانجیـان دارشـــتنی پلانگەلێکە کە دەبنە هۆی بەرزکردنەوەو زیادکردنی توانـای کارمەنـدانی بواری فێرکردن، ئەویش لەرێی ئەنجـامـدانی رووپێوی گشـــتییەوە بۆ هەموو یان هەنـدێك بواری فێرکردن تابتوانرێت کێشـــەکانی دیاری بکرێن‌و؛ ئەو رەخنانە بزانرێن کە ئاراســـتەی پرۆسەی فێرکردن دەکرێن. بوارەکانی ئەم ڕووپێویەش بریتین:

1. رێکخستنی یاسایی‌و کارگێری فێرکردن.
2. لایەنی دارایی.
3. خەسڵەتەکانی کارمەندانی بواری فێرکردن.
4. بارورەوشی خوێندکاران.
5. پرۆگرامەکان‌و رێگاکانی وانەووتنەوە.
6. چوارچێوەی کۆمەڵایەتی‌و کولتوری فێرکردن.

**3: شیکاری ئەرکەکان (تحليل الوظائف)**

توێژەر لەڕێگای ئەم شـــێوازەی توێژینەوەیەوە؛ زانیـاری لەســـەر ئەرکو لێپرسراوێتیو چالاکییەکانی کارمەندان کۆدەکاتەوە، کە لەکاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکەدا، لەخزمەتکردندان. ســـەرباری زانینی پەیوەندییەکان لەنێو سیستمی کارگێڕیدا، بۆ ئەم مەبەستانەش توێژەر شیکاری ئەرکو لێهاتوویی و کارمەندانو داواکارییەکانی کار دەکات. هەروەها ئەمانەش لەخۆ دەگرێت:

1. دۆزینەوەی خاڵی لاوازیو دووبارەبووەوە لەکاتی ئەنجامدانی کاردا.
2. پۆلێن کردنی ئەرکەکان.
3. خەمڵاندنی کرێو مووچەکان.
4. دیاریکردنی مەرجەکانی پاڵێوراو.
5. دیاریکردنی بەرنامەو پرۆگرامی مەشقو ڕاهێنان.
6. وەرگرتنی بڕیاری تایبەت بەگواستنەوەی فەرمانبەران.
7. دەستەبەرکردنی بناغەی تیۆری بۆ لێکۆڵینەوە لەپیشەو ئەرکە تایبەتەکان.

هەموو ئەمانەش بۆ جێبەجێکردنی ئەو وتەیەیە کە دەڵێت: (دانانی کەسی گونجاو لەشـوێنی گونجاودا) لەپرۆســەی شـیکاردا، پێویســتە ســەنگی ڕێژەیی هەریەکێك لەو ڕەگەزانە بەهەند وەربگیرێت، تاکو وێنەیەکی ڕۆشـــنی ئەرکو داواکارییەکانی، ڕوونو ئاشکرابن.

**4: ڕووپێوی ڕای گشتی:**

ڕای گشـــتی بریتیە گوزارشـــتی گروپو جەماوەر ســـەبارەت بەبابەتێك کە تـایبەتە بەخۆیـانەوە یـان پرســـێکی گرنـگ یـاخود کێشـــەو گرفتێـك کە بەدەستییەوە دەناڵێنن. ئەو توێژەرانەی ئەم ڕووپێوییە دەکەن؛ بەمەبەســتی گەیشـــتن بەزانیاریو داتا؛ کەرەســـتەی هەمەجۆر بەکاردەهێنن وەك پێوەرو فۆرمی ڕاپرسیو چاوپێکەوتن. پێویســـتە توێژەران ئاگاداری ئەو گۆڕاوانەبن کە

ڕەنگە کاریگەری لەســەر وەڵامی لێکۆڵراوەکان بەجێ بهێڵێت وەك (پێگەی ئابوری و کۆمەڵایەتی و بارو زرفی سیاسی و رەگەزو هیتر).
شـــایانی ئاماژەیە لەجیهاندا چەندین پەیمانگاو رێکخراوی تایبەت هەن کە لێکۆڵینەوە لەســـەر رای گشـــتی دەکەن و لەکارەکانیاندا پشـــت بە ڕێبازی روپێوی دەبەســـتن، ئەوانیش: پەیمانگای گالوپ Gallup، روپێر Roper، هاریس Harris، کرۆســـلی Crossleyو هیتر. پەیمانگای گالوپ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا؛ کە کۆنترین پەیمانگایە لەســـەر رای گشـــتی روپێوی کردبێتو؛ لەساڵی (1935)ەوە هەتا ئێستا بەردەوامە روپێوی بۆ دیاریکردنی رایگشـــتی لەســـەر دیاردەکان؛ دەکات، بەتایبەتی هەڵبژاردنی ســـەرۆکی ئەو وڵاتە، لەپێش هەڵبژاردنـدا رای خەڵـك وەردەگرێـتو دواتر روپێوییەکەی لەنزیکەی سەد ڕۆژنامەو گۆڤاری کاغەزی و ئەلەکترۆنیدا بڵاودەکاتەوە.

5: **شیکاری ناوەڕۆك** Content Analysis

رێگـایەکە بۆ شـــیکردنەوەی بەرهەمی زارەکی و نووسراوی تـاکەکەســـان، تائەندازەیەکی زۆر لەمیتۆدی مێژووی دەچێت، خاڵی جیاوازیشـیان لەوەدایە کە میتۆدی مێژوویی بەتەواوی پەیوەسـتە بەرابردووە بەڵام رێبازی شـیکاری نـاوەڕۆك جەخـت لەســـەر پرس و رەوشـــە هەنووکەییەکـان دەکـاتەوەو؛ شێوازێکی تایبەت بەخۆی هەیە کە پێشکەوتووترە لەمیتۆدی مێژوویی.

**شـــیکار** Analysis پرۆســـەی هەڵوەشـاندن و بەش بەشـکردنی دیاردەیە بۆ پێکهاتەو ســـادەترین بەشـــەکانی، یان دابەشـــکردنی داتاکان و رێکخســـتنیانە لەرەگەزە بنچینەییەکانیدا بەمەبەســـتی گەیشـتن بە وەڵامی ئەو پرســـیارانەی کە توێژینەوەکە وروژاندویەتی.

**ناوەڕۆك** Content لەزانستی راگەیاندندا، هەموو قسەو وێنەو نووسراوێکی تاکەکەسە بەمەبەستی گەیاندنی ئامانجێك بەکەسانیتر.

**شـــیکـاری نـاوەڕۆك** ئەو میتۆدەیە کە زیـاتر لەبواری ڕاگەیـانـدنـدا بەکاردەهێنرێتو، دیارترین پێناســەش؛ پێناســەکەی بێرنارد بێرێلســۆن (Bernand Berelson)ە کە دەڵێت:" شـێوازێکی توێژینەوەیە بەمەبەسـتی وەســفکردنی (ڕێکخراو، چەندێتیو بابەتی)ی ناوەڕۆکی ئاشــکرای پرۆســەی گەیاندن". واتا ڕێگایەکی بابەتیو چەندێتییە بەئامانجی پێوانەکردنی هەندێك گۆڕاوو شیکاری پەیامی پەیوەندیی (زارەکی، نووسراو) بەشێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراو. یەکێکە لەشێوازە باوەکانی توێژینەوە مرۆییەکانو؛ بەهۆیەوە بابەتی شیکارکراو بەشێوەیەکی چەندێتیو چۆنیەتیو سیستماتیك وەسف دەکرێت. ئەم میـتۆدە بەتەنـهـا شـــیکـردنەوە نییەو؛ بەڵکو پرۆســـەی تێبینیو پێوانەکردنیشـە. ئەو بابەتەی شیکار دەکرێت ڕەنگە ووشـە، وێنەو تابلۆ، یان پـارچەیەك مۆزیـك یـاخـود بـابەتێکی بڵاوکراوەی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنیو ڕۆژنامەیی بێت. توێژەر ڕواڵەتی دەقەکە شـــیکار دەکاتو پەیوەندی بەنیازو مەرامی شـــاراوەی خاوەنەکەیەوە نییەو؛ دێڕەکان شـــیدەکاتەوە نەك نێوان دێڕەکان. لەڕێی ئەم میتۆدەوە هەر یەك لەم بابەتو بوارانە شـیکار دەکرێت (دیـدوبۆچوونە بـاوەکانی نێو نـاوەڕۆك، بەدواداچوون بۆ شـــێوازە ئەدەبیو زانســـتییەکان، دۆزینەوەی جیـاوازی لەنـاوەڕۆکی ڕاگەیـانـدنی دەوڵەتـانـدا، بەراوردکردنی کەرەسـەو ئاسـتی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، دڵنیابوون لەگەیشـتنی ئامانجەکانی کۆمۆنیکەیشـــن، بەڵگەنامە مێژووییەکان، پێوانەکردنی ئاســـتی خوێندراوەیەتی ناوەڕۆك، زانینی مەبەســـتو خەسـڵەتەکانی بەرهەمهێنەرانی گەیاندن، دیاریکردنی باری دەروونی تاكو گروپەکان، دۆزینەی گرنگیپێدانو ئارەزوو بەها کۆمەڵایەتییەکان، وەســفکردنی کاردانەوەی کەســانیتر بەرانبەر بەناوەڕۆك، دۆزینەوەی شێوازەکانی پڕوپاگەندەو...هتد).

## جۆرەکانی شیکار

1. **شـیکاری راسـتەوخۆو ناراسـتەوخۆ**: شـیکاری راسـتەوخۆ پەیوەسـتە بەشیکردنەوەی ئەوەی کە ووتراوەو راگەیەنراوە، بەڵام شیکاری ناراستەوخۆ لەهەوڵی دۆزینەوەی ئەو شتانەدایە کە لەپەیامەکەدا نین‌و؛ رانەگەیەندراون؛ واتا ئەو شتانەی نەوتراون‌و فەرامۆش کراون.

2. **شـیکاری (چەندێتی‌و چۆنێتی‌و جۆرایەتی)**: شـیکاری چەندێتی بەدوای چەندبارەی بیرۆکەکانەوەیە؛ واتا چەندجار ووشـەو هێماو هزرو بیرۆکەکان دووبارە بوونەتەوە. بەڵام شیکاری چۆنێتی لەوەش زیاتر دەڕوات‌و دەپرسێت: کام خەسڵەت هەیەو کامە نییە؟ بۆچی بایەخ بەخەسڵەتێك دراوەو بەهیتر نەدراوە؟ لایەنگری کردووە یـان دژایەتی دەکـات، پەسـەنـد یـان رەتی کردۆتەوە؟... هتـد. شـیکـاری جۆرایەتی کە سـێیەمیـانە؛ بەدووبـارەو چۆنێتییەوە ڕاناوەستێت‌و لەهەوڵی وەڵامدانەوەی پرسیارێکی جەوهەریدایە ئەویش بریتیە لەچۆنیەتی گەیشـتن بەخەسـڵەتەکە، بەواتایەکیتر بەدوای حەقیقەتی گەیاندنەوەیە وەك پرۆسەیەکی پەرەسەندوو؛ پاشان بەدوای ئەو پرۆسە دەروونیانەوەیە کە لەپشت ووشەو هێماکانەوە شاراوەو نادیارن.

3. **شیکاری هێمایی**، دارشتنی خشتەی چەندێتی، شیکاری بابەت: مەبەستی راسـتەقینە لەشـیکاری هێمایی گەیشـتنە بەو لۆژیکە گشـتییەی لەپشـت پەیامەکەوە نادیارو شـاراوەیە، توێژەر لێرەدا نایەوێت وەسـفی ناوەڕۆکی هزرەکە بکات، بەڵکو دەچێتە قوڵایی یەکێتی هزرەوە. هەروەها شـیکاری هێمایی لەناونیشان‌و سەری بابەتەکاندا دەوەستێت‌و پێیوایە خاوەنی ئاماژەی بابەتین‌و؛ بەلایەوە ناونیشـان هەمیشـە ئاوێنەی ناوەڕۆکی پەیامە. دارشـتنی خشـتەی چەندێتییەکان دەربڕین‌و گوزارشـتێکیتری شـیکردنەوەی چەندێتی ناوەڕۆکەو؛ تەنها بەخسـتەڕووی لایەنی چەندێتی‌و ژمارەوە رادەوەسـتێت. بەڵام سـەبارەت بەشـیکاری بابەت کە پلەیەکی باڵایە لەشـیکاری ناوەڕۆکدا

ئامانجیەتی بەو بنەما گشـــتییە بگات کە لەکۆتاییدا ئاماژەیە بۆ یەکێتی بابەتو لەپشت چەمکەکانەوەیە.

**ڕێکارییەکانی شیکاری ناوەڕۆك:**

**1. دیاریکردنی کێشــەی توێژینەوە:** ئەم هەنگاوە هەروەك لەمیتۆدەکانیتری توێژینەوەدا ئاماژەمان بۆکردووە، خاڵی دەستپێکەو پێویستە توێژەر بەوردیو بەڕوونی کێشـــەی توێژینەوەی دیاری بکات، بەبێ ئەم قۆناغە هەنگاوەکانیتر هیچ مانایەکیان نابێت.

**2. دارشـــتنی گریمانە یان پرســـیارەکانی توێژینەوە:** ئاشـــکرایە گریمانە پێشـــنیاری ســـەرەکینو ســـەلماندنی راســـتیو ناراســـتییان لەژێر ڕۆشـــنایی ئەنجامەکانی توێژینەوەدان. شـــیکاری ناوەڕۆك پشـــت بەو گریمانانە دەبەســـتێت کە لەواقیعی کێشـــەی توێژینەوەوە ســـەرچاوە دەگرنو؛ یارمەتی توێژەر دەدەن بۆ پێشـــبینی کردن. نووســـینی گریمانەش پشـــت بەئەزموونی توێژەرو ئەو توێژینەوانە دەبەســـتێت کە پێشـــتر ئەنجامدراونو لەبەردەســـتی توێژەردان..

**3. دیاریکردنی کۆمەڵگەی توێژینەوە:** مەبەســـت لێی؛ دیاریکردنی ســـنوری ئەو ناوەڕۆکەیە کە توێژەر خوازیـارە لێی بکۆڵێتەوە، بۆ ئەمەش پێویســـتی بەپێناسەی کارراپی گونجاوی کۆمەڵگەی توێژینەوەکەتی.

**4. هەڵبژاردنی ســامپڵی توێژینەوە:** ئاشــکرایە وەرگرتنی ســەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگەی توێژینەوە کە تێکرای ناوەڕۆکەکەیە، باشترین بژاردەیە بەڵام ئەم کارە؛ ئاســـتەمو قورسو دژوارە، بۆیە بەناچاری روو لەوەرگرتنی ســـامپڵێك لەناوەڕۆکە دەکرێت ئەویش لەکاتێکدا کە ڕەهەندەکانی کاتو شوێن بەهەند وەربگیرێن. لەم میتۆدەدا کە سامپڵ وەردەگیرێت، پێویستە جیاکاری لەنێوان سێ ئاســتەکەی ســامپڵدا بکرێت کە تایبەتن بەشــیکاری ناوەڕۆکەوە، ئەوانی ئەمانەن:

**یەکەم**: بریتییە لەو ئاســتەی ســامپڵ کە تایبەتە بەســەرچاوەوە: واتا دیاریکردنی جۆری ئامرازەکانی ڕاگەیاندن کە مەبەســتە بەپێی ئامانجەکانی توێژینەوە، شیکار بکرێن. بۆ نموونە توێژەر شیکاری ڕۆژنامەی ڕۆژانە دەکات یان گۆڤاری مانگانە یان...هتد. پاشــان کام ڕۆژنامەو کام گۆڤارو کام کەناڵی تەلەفزیۆنی هەڵدەبژێرێت؟.

**دووەم**: ئەم ئاســتە تایبەتە بەژمارەکانی ســەرچاوەکەوە، واتا چەند ژمارەی بڵاوکراوەی گۆڤارەکە؛ یان چەند وەرزی پەخشی_ کەناڵە تەلەفزیۆنییەکە وەردەگرێت.

**ســێیەم**: ئاســتی ســێیەم تایبەتە بەمادەی شــیکارەکەوە، چ مادەیەك لەژمارەکانی گۆڤارەکە، یان پەخشــی کەناڵە تەلەفزیۆنییەکە؛ شــیکار دەکرێت؟ لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکە یان کۆتایی، گۆشــەو ســتوونەکانی ڕۆژنامەکە، یاخود پەخشــی ســەرەکی هەواڵەکان یان بەرنامە کۆمەڵایەتییەکانی کەناڵەکە؟.

5. **دەستەکانی شیکار** (فئات التحليل)

مەبەست لەدەستەکان (Categories) ئەو ڕەگەزە سەرەکیو لاوەکییانەیە کە یەکەکانی شــیکاری تێدا دادەنرێتو؛ ئەکرێت هەر خەســڵەتێك لەخەســڵەتەکانی ناوەڕۆکەکەیان بخرێنە ناوەوەو بەهۆیانەوە پۆلێن بکرێن، یەکەکانی شــیکاریش بریتین لە: ووشــە، بیرۆکە، کەســێتی، برگەیە کە دواتر هەر یەك لەو یەکانە ڕوون دەکەینەوە.

هەر توێژەرێك بایەخ بەدەســتەکانی شــیکارەکەی نەداتو بەرێکوپێکی دایاننەڕێژێت، ڕوبەرووی چەندین کێشــە دەبێتەوەو ئاســتەمە بتوانێت چارەسەریان بکاتو سەرئەنجام پرۆسەی شیکارکردنەکەنەی وردیو بابەتی نابن. پێویســتە دەســتەکانی شــیکار ئەم خەسڵەتانەیان تێدا بێت کە ئەمانە گرنگترینیانە:

1. بەوردی وەڵامی پرسیارەکانی توێژینەوە بداتەوە.
2. ئەبێت گشـــتگیر بێتو تەواوی ئەو لایەنانە بگرێتەوە کە توێژەر بەنیازە لەمادەی کۆمۆنیکەیشنەکەدا؛ شیکاری بکات.
3. ئەبێت جیاوازی نێوانیان دەربخات تاکو ناوەڕۆکێك لەژێر دوو دەســتەی جیـاوازدا پۆلێن نەکرێـت، بەزمـانی ئـامـار ئەبێـت دەســتەکـان لەمپەڕی ئاڵوگۆڕکاری بن.
4. نابێت ئەوەندە گشـــتیو فراوان بێت کە بۆ ژمارەکی گەورەی رەگەزەکانی شیکارکردن؛ دەستبدەن.
5. پێویســتە لەدەســتەکانی شــیکاردا، دەســتەی وەها هەبێت کە ئەوەندە فراوان بێت؛ بۆ دیاردەیتری مادەی کۆمۆنیکەیشـــن بشـێنو لەبار بێت، ئەو مـادانەی کە نـاتوانرێت لەژێر چەتری دەســـتە دیاریکراوەکانی شـــیکاردا؛ بگونجێندرێن.
6. **یەکەکانی شیکار** (وحدات التحليل)

یەکەی شـــکار ئەو شـــتەیە کە بەکردەوەو بەواقیعی ئەپێورێـتو هەژمـار دەکرێت، بچوکترینو لەهەمان کاتدا گرنگترین رەگەزی شـــیکاری ناوەڕۆکە. یەکەی شـــیکار رەنگە ووشـــەیەك؛ هێمایەك یان بۆچوونێکی گشـــتی بێت، لەوانەشـــە تەواوی ووتـارێـك یـان چیرۆکێکی ئەدەبی بێـت. لەشـــیکـاری تەلەفزیۆنیشـدا ئەشـێت یەکەکانی شـیکردنەوە کاراکتەرەکان هەموو پرۆگرامە پەخشـکراوەکان بێت. بێرێلسـۆن پێنج یەکەی بۆ شـیکاری ناوەڕۆك پێشـنیار کردووە کە ئەمانەن:

**ووشە** Word: بچوکترین یەکەی شیکارەو لەوانەیە ووشەکە هێمایەك یان چەمکێك بێت. ووشـــە کە یەکەیەکی شـــیکاری ناوەڕۆکە؛ لەهەڵوێســـتە جیاوازەکاندا بەکاردەهێنرێت وەك: توێژینەوە لەچەمکە ســـیاسیو ئابوریو

کۆمەڵایەتییەکانو هیتر. هەروەها بۆ شیکردنەوەی ئاستی سووکیو قورسی مادە نووسراوەکە (واتا ئاستی خوێندراوێتی) بەکاردەهێنرێت.

**بیرۆکە** Theme:- مەبەست لێی؛ رستەی سادەیە یان ئەو بیرۆکەیەیە کە تایبەتە بەکەسێکی دیاریکراوەوە، ئەوەی کە لەرێزماندا پێی دەڵێن:رستەی تەواوو بەسوود. بیرۆکە یەکەیەکی گەورەی شیکارکردنەو؛ لەو کاتانەدا بایەخو کەڵکی خۆی هەیە کە توێژەر بەدوای هزرو بەهاکاندا دەگەڕێت.

**کەسێتی** Character: ئەم یەکەیە لەشیکردنەوەی چیرۆكو رۆمانو یادداشتو کتێبە مێژووییەکاندا بەکاردەهێنرێت، ئەو کەسێتییەش رەنگە سیاسی؛ مێژوویی؛ ئەندێشەیی یان واقیعی بێت.

**برگە** Item:- ئەم یەکەیە بەیەکەی سروستییش ناوزەد دەکرێتو؛ بەپێی توێژینەوەکان دەگۆڕێت، لەوانە کتێب، گۆڤار، ووتار، چیرۆك، سەرووتار، ستوونێکی رۆژنامە یاخود بەرنامەیەکی رادیۆیی یان تەلەفزیۆنی بێت.

**پێوەرەکانی رووبەرو زەمەن** Space & Time measurement:- ئەو رووبەرەیە کە مادەی شیکارەکە داگیری کردووە. رەنگە لاپەڕە تەرخانکراوەکان بێت بۆ ستوون یان سەرووتارەکە. یەکەی زەمەنیش ئەوکاتەیە کە مادەی شیکارەکە خایاندوویەتی، بۆ نموونە: ووتاری سەرۆکەکان، یان کاتی تایبەت بەپرۆگرامێکی رادیۆیی یان تەلەفزیۆنی کە بەچرکەو خولەكو کاتژمێر دەپێورێن. ئەم یەکەیە لەتوێژینەوە ئابورییەکانیشدا زۆر بایەخی پێدەدرێت.

### 7. ئامرازی شیکار

ئەو فۆرمەیە کە توێژەر بۆ کۆکردنەوەی داتاو زانیاری دایدەڕێژێتو تێکڕای چەندبارەکانی تێدا دەنووسێتو دایدەنێت. ئەو فۆرمەش بەندو خانە سەرەکییەکانی شیکار لەخۆ دەگرێت، هەورەها رەگەزە لاوەکییەکانی تیا دادەنرێت بەجۆرێك هەموویان لەستووندا بن لەلای راستی لاپەڕەکەوە.

پاشـــان ئەو ســـتوونانە دێن کە ژمارەی هەر ڕەگەزێکی مادە شـــیکارکراوەکە نمایش دەکەن.

**جێگیریی** الثبات Reliability

مەبەســـــت لەجێگیریی وردی پێوەرو تۆکەمەییەتی، بریتییە لەهـاوکۆلکەی پەیوەســـتبوونی (معـامـل الارتبـاط) نمرەی ئەو تـاکانەی کە بەپرۆســـەی شـیکارکردنەکە هەڵدەسـتن. یان خەملاندنی نمرە بۆ ئەو کەسـانەی نمرەیان لەشـــیکارکردنەدا داناوە. لەشـــیکاری ناوەرۆکدا جێگیری بەندە بەئەزموونی شـیتەڵکارو؛ لێهاتوویی لەشـیکارکردنو؛ جۆری داتا شـیکراوەکانو، ئاسـتی ڕۆشـنی پۆلێن کردنەکەو؛ جۆری یەکەی شـیکارکردنو، ڕوونیو ئاشـکرایی بنەماکانی شیکارکردنەوە.

چەند هاوکێشەیەکی ماتماتیکی هەیە کە بۆپێوانەکردنی هاوکۆلکەی جێگیری بەکاردێن لەوانە:

•هـاوکۆلکەی ســـکۆت Scott بۆ دۆزینەوەی نمرەی جێگیری لەنێوان توێژەرو دوو شیتەڵکاری دەرەکیدا، هەروەها هاوکۆلکەی گونجان بۆ دووجار شیکارکردنی خودی توێژەرەکە خۆی؛ لەدوو زەمەنی جیاوازدا. هاوکێشەکەش ئەمەیە:

$$\text{هاوکۆلکەی سکۆت} = \frac{Po - Pe}{1 - Pe}$$

Po = گونجان

Pe = جیاوازی

•هاوکۆلکەی هۆڵستی Holsti کە بریتیە لە:

$$\text{هاوکۆلکەی جێگیری} = \frac{2 \times \text{ت}}{\text{ن}1 + \text{ن}2}$$

ت= ژمارەی ئەو حاڵەتانەی کە دوو شیتەڵکارەکە لەسەری کۆکن.
ن1= ژمارەی ئەو حاڵەتانەی کە شیتەڵکاری یەکەم شیکاریکردوون.
ن2= ژمارەی ئەو حاڵەتانەی کە شیتەڵکاری دووەم شیکاریکردوون.

**راستی** الصدق Validity:

لەشـیکاری ناوەڕکدا راسـتیی بەندە بەشـێوازی وەرگرتنی سـامپڵو؛ ئاسـتی نوێنەرایەتی کردنی بۆ کۆمەڵگەی توێژینەوەو؛ رۆشـنی پۆلێنی دەسـتەکانو؛ بەرزی هاوکۆلکەی جێگیرییەوە.

### 8. شیکاری داتاکان

کەرەسـتەکانی ئاماریی وەسـفی (رێژەی سـەدیو؛ ناوەندی ژمێرەییو؛ ناوەندو نمرەی باو) بۆ شیکاری ناوەڕۆك گونجاوو لەبارن. خۆئەگەر توێژەر گریمانەی دارشـتبوو؛ ئەوا دەکرێت ئـامـاری ئـامـاژەکارییش بەکاربهێنێـتو، کـای سکوێریش(کا2) زۆرترین بەکارهێنانی لەگەڵ سامپڵەکانی شیکاری ناوەڕۆکدا؛ هەیە.

لەپاشـکۆی ئەم کتێبەداو؛ بەمەبەسـتی روونکردنەوەی هەنگاوەکانی ئەم میتۆدە زانسـتییە، توێژینەوەیەك خراوەتەروو کە بەمیتۆدی شـیکـاری ناوەڕۆك ئەنجامدراوە. بەناونیشـانی بەها لەکتێبی خوێندنەوەی کوردی پۆلی دووەمی بنەڕەتیـدا/ توێژینەوەیەکی شـیکـارییەو؛ لەلایەن دکتۆر سـابیر بۆکانییەوە ساڵی 2014 دا ئەنجام دراوە.

**دووەم: توێژینەوەی پەیوەندییەکان** (دراسة العلاقات).

ئـامـانجی ئەم جۆرە توێژینەوانە؛ زانینو دیـاریکردنی پەیوەنـدییە لەنێوان دیاردەو حەقیقەتەکاندا تاکو بەشـــێوەیەکی باشـــترو قووڵتر لەراســـتییەکان تێبگەین. لێکۆڵینەوە لەپەیوەنـدییەکـان رێبـازێکی پێشـــکەوتووی میتۆدی وەسفییەو بۆ ئەم سێ جۆرە پۆلێن دەکرێت:

1. **رێبازی مۆنۆگرافی** دراسة الحالة (Case study)

لەم رێبازەدا توێژینەوە لەســـەر دیاردەیەك دەکرێت رەنگە یەك کەس بێت یان دووان یان خێزانێك یان گروپێکی کۆمەڵایەتی، ئاینی، ســـیاسی بێت، یاخود گوند یان شـــارێك بێت، واتە تەنها یەك کەس ناگرێتەوە، بەگشـــتی لێکۆڵینەوە لەحاڵەتی یەك کەیس دەکرێت.

مۆنۆگراف واتە وەسفی بابەتی تاك، کۆمەڵناسەکانی فەرەنسا ئەم ناوەیان لەم میتۆدە ناوە، ئەم میتۆدە بۆخۆی لەبواری ســـایکۆلۆجیادا هەبووە؛ بەڵام زیـاتر دیـاردەی تـاکی بـاس کردووەو؛ بەقوڵی بەبـارورەوشی کەســـەکەدا شـــۆڕبۆتەوەو لێکۆڵینەوەی وردی بۆ هەموو لایەنەکانی ژیـانی کەســـەکە کردووە، مێژووی ژیـانی کەســـەکەو ئەو خێزانەی تیـایـدا ژیـاوە، بـاری تەندروستیو جەستەیی، تەواوی قۆناغەکانی ژیانی کە پیایدا تێپەڕیووە.

ئەم رێبازە مێژوویەکی کۆنی هەیە؛ لەمێژوودا کاتێك لێکۆڵینەوە لەتاوانبارێك کراوە، رەنگە هەنگاوەکانی زانســـتی نەبوو بێت. پێش ئەوەی بێ بەمیتۆدێکی زانستی کۆمەڵێك لایەنی لاوازی هەبووە. بەڵام ئەمڕۆ بەیەکێك لە میتۆدەکان ئەژماردەکرێتو؛، شوێنو جێگای خۆی لەناوەندە زانستیو ئەکادیمەکاندا هەیەو دانپێدانراوەو دەکرێت لەزۆربەی بوارەکاندا ئەم رێبازە بەکاربهێنرێت.

لەگەڵا ئەوەی پێناســـەیەکی ورد نییە بۆ ناســـاندنی زانســـتیيانەی میتۆدی مۆنۆگرافی، بەڵام خاڵی هاوبەشی زۆربەی پێناســـەکان دەمانگەیەنێتە ئەوەی بتوانین بڵێین: توێژینەوەی مۆنۆگرافی ئەو رێبـازەیە بۆ کۆکردنەوەی داتـای

زانستی لەیەکەیەك، رەنگە ئەو یەکەیە تاکە کەسێك یان دامەزراوەیەك یان سیستمێکی کۆمەڵایەتی یان کۆمەڵگەیەکی خۆجێەتی یاخود کۆمەڵگەیەکی گشتی بێت، بەرێگەی قوڵ بوونەوە لەقۆناغێکی دیاری کراوی مێژووی ئەو یەکەیە یان سەرجەم قۆناغەکانی مێژووی ئەو یەکەیە بەئێستاشەوە؛ بەو مەبەستەی بتوانرێت؛ بەسەر ئەو یەکانەدا کە هاوشێوەی خۆین؛ گشتاندن بۆ ئەنجامەکەی بکرێت.

## خەسڵەتەکانی رێبازی مۆنۆگرافی

ئەم رێبازە کۆمەڵێك خاسڵەتی تایبەت بەخۆی هەیە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

1. مەرج نیە ئەو دیاردەیە تەنها تاکە کەسێك بێت، دەشێت زیاتر بێ و گروپێك بگرێتەوە.
2. رەنگە ئەو دیاردەیە دیاردەیەکی سەربەخۆبێ وەك کۆمەڵگەیەکی سەرەتایی دور لەشارستانی؛ رەنگە بەشێك بێت لەکۆمەڵگەیەکیتر یان گروپێکیتر.
3. ئەم رێبازە بەتەنها وەسفێکی دەرەکی یان رواڵەتی یەکەیەك نییە، وەك ئەوەی کە روپێویدا هەیە، بەڵکو قولبوونەوەیە لەتەواوی لایەنەکانی ئەو یەکەیە.

ئامانج لەم رێبازەدا؛ دیاریکردنی ئەو هۆکارانەیە کە کاریگەریان لەسەر ئەو یەکەیە هەیە کە توێژینەوەی بۆ کراوە؛ رەەنگە بۆ دەرخستنی پەیوەندییە هۆکارییەکانیش بێت، واتا هۆکارو ئەنجامەکان دەربخات.

هاوکات لەگەڵ بوونی خەسڵەتی تایبەت بە رێبازی مۆنۆگرافی، بەڵام کە تیۆری گەشتالت؛ لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا لەسایکۆلۆژیادا سەریهەڵدا، کاریگەرییەکی زۆری بەسەر ئەم رێبازەوە بەجێ هێشتو؛ ئەوەی دەرخست کە نابێت دیاردەیەك بەتەنها توێژینەوەی لەسەر بکرێت، واتە بەتەنها ناکرێ (بەش) توێژینەوەی لەسەر بکەین، ئەگەر لەگۆشە نیگای

(گشت)ەوە سەیری نەکەین‌و؛ لەهەر شوێنێکدا قسە لەسەر بەش بکرێ ئەبێت ئاماژە بۆ ئەو گشتە بکرێ کە ئەم بەشەی تێدەکەوێت. واتە توێژینەوە بەڕێبازی مۆنۆگرافی دابڕاو نییە؛ تاکو گشتاندنی بۆ نەکرێت. کەواتە ئەو خەسڵەتانەی لە گشتدا هەیە ئەبێ هەندێکی لەو بەشەدا هەبێت بۆ ئەوەی گشتاندنەکەی بۆ بکرێت.

بەشێوەیەکی گشتی پێناسەی ڕێبازی مۆنۆگرافی بۆ تاکەکەس دەگۆڕێت‌و جیاوازە،- بریتییە لەڕێگەیەکی ڕێکوپێك‌و ڕێکخراو بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر کەسێکی دیاریکراو بەوپێیەی بەشێکە لەکۆمەڵگە؛ بەمەبەستی دیاریکردنی شوێن‌و جێگای کەسەکەو ئەو ڕۆڵانەی کە دەیبینێ لەڕێگەی ڕەفتاری لەهەڵوێستە کۆمەڵایەتییەکاندا.

کە لێکۆڵینەوە لەزانایەك یان هونەرمەندێك دەکرێت‌و وەك دیاردەیەکی تەنهاو تاقانە، بەمێژووی ژیانی کەسەکە، ڕابردووی بنەماڵەکەی، بەرهەمەکانی، نامەکانی کە ناردویەتی، یاداشت‌و ئەو نوسراوانەش کە لەبارییەوە نوسراون (ڕەخنە؛ ستایش؛ سەرزەنشت)، واتە بەمێژووی ژیانی ئەو کەسەدا، شۆڕ دەبێتەوە لەسەرەتای لەدایکبونییەوە تاکو ئەو کاتەی تیایەتی. ئەم میتۆدە ناکەوێتە میتۆدی مێژووییەوە، چونکە باسی بارودۆخی ئێستا دەکات نەك ڕابردوو، کەسەکە لەئێستادا بوونی هەیەو ئەگەری ئەوەش هەیە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکرێت. یان تێبینی ڕەفتارەکانی بکرێت بەمەش هەموو ئەو زانیارییانە لەسەر ژیانی ئەو کەسە کۆدەکرێتەوە کە لەکۆمەڵگەدا بوونی هەیە، ئەو تاکە کەسە بەشێکە لەو گشتەی کە لەژیاندان‌و دەکرێت گشتاندنی بۆ بکرێت، بەمەرجێك لەگەڵ کەسانی هاوچەرخی کۆمەڵگەکەیدا؛ لێکچوون هەبێت.

خۆئەگەر توێژینەوە بۆ کۆمەڵگەی خۆجێی بکرێت ئەو کاتە دەتوانرێت بوترێت ڕێبازی مۆنۆگرافی بریتیە: لەڕێگەیەکی ڕێکوپێك بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پێویست لەسەر کۆمەڵگەی خۆجێی، تاکو لەڕێی ئەو داتایانەوە

بتوانرێ وێنەیەکی روونو ئاشکرا لەسەر ژیان لەناو کۆمەڵگەکە دەستبکەوێتو پێك بهێنرێت.

**هەنگاوەکانی مۆنۆگرافی**

بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە بەرێبازی مۆنۆگرافی پێویستە توێژەر بەچەند هەنگاوێکدا بڕوات کە گرنگترینیان ئەمانەن: -

1. دەبێت کێشەی توێژینەوەکە دەست نیشان بکرێ.
2. سنورەکانی کۆمەڵگەکە بەوردی دەست نیشان بکرێ، واتە دەربکەوێت ئەو کۆمەڵگەیە سەربەخۆیە یان بەشێکە لە کۆمەڵگەیەکیتر.
3. پێویستە توێژەر دڵنیابێت لەو زانیاریو داتایانەی کە لەسەر حاڵەتەکە دەستی کەوتوون، واتا تاچەند پشتیان پێ دەبەسترێت، ئەگەر کۆمەڵگەی توێژینەوە لەگۆڕانکاری خێرادابوو ئەوا ئەو زانیاریانەی کۆی کردونەتەوە؛ بۆ ماوەیەکی کاتین، بەڵام ئەگەر گۆڕانکاری کۆمەڵگەکە سستو خاو بوو؛ ئەوا کاری توێژەر ئاسانترە لەوەی یەکەمو؛ داتاکان زیاتر پشتیان پێ ئەبەسترێت.
4. دەستنیشان کردنی ئامرازی توێژینەوە کە زانیاریان پێ کۆدەکاتەوە، فۆڕمی ڕاپرسی؛ چاوپێکەوتن، یان گەڕان بەدوای بەڵگەنامەکاندا کە ڕەنگە هەبن، یاخود ئەچێتە ناو خەڵکەوەو ڕاستەوخۆ سەرنج و تێبینی لەسەر کۆمەڵگە ئەنوسێتەوەو تۆماری دەکات، لەم بارودۆخەدا توێژەر کە چووە ناو کۆمەڵگەوە، باشتروایە کەسێکی نامۆبێت بەو کۆمەڵگایە، لەبەر ئەم هۆکارانە:

- ئەگەر کەسەکە نامۆ بوو ئەوا زانیاریەکان بابەتیو دروستن، لایەنگری ناکاتو دوور لەخودگەرایی زانیاری کۆدەکاتەوە.
- خەڵکەکەش پێیان باشترە کەسێکی دەرەوە ئەو زانیاریانەیان لێوەربگرێ، چونکە ئەزانن ئەو کەسە کە کارەکەی تەواوکرد ئەڕوات، ناترسن لەوەی ئەو زانیاریانە بۆ کارو مەبەستیتر بەکاربهێنێت.

• لەوانەیە کەسانێك هەبن شەرم بکەن زانیاری بەکەسی ناسراوی خۆیان بدەن، بۆیە بێ سڵەمینەوە زانیاری بەبێگانە ئەبەخشن.
• ئەگەر ناکۆکیو ململانێ لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا هەبوو؛ ئەبێت توێژەرێکی نامۆ بچێت بۆ توێژینەوەو لێیانبکۆڵیتەوە، ئەگەر ناسراو بێت بەلای چاکی شتەکاندا دایدەشکێنێت، بەڵام ئەگەر بێلایەن بێت، ئەوا بێباکە لە دەرخستنی باشیو خراپیەکان.

**کەموکورتیەکانی میتۆدی مۆنۆگرافی**

هەر رێبازێکی توێژینەوە، لایەنی باشو خراپو؛ بەهێزو لاوازی خۆی هەیە. رێبازی مۆنۆگرافیش بەدەرنیە لە کەموکورتیو؛ شارەزایان بەم شێوەیەی خوارەوە دیاری دەکەن:

1. ئەو زانیاریو داتایانەی بەم رێگەیە کۆدەکرێتەوە، تارادەیەکی زۆر راستگۆ نین، تەنانەت لەبارودۆخێکیشدا کە توێژەرەکە نامۆو بێگانەش بێت بەکۆمەڵگە یان تاکەکەسەکە.
2. کاتێك توێژەر دەچێتە شوێنێکەوە، پرسیارلێکراو هەوڵا دەدات بەدڵی توێژەرەکە بدوێت، واتە شتێك دەخاتەڕوو، کە لەگەڵا ئەودا دەگونجێتو زۆرێك لەراستییەکان دەشێوێنێت.
3. لێکۆڵراو شتێ دەڵێ، کە لە دیدو بۆچوونی خۆیەوە راستەوخۆ گوزارشتی لێدەکات، واتە هەموو ئەو شتانە ئەخاتەڕوو، کە پاساون بۆ رەفتاری خۆی.
4. رەنگە ئەو زانیاریانەی لێکۆڵراوەکە دەیخاتەڕوو؛ گەورەی بکاتو؛ بەشێکی لەئەندێشەی خۆیەوە هێنابێتو؛ ئەو رووداوەکە وەك خۆی نابینێت، بەڵکو تەنها ئەو شتانە ئەبینێت کە ئەیانزانێت.
5. لەسەر دیاردەیەك کە زانیاری کۆدەکرێتەوە رەنگە ئەو دیاردەیە بێ هاوتا بێت، کەواتە ناکرێ گشتاندن بۆ ئەنجامەکان بکرێ، چونکە تایبەتمەندیو خەسڵەتی خۆی هەیەو جیاوازە لەوانیتر.

6. توێژەر کە لە دیاردەیەك دەکۆڵێتەوەو تیایدا قووڵ دەبێتەوە، بەجۆرێك لەجۆرەکان هەستو سوزی دەجوڵێو هاوسۆز دەبێتو؛ لەبابەتیبوون دوور دەکەوێتەوە.

7. ئەگەر پشت بە زانیارییەك بەسترا کە کەسێك نوسیبووی، رەنگە توێژەر تووشی دژواری بێت، چونکە ئەو کۆمەڵێ چەمك و زاراوە بەکاردێنێ کە مەبەستی تایبەتی هەیە لێیان، مەرج نییە توێژەر بەهەمان شێوە لێیان تێبگات.

8. رێبازی مۆنۆگرافی کاتو بودجەو ماندوبوونی زۆری دەوێتو، رەنگە ئەمەش ببێتە هۆی سنوردارکردنی.

باسکردنی ئەم کەموکورتیانە دەمانگەیەنێتە ئەوەی بوترێت: توێژینەوە بەرێبازی مۆنۆگرافی بۆ هەموو بارێك نابێتو سنوردارە؛ چونکە حاڵەتەکان تاکایەتینو؛ لێکچوونیان کەمە، لەبەرئەوە گشتاندن بۆ ئەنجامەکان ناکرێو زەحمەتە. لەلایەکیترەوە هیچ حاڵەتێکیش نییە بێ وێنەو بێ هاوتابێو هەمیشە جۆرێك لەتێکەڵاوی لەناو دیاردەکاندا دەبینرێت؛ بۆیە دەکرێت گشتاندن بۆ ئەنجامەکان بکرێتو توێژەریش هەوڵبدات بەسەر ئەو کێشەو کەموکورتیانە زاڵبێتو چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوەو؛ وەك بەرزترین ئاستی بابەتیبوونیش؛ لەخودگەرایی دورکەوێتەوە تاکو زانیارییەکان راستو دروست بن.

2. **توێژینەوەی بەراوردی هۆکارەکان** (دراسە المقارنة للاسباب):

لەم رێبارەی توێژینەوەدا؛ هەوڵدەدرێت ئەو هۆکارانە بدۆزرێنەوە کە لەپشت رەفتاری گروپێکەوەن، پاشان لەگەڵ گروپێکی هاوشێوەدا بەراورد بکرێت کە ئەو رەفتارە ئەنجام نادەن یان ئەنجامیان نەداوە. ئەم رێبازەش لەکاتێکدا بەکاردێت کە ئاستەم بێت بۆ دۆرزینەوەی هۆکارەکان؛ پشت بەمیتۆدی ئەزموونگەری ببەسترێت. خاڵی بەیەکگەشتنی توێژینەوەی وەسفیو

ئەزموونگەرییەو؛ ئەم ڕێبارەی توێژینەوەیەیە، گەرچی سنووری بەکارهێنانی لەبەر ئەم دوو هۆکارە دیاریکراوە:

1. ئاڵۆزی دیاردە مرۆییەکان (دەروونیو کۆمەڵایەتی).
2. نازانرێت کام گۆڕاو لەگۆڕاوەکان هۆکارە یان ئەنجامە.
3. **توێژینەوەی پەیوەستبوون** (الدراسات الإرتباطية):

ئەم جۆرە توێژینەوەیە هەوڵدەدات ئەو پەیوەندی یان پەیوەستبوونە بدۆزێتەوە کە لەنێوان دوو گۆڕاو یان زیاتردا هەیەو؛ جۆری پەیوەستبوونەکەش دیاری بکات، ڕەنگە لەڕێی توێژینەوەی پەیوەستبوونەوە توێژەران بتوانن پێشبینی ئایندە بکەن بەڵام پەیوەستبوونی دووگۆڕاو یان زیاتر ئەوەمان بۆ یەکلا ناکاتەوە کامیان هۆکارو کامیان ئەنجامن بۆ ئەویتریان.

4. **توێژینەوەی پەرەسەندووەکان** (دراسات التطورية):

ئەم جۆرە توێژینەوانە بەتەنها ڕەوشی ئێستای دیاردەو پەیوەندییەکانی نێوانیان دەرناخات، بەڵکو بەدوای ئەو گۆڕانکارییانەوەیە کە بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار ڕوودەدەن. ئەم توێژینەوانە دووجۆرن:

**یەکەم توێژینەوەی گەشە:** ئەو توێژینەوانە دەگرێتەوە کە تایبەتن بەگەشەی عەقڵیو زمانیو هەڵچوونیو کۆمەڵایەتی..هتد. ئەویش بەدوو ڕێگای توێژینەوە ئەنجام دەدرێن ئەوانیش ڕێگای درێژیو ڕێگای پانین، هەر یەکێکیشیان تایبەتمەندی خۆی هەیە کە تارەدەیەکی زۆر پێچەوانەی ڕێگەیترە.

1. **ڕێگای درێژی:** لەم ڕێگایەدا توێژەر لەسەرجەم لایەنەکانی گەشەی گروپێك (منداڵ) دەکۆڵێتەوە لەزەمەنێکی درێژدا ڕەنگە چەندین ساڵی بەدوای یەکداهاتوو بخایەنێت، بۆ نموونە لەساڵی یەکەمی تەمەنیاندا توێژینەوەیان بۆ دەکات، بەردەوام دەبێتو بۆ ساڵی دووەمو سێیەمو چوارەمی تەمەنیانو زیاتر، تا بزانێت ئەو گۆڕانکارییانە چین کە ڕوودەدەنو

بەچ خێراییەك دێنەئاراوە. هەر بەتەنها وەســـف ناکات؛ بەڵکو لەهۆکاری گۆڕانکارییەکان دەکۆڵێتەوەو ڕافەیان دەکات. ئەم ڕێگایەی توێژینەوە چەند خەسڵەتو تایبەتمەندێتیەکی هەیە کە ئەمانەن:

- بۆ ئەنجامدانی پێویستی بە زەمەنێکی دووررو درێژە.
- ئەبێت سامپڵەکەی بچووك بێتو لەگەڵ سامپڵی گەورەدا ناگونجێت.
- زۆرێك لەلایەنەکانی گەشـــە لەخۆدەگرێت (عەقلی، هەڵچوونی، زمانی، کۆمەڵایەتیو... هتد).
- کاتو ماندووبوونو تێچوونی زۆری دەوێت.

2. **ڕێگـای پـانیی:** لەم ڕێگـایەدا بۆ لێکۆڵینەوەی لایەنێکی گەشـــە؛ زیـاتر لەگروپێك منداڵ؛ وەردەگیرێت کە تەمەنی هەر گروپێك لەوانیتر جیاوازترە (گروپێك تەمەنیان یەك ســاڵە، گروپێکیتر دوو ســاڵ، گروپی ســێیەم؛ سێ ســـاڵو ... هتد). ئەم ڕێگایە تارادەیەکی زۆر لەڕێگای درێژی جیاوازەو بەم خەسڵەتانە جیادەکرێتەوە:

- لەزەمەنێکی کورتدا ئەنجام دەدرێتو پێویستی بە زەمەنی درێژ نییە.
- ئەتوانرێت لەگەڵ سامپڵی گەورەدا بەکاربهێنرێت.
- کەمترین لایەنی گەشە لەخۆ دەگرێت، بەبەراورد بەڕێگای درێژی.
- کاتو ماندووبوونو تێچوونی کەمی پێویستە.

**دووەم توێژینەوەی بۆچوونەکان**: ئەم چەشنە توێژینەوانە پشت بەو داتاو زانیارییە دەبەســـتن کە لەکاتە جیاوازەکانداو؛ لەوەرگرتنی بۆچوونەکانەوە؛ کۆکراوانەتەوە بەو بۆچوونانەشـەوە کە پێشـبینی ڕووداوە چاوەڕوانکراوەکانی ئاینـدە دەکەن. بەهۆی زیادبوونی بایەخـدان بەپلانـدانانی هۆشـــیارانەی پشـــتبەســـتوو بەبۆچوونە کۆمەڵایەتیو ئابووریو ســـیاســـییەکان، ئەم جۆرە توێژینەوانە زیاتر بایەخیان پێدراوو گەشەیانکرد. ئاشـکرایە بەهۆی ڕووداوی کتوپڕو چـاوەڕواننەکراوە، هەڵەو کەموکورتی زیـاتر لەو پێشـــبینییـانەدا

دەردەکەون کە بۆ زەمەنی درێژخـایەن دەکرێن، لەبەرئەمەیە کە زۆربەیـان ناراست دەردەچن‌و لەواقیع دوور دەکەونەوە.

5. **توێژینەوە بەدواداچوونییەکان:**

ئەم جـۆرە تـوێـژینەوانە لەگـروپێـك مـرۆڤ دەکـۆڵێتەوە، کە پێشـــترو لەقۆناغەکانی ژیانیاندا توێژینەوەیان لەســـەر کراوە، بەمەبەســـتی زانینی بـاروزروف‌و گوزەران‌و کێشـــەو گرفتەکـانیـان‌و ئەو گۆڕانکـارییـانەی کە بەســـەریـانـدا هـاتووە. زۆرجـار ژمارەی ئەنـدامـان زۆرن‌و هەنـدێك جـاریش ســـامپڵەکە بچووکە. هەنـدێکجـار ژمـارەیەك گۆڕاوی کەم وەردەگیرێـت‌و هەندێکجاریتر ژمارەی گۆڕاوەکان زۆر زۆرن.

## میتۆدی ئەزموونگەری

میتۆدی ئەزموونگەری لەنێو میتۆدەکانـدا؛ وردترین میتۆدی توێژینەوەیەو ڕەنگە لەهەموویان ئاڵۆزو قورستر بێت. لەم ڕێبازەدا توێژەر بەتەنها دۆخەکە وەسفو دیاری ناکاتو؛ چالاکییە زانستییەکەی هەر ئەوەندە نییە کە تێبینی ئەو ڕەوشــە بکـات کە هەیە، بەڵکو لەوەش زیـاترەو هەڵـدەســتێـت بەچـارەســەرکردنی فـاکتەرەکـانی تـوێژینەوەکەیو؛ بەشــێوەیەکی وردو سـیسـتماتیك کۆنترۆڵیان دەکات تاکو لەهۆکارەکانی بەرقەراربوونی ڕووداوێك بکۆڵێتەوە. لەئەزموونگەریدا کۆنترۆڵی فاکتەرەکانی هەڵوێستەکە دەکرێتو؛ تەنها یەکێك لەفاکتەرەکان ڕەها دەکرێت تا بزانێت بەچ ئاســتێك ڕۆڵی لەڕوودانی هەڵوێســتەکەدا هەیەو؛ دواتر ئەنجـامەکەشی بەوردی هەژمـار دەکرێـت. لەم میتۆدەدا بەمەبەســتی تـاقیکردنەوەی گریمـانە؛ ئەزموون بەکاردەهێنرێتو بڕیار بەســەر پەیوەندی نێوان دوو فاکتەر یان دوو گۆڕاودا دەدرێت.

**میتۆدی ئەزموونگەری** بریتیە لەهەموارکردنێکی وردو مەبەســتـداری هەلومەرجی دیاردەیەكو تێبینیکردنی، پاشـــان لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی ئەو گۆڕانکارییەی کە لەئەنجامی هەموارکردنەکەدا؛ بەســەر دیاردەیەکەدا دێت. یاخود بریتیە لەهەوڵی کۆنترۆڵکردنی هەموو ئەو فـاکتەرە بنچینەییانەی کە کاریگەرییان لەگۆڕاو یان گۆڕاوە پاشــکۆکانی ئەزموونەکە هەیە جگە لەیەك فـاکتەر کە توێژەر هەژمووني بەســەردا دەکـاتو؛ بەو جۆرەی کەخۆی ئەیەوێت دەیگۆڕێت؛ ئەویش بەمەبەسـتی پێوانە کردنی ئەو کاریگەرییەی کە بەسەر گۆڕاوە پاشکۆکەدا دێت.

لەم میتۆدەدا پێویستە توێژەر:

1. کێشەی توێژینەوەکەی دیاری بکات.

2. پلان بۆ ئەزموونەکەی دابڕێژێتو تیایدا تەواوی گۆڕاوەکان دیاری بکاتو دیزاینی ئەزموونەکەی تاقیبکاتەوە. دیزاینی ئەزموونیش بریتیە لەو نەخشەو پلانەی کە توێژەر لەئەزموونەکەدا جێبەجێی دەکات.

3. دوای کۆکردنەوەی هەموو مادەکان، ئەزموونەکە ئەنجام بدات.

4. ئەو ئەنجامە هەڵبسەنگێنێت کە ئەبێت بوونی هەبێت.

**جۆرەکانی دیزاینی ئەزموونگەری**

گەرچی هەموو توێژینەوە ئەزموونییەکان لەوەدا هاوبەشن، کە ئەزموون یان تاقیکردنەوەیان تێدا ئەنجام دەدرێت، بەڵام تاکە دیزاینێك نییە کە بۆ هەموو توێژینەوەیەکی ئەزموونی بگونجێتو دەستبدات. سروشتی هەر دیاردەیەكو ئامانجی توێژەرو؛ ژمارەی سامپڵو هەلومەرجی هەڵبژاردنی، بڕیار بەسەر جۆری ئەو دیزاینە دەدەن کە بۆ توێژینەوەکە گونجاوەو؛ ئامانجی توێژینەوەکە بەدیدەهێنێت. دیزاینەکان زۆرنو لێرەدا ئاماژە بەسێ جۆری سەرەکی دەکەین.

**یەکەم** جۆرەکانی دیزاین؛ بەپێی پلەکانی کۆنترۆڵکردنی ئەزموونەکە، بەمجۆرە پۆلێن دەکرێت:

1. ئەو دیزاینەی کە ئەزموونەکەی؛ کەمترین کۆنترۆڵی تێدایە. ئەمجۆرە بە (دیزاینی ئەو تاقە گروپەی کە تاقیکردنەوەی پێشوەختو کۆتایی هەیە) ناوزەد دەکرێت. ئاسانترینەو لانی کەمی کۆنترۆڵ لەخۆ دەگرێتو تیایدا تەنها گروپێك هەڵدەبژێرێتو تاقیکردنەوەکەی بەسەردا ئەنجام دەدرێت، بەم شێوەیە:

• بەرلەوەی گروپەکە؛ روبەڕووی گۆڕاوی سەربەخۆ بکرێتەوە، لەسەرەتاداو؛ بەمەبەستی دڵنیا بوون لەئاستی تاکەکانی، تێست دەکرێن و بەو تێستەش دەگوترێت: تاقیکردنەوەی پێشوەخت.
• پاشان تاکەکانی گروپەکە روبەڕوی گۆڕاوی سەربەخۆ دەکرێنەوە، واتا ئەو فاکتەرە ئەزموونیەی کە توێژەر بەنیازە رۆڵ و کاریگەرییەکەی بزانێت و دیاری بکات.
• لێرەدا جارێکیتر گروپەکە تێست دەکرێتەوە، بەم تێستەش دەگوترێت: تاقیکردنەوەی دوایی یان کۆتایی.
• دواجار لەڕێی پرۆسە ئامارییەکانەوە؛ جیاوازی لەنێوان هەردوو تاقیکردنەوەکەدا دەدۆزرێتەوە (تێستی یەکەم و دووەم) تاکو ئەو گۆڕانکارییە دەربکەوێت کە لای تاکەکانی گروپەکە؛ روویانداوە.

**دووەم:** ئەو دیزاینانەی کە ئەزموونەکەیان تا ئەندازەیەك کۆنترۆڵکراوە. لەزۆربەی ئەزموونەکاندا؛ زەحمەتە توێژەر بتوانێت هەموو فاکتەرەکان کۆنترۆڵ بکات و تەنها بەشێکیانی پێ کۆنترۆڵ دەکرێت. لەنموونەی ئەمجۆرەش:

1. دیزاینی گروپی کۆنترۆڵکراو (المجموعة الظابطة)ی ناهەڕەمەکی؛ لەگەڵ گروپی ئەزموونیدا (المجموعة التجريبية)، تاقیکردنەوەی پێشوەخت و کۆتاییان بۆ ئەنجام دەدرێت.
2. دیزاینی یەك گروپ کە بەدوای یەکدا هەردوو تاقیکردنەوەی پێشوەخت و کۆتاییان بۆ ئەنجام دەدرێت.
3. ئەو دیزاینەی کە گروپەکان جێگۆڕکێیان پێدەکرێت، بۆ نموونە: سەرەتا گروپی (A) دەکرێت بەگروپی ئەزموونی و (B)یش بەکۆنترۆڵکراو. دواتر پێچەوانەوە دەکرێتەوەو، ئەمجارە گروپی (B) دەکرێت بەئەزموونی و (A) ئەکرێتە گروپی کۆنترۆڵکراو.

**ســـێیەم**: ئەو دیزاینەی كۆنترۆڵكردنەكەی توندوتۆڵو پتەوە: ئەزموون لەم لەم جۆرەدا؛ هاوشـێوەی زانسـتە سروشـتیەكانەو؛ هەلومەرجی ئەزموونەكە بەتەواوەتی كـۆنـترۆڵ دەكـرێـتو، جەوهەری ئەمـجـۆرە بـوونی گـروپی كۆنترۆڵكراوە، ئەمەش نموونەكانیەتی:

1. ئەو دیزاینەی كە گروپێـك بەهەڕەمەكی هەڵبژێردراوەو تـاقیكردنەوەی پێشوەختو كۆتایی بۆ دەكرێت.
2. دیزاینی چوار گروپی هەڕەمەكی.
3. ئەو دیزاینەی كە گروپی كۆنترۆڵكراو؛ بەهەڕەمەكی هەڵبژێردراوە، هاوشانی گروپی ئەزموونی تاقیكردنەوەی كۆتاییان بۆ ئەنجام دەدرێت.

لەتوێژینەوەی زانستیدا بەگشتیو لەمیتۆدی ئەزموونگەریدا بەتایبەتی، گۆڕاو ئەوچەمكەیە زۆرترین مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێتو ناوی دێت، كەواتە گۆڕاو چییە؟

**گۆڕاو** (المتغیر Variable)

گۆڕاو بریتیە لەو شـــتانەی تێبینی دەكرێنو لێیان دەكۆڵرێتەوە وەك: زیرەكی، تەمەن، درێژی، پەیوەندی هاوڕێیەتیو ...هتد. هەروەها مەبەســـت لەگۆڕاو ئەو خەسڵەتانەیە كە گۆڕانكارییان بەسـەردا دێتو چەسپاو نین. بۆ نموونە: گۆڕاوی زیرەكی، بەپێی تاكەكەسەكان دەگۆڕێت، یان تەمەنو باری ئابووریو هتد. واتا هەموو گۆڕاوێك چەند ئاستێكی هەیە كە لەدوو ئاست كەمتر نییە. خۆ ئەگەر شـــتێك تەنها یەك ئاســـتی هەبێت ئەوا پێی ناوترێت گۆڕاوو؛ بەچەسپاو یان جێگیر هەژمار دەكرێت.

**پۆلێنی گۆڕاوەكان**

**یەكەم**: پۆلێنی گۆڕاوەكان بەپێی سەرچاوە:

1. **گۆڕاوی رەفتـاریی**: واتـا هەموو رەفتـارێكی تێبینیكراو وەك تونـدوتیژی، بەزەیی، هاوكاری..هتد.

2.**گۆڕاوە وروژێنەرێی:** واتا ئەو رەفتارەی دەرئەنجامی وروژێنەرە ژینگەییە جیاوازەکانە، بۆیە هەر شـــتێك لەژینگە یان دەوروبەردا هەبێت، ئەکرێت بەگۆڕاوی وروژێنەرێی ناوزەد بکرێت وەك خانوبەرە، کەشـــوهەوا، ئامێرە کارەباییەکان، پێکەنین‌و تورەبوون‌و...هتد.

3.**گۆڕاوی ئەندامیی:** واتا خەسـڵەتی ئەندامی شـتەکان وەك کێش‌و درێژی‌و رەنگی پێست‌و چاوو... هتد.

**دووەم:** پۆلێنی گۆڕاوەکان بەپێی بەهاکانیان:

**1.گۆڕاوی بەردەوام یان لکاو:** دەکرێت بیچوێنین بەخاڵی بەدوای یەکدا هاتووی بێپایان لەبەها؛ لەنێوان هەر یەکەیەك‌و، ئەو یەکەیەش کە بەدوایدا دێـت؛ ئەویش هەر بێپـایـان بەهـای بەدوادا دێـت‌و؛ پێوەی لکـاوەو لێی جیانابێتەوە. وەك کێش، تەمەن، زیرەکی، کات‌و...هتد.

2.**گۆڕاوی پچڕپچڕ:** بریتیە لەو گۆڕاوانەی کە بەهـایەکی دیـاریکراویـان هەیەو؛ لەسـەر پێوەرەکە خاڵی جیاجیان‌و بەیەکەوە نەنوسـاون. وەك رەگەز (نێرو مێ)، ژمارەی خوێندکاری پۆلی خوێندن‌و، سیستمی خوێندن‌و...هتد کە (بەش)یان نییە. بۆ نموونە ناوترێت (3.5) منداڵ یان (12.07)مامۆســتا، بەڵکو تەنها دەوترێت سێ منداڵ یان سیانزە مامۆستا.

بەڵام لەگۆڕاوی بەردەوامـدا هەوڵ دەدەین نزیکترین بەهـا بەگۆڕاوەکە بدەین‌و لەزۆربەی حاڵەتەکاندا بەهای گۆڕاوی بەردەوام بەمەودایەك دیاری دەکەین کە لەنێوان (0.5-) و (0.5+)دایە؛ بۆ بچوکترین یەکەی پێوانە. بۆ نموونە: ئەو کەســەی لەتاقیکردنەوەی زیرەکیدا (100)نمرەی هێناوە، نمرە راستەقینەکەی لەنێوان(99.5) و (100.5)دایە.

**سێیەم:** پۆلێنی گۆڕاوەکان بەپێی پەیوەندی هۆکاریان بەگۆڕاویترەوە:

**1.گۆڕاوی سەربەخۆ:** بریتیە لەو گۆڕاوەی کە گۆڕانکارییەك؛ لەگۆڕاوێکیتردا دێنێتە ئاراوەو کاری تێدەکات. وەك کاریگەری فیلمی توندوتیژی لەســەر

رەفتاری شــەڕانگێزی منداڵ، فیلمی توندوتیژیی گۆڕاوی ســەربەخۆیەو ئەوە کە گۆڕانکاری لەڕەفتاری منداڵدا هێناوەتە ئاراوە.

**2.گۆڕاوی پاشــکۆ:** ئەو گۆڕاوەیە بەرکارەو گۆڕانکاری بەســەر هاتووە. لەنموونەکەی پێشــوودا: کاریگەری فیلمی توندوتیژیی لەســەر رەفتاری شەڕانگێزی منداڵ، رەفتاری شەڕانگێزی منداڵ گۆڕاوی پاشکۆیەو؛ بۆ فیلمی توندوتیژی کە گۆڕاوی سەربەخۆیە؛ چونکە بەرکارەو کاریتێکردووە.

**3.گۆڕاوی تێهاتوو یان دەرەکی:** هەموو ئەو گۆڕاوانەیە کە هەوڵدەدرێت رۆڵو کاریگەرییان نەهێڵرێتو دوور بخرێنەوە، بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانکارییەی کە روودەدات تەنهاو تەنها پەیوەندی بەگۆڕاوی ســەربەخۆوە هەبێت. لەنموونەکەی پێشــوودا: کاریگەری فیلمی توندوتیژیی لەســەر رەفتاری شــەڕانگێزی منداڵ، ئەو رەفتارە شــەڕانگێزییەی لای منداڵەکە دەردەکەوێت ئەشــێت بەتەنها بۆ فیلمی توندوتیژی نەگەڕێتەوە، لەوانەیە پەیوەندی بەگۆڕاوە لابەلاکانی (رەگەزو تەمەنو شــوێنی نیشــتەجێبوون...هتد)وە هەبێت. بۆیە لەئەزموونەکاندا کاردەکرێت بۆ نەهێشــتنی کاریگەری؛ گۆڕاوە لابەلاو دەرەکییەکان.

**چوارەم:** پۆلێنی گۆڕاوەکان بەپێی ئاستەکانی پێوانە:

لێرەدا بەپێی ئاســتە جیاوازەکانی پێوانەو ژمارەکاریی؛ گوزارشــت لەگۆڕاوەکان دەکرێتو پێوانەش بۆخۆی چوار ئاستی هەیە:

**1.پێوانەی ناویی** (الاســمي Nomianl) هەندێکجار پێوانەی (پۆلێن)یشــی پێدەگوترێــت، لێرەدا ژمــارە تەنهــا هێمــایە بۆ پۆلێنکردنو هیچیتر. وەك گۆڕاوەکانی رەگەزو کۆلێجو رێگای وانەووتنەوە... لەگەڵ پێوانەی ناوییدا پرۆســەی ئاماریيو پرۆســە ژمێرەییەکانی کۆو کەمو لێکدانو دابەش(+ ، - ، × ، ÷) ئەنجام نادرێت. بۆ نموونە: کاتێك هێمای (1) بەنێرو هێمای (2)بە مێ

دەدرێت، لەهەر شوێنێکدا (1) هەبوو؛ ئەزانین ئەوە نێرەو؛ لەهەر شوێنێکدا (2) هەبوو، ئەزانین ئەوە مێیە.

**2.پێوانەی پلەدار** (الرتبي Ordinal) لێرە توێژەر دەتوانێت پلە بەگۆڕاوەکان بدات‌و هەڵکشاوو بەرەو ژوور؛ یاخود داکشاوو بەرەوخوار ریزبەندیان بکات. وەك ئاستەکانی قۆناغی خوێندن‌و پلەی زانستی‌و... هتد. لێرە ژمارەکان کە گوزارشت لەگۆڕاوەکان دەکەن؛ مانای گەورەترو بچوکتریان پێدەبەخشن، بەڵام بڕی جیاوازی نێوان پلەیەك‌و پلەکەی دوایەوە؛ دەرناخات. لەگەڵ پێوانەی پلەداریشدا پرۆسە ژمێرەییەکانی کۆو کەم‌و لێکدان‌و دابەش (+ ، ــ ، × ، ÷) ئەنجام نادرێت‌و تەنها لەسنورێکی بەرتەسکدا؛ پرۆسە ئامارییەکان بەکاردەهێنرێت. هەندێك جۆری هاوکۆلکەی پەیوەستبوون (سپێرمان) پشت بەریزبەندی پلەداری دەبەستێت.

**3.پێوانەی مەودایی، دەستە** (الفاصلی، الفئه Interval) لەم پێوانەیەدا ژمارە؛ خەسڵەتەکانی لەهێماکردن‌و پلەداری زیاترەو پەیوەستە بەیەکەی پێوانەوەو ئەوە دەگەیەنێت کە تاکەکان؛ بەرێژەی جیاواز خەسڵەتەکەیان تێدایە. بۆ نموونە: ئەگەر سێ کەس لەخەسڵەتێکدا ژمارەکانی (50، 55، 60)یان وەرگرت، واتا ئەو کەسەی (55)ی هێناوە، پلەکەی پێنج یەکە؛ لەو کەسە بەرزترە کە(50) ی هێناوەو؛ پێنج یەکەش لەو کەسە نزمترە کە (60) هێناوە. پێوانەیی واتا یەکسانی نێوان پێوانەکان، ئەگەر کۆمەڵێك ژمارەمان هەبوو لە سفرەو بۆ سەد، جیاوازی نێوان(100 و 99) وەك جیاوازی نێوان (سفرو 1)و نێوان (19 و 20)ە. ئەم ئاستە لەتوێژینەوە مەیدانییەکانداو؛ بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ خەسڵەتە مرۆڤایەتییەکاندا زۆر گرنگە. ئەتوانرێت لەگەڵ ژمارەکاندا هەموو پرۆسە ژمێرەییەکان جگە لەرێژە، ئەنجامبدرێت. ژمارەی سفر گریمانەیەو راستەقینە نییەو مانای نەمانی خەسڵەت ناگەیەنێت. کە دەگوترێت پلەی گەرما سفرە؛ ئەمە بەو مانایە نایەت کە گەرما بوونی نییە.

**4. پێوانەی رێژەیی (النسبي Ratio):** ئەم ئاستە بەدەگمەن لەتوێژینەوە مرۆڤایەتییەکاندا بەکاردەهێنرێت‌و تیایدا، ژمارە خەسڵەتەکانی هێمایی‌و پلەداری‌و نێوانی‌و رێژەیی هەیەو؛ لەگەڵ ژمارەکاندا هەموو پرۆسە ژمێرەییەکان بەرێژەشەوە، ئەنجام دەدرێت. ژمارەی سفر راستەقینەو مانای نەمانی خەسڵەتەکە دەگەیەنێت. کە دەگوترێت درێژی سفرە، واتا درێژی هیچ بوونێکی نییە.

## کۆمەڵگەی توێژینەوە

ئەم چەمکە لەڕووی ماناوە؛ ئەو کۆمەڵگەیە نییە کە لەکۆمەڵناسـیدا باسی لێوە دەکرێت؛ بەڵکو سـەرجەم ئەو تاکانە دەگرێتەوە کە لەخەسـڵەت یان سـیفەتێکی تێبینیکراودا؛ هـاوبەشـن و ڕەنگە لەچەنـد خەسـڵەتێکیتردا جیاوازبن و لەیەك نەچن.

لەزۆربەی حاڵەتەکاندا؛ ئاسـتەم و تەنانەت مەحاڵیشـە، ڕاسـتەوخۆ ڕوو بکرێتە کۆمەڵگەی توێژینەوەو داتـاو زانیـاریـان لێوەربگیرێـت و کۆبکرێتەوە. بەتایبەتی ئەگەر کۆمەڵگە؛ بەژمارە گەورەو لەسـنوری جوگرافیشـدا فراوان بێت. ئەوە بۆخۆی کارێکی دژوارەو هیچ زەرورەتێك لەو کارەدا نییەو؛ شـتێکی ئەوتۆش لەئەنجام ناگۆڕێت ئەگەر لەهەموویان؛ سامپڵێك وەربگیرێت. بۆیە باشـترو گونجاوترە سـامپڵێك لەو کۆمەڵگەیە وەربگیرێت و دواتر هەنگاوەکانی دیکەی توێژینەوەکەی، لەگەڵـدا بگیرێتەبەرو کارڕاییەکان ئەنجام بـدرێت، بەو ئومێدەی لەکۆتاییدا ئەو ئەنجامەی لەڕێی سامپڵەکەوە دەستکەوتووە، یاخود لانی کەم ئەوەی لەبەشـەکەوە پێی گەیشـتووین، بەسـەر تەواوی کۆمەڵگەکەدا گشـتاندنی بۆ بکرێت. پێویسـتە ئەو بەشـە یان ئەو سـامپڵەی وەردەگیرێت؛ خەسـڵەتی کۆمەڵگەی تێدا بێـت و؛ بەتەواوەتی نوێنەرایەتی کۆمەڵگەکەی خۆی بکات.

مەبەسـتی سـەرەکی لەهەڵبژاردنی سـامپڵ؛ بۆ دەسـتکەوتنی داتاو زانیارییە لەبارەی کۆمەڵگەوە. بۆیە دەکرێت بڵێین: سـامپڵایەتی ئەو پرۆسـەیەیە کە بەهۆیەوە ڕێمـان پێـدەدرێـت ژمـارەیەك ڕەگەز یـان ئەنـدام هەڵبژێرین، بەجۆرێـك ئەو ژمـارەیە بتوانێـت نوێنەرایەتی کۆمەڵگەکەی بکـات. کەواتە دەبێت بزانین کۆمەڵگە چییە؟

کۆمەڵگەی توێژینەوە سـەرجەم ئەو تاکانەن (مرۆڤ، دامەزراوە، بەرنامەی تەلەفزیۆنی، گۆڤار، شـمەك...تاد) کە لەخەسڵەتێکی تێبینیکراودا هاوبەشـن.

لەتوێژینەوەی زانســـتیدا؛ تـاکە پێوەرێـك بۆ کۆمەڵگەی توێژینەوە، بریتیە لەبوونی خەســـڵەتێکی هاوبەش لەنێوان تاکەکانیدا کە شـــایانی تێبینیکردن بێت.

**چەند نمونەیەك لەکۆمەڵگەی توێژینەوە:**

- ســـەرجەم خوێندکارانی زانکۆکانی هەرێمی کوردســـتان بۆ ســـاڵی خوێندنی 2015 -2016.
- تەواوی کەناڵە تەلەفزیۆنیە ئاسمانییە کوردییەکانی هەرێمی کوردستان.
- هەموو زینـدانییەکـانی نێو فەرمـانگەی چـاککردنی کۆمەڵایەتی پـارێزگـای هەولێر ساڵی 2015.
- ئەو خوێندکارانەی لە زانکۆی ســـلێمانیدا مادەی ئامار لەســـاڵی خوێندنی 2015 - 2016 دەخوێنن.
- ئەو گۆڤارانەی لەهەرێمی کوردســـتاندا لەســـاڵی 2015دا بەزمانی کوردی بڵاو دەکرێنەوە.
- تێکڕای مامۆستایانی زانکۆی گەرمیان لەساڵی خوێندنی 2015 - 2016.

بۆ دیاریکردنی خەســـڵەتەکانی کۆمەڵگە، پێویســـتە توێژەر وەســـفێکی گشـــتی کۆمەڵگەکەی بخاتەڕوو. لەلیســـتێکدا؛ تەواوی ئەو خەســـڵەتانە لەدیدگای توێژینەوەکەی خۆیەوە؛ نیشـــان بدات. بۆ نموونە: کە ووترا ســـەرجەم ئەو خوێندکارانەی زانکۆی سـلێمانی کە مادەی ئامار دەخوێنن بۆ سـاڵی خوێندنی 2015 - 2016. دەبێـت خەســـڵەتی ئەو خوێنـدکارانە بـاس بکرێن وەك: (تەمەن، ڕەگەز، شـوێنی نیشـتەجێبوون، باری کۆمەڵایەتی، نەتەوەی دایكو باوك، پیشەی باوكـو پیشەی دایك، ئاستی خوێندەواری دایكو باوك...هتد) بەپێی ئامانجی توێژینەوەکە؛ خەسڵەتە خراوەڕووەکان دەگۆڕێن.

## سامپڵی توێژینەوە

سامپڵ لەسادەترین پێناسەیدا بریتییە لەبەشێك لەو کۆمەڵگەیەی کە خەسڵەتێکی هاوبەشی تێدایەو نوێنەرایەتی کۆمەڵگەکەی دەکات. لێرە ئاماژە بۆچەند سامپڵێك دەکەین؛ کە پێشتر نموونەمان بۆ کۆمەڵگەکەیان هێنایەوە:

• ڕێژەی 15% خوێندکارانی زانکۆکانی هەرێمی کوردستان لەساڵی خوێندنی 2015- 2016 دا.

• کەناڵی ئاسمانی NRT وەك کەناڵێکی تەلەفزیۆنی ئاسمانی کوردی هەرێمی کوردستان.

• هەموو زیندانییەکانی نێو فەرمانگەی چاککردنی کۆمەلایەتی پارێزگای هەولێر ساڵی 2015 کە بەئەنجامدانی تاوانی کوشتن دادگا سزای داون.

• پەنجا لەو خوێندکارانەی زانکۆی سلێمانی کە مادەی ئامار کە ساڵی خوێندنی 2015 - 2016 دەخوێنن.

• گۆڤاری لڤین وەك یەکێك لەو گۆڤارانەی لەهەرێمی کوردستاندا لەساڵی 2015دا؛ بەزمانی کوردی بڵاو کراوەتەوە.

• تێکرای مامۆستایانی زانکۆی گەرمیان لەساڵی خوێندنی 2015 - 2016 کە تەمەنیان لەخوار چل‌و پێنج ساڵانەوەیە.

خەسڵەتەکانی سامپڵ لەچەند گۆڕاوێکدایە؛ گۆڕاو واتا هەر شتێك کە بەهای جیاواز وەربگرێت، بەپێچەوانەی جێگیرەو نەگۆڕەوە کە بەهایەکی چەسپاوی هەیە. گۆڕاوەکان وەك: درێژی، زیرەکی، باری خێزانی، باری ئابوری....تاد. لەلاپەرەکانی پێشووداو لەمیتۆدی ئەزموونگەریدا، بەوردی لەسەر چەمکی گۆڕاوو جۆرەکانی دەدوێین. بەچەندین ڕێگا دەتوانرێت سامپڵ لەکۆمەڵگەوە وەربگیرێت، هەندێك لەو ڕێگایانە هەرەمەکین‌و هەندێکیتریش ناهەرەمەکی، دواتر بەوردی دەیخەینەڕوو.

## دیاریکردنی ژمارەی سامپڵ

ئەم هەنگاوە بریتیە لەدیاریکردنی ژمارەو ڕێژەی ســـامپڵ بەجۆرێکی ئەوتۆ کە نوێنەرایەتی کۆمەڵگەکەی بکات. ئەم هەنگاوەش پێویســـتی بەئامادەکردنی خشتەیەك هەیە کە ژمارەی تاکەکانی کۆمەڵگەو خەسڵەتەکانی لەخۆگرتبێت؛ تاکو بۆ دیاریکردنی ژمارەی تاکەکانی سامپڵ بەکاربهێنرێت.

یەکێك لەو کێشـــە گەورانەی ڕوبەڕوی توێژەرانی زانســـتە مرۆڤایەتیەکان دەبێتەوە؛ وەرگرتنی ســـامپڵە، ئەم کێشـــەیە لەزانســـتە سروشـــتیەکاندا بەو ئەنـدازەیە بوونی نییە، چونکە خـاڵی هـاوبەش لەکۆمەڵگەی توێژینەوەدا، زۆرەو لێکچوونەکان ئەوەنـدەن کە ڕێخۆشـــکەربن تـاکو ســـامپڵی وەرگیراو بەئاسانی نوێنەرایەتی کۆمەڵگەکەی خۆی بکات. بەڵام لەزانستی مرۆڤایەتیدا جیاوازی زۆر؛ لەنێوان تـاکەکانی کۆمەڵگەی توێژینەوەدا هەیە، بۆ نموونە ئەگەر توێژینەوە بۆ دانیشـــتوانی شـــارێکی یەك ملیۆن کەسی بکەین‌و رایان لەسەر کێشـەیەك وەربگرین ، ناکرێت بە تەنها کەسێك وەربگرین‌و پرسیاری لێ بکەین، چونکە ئەوەی ئەو کەســـە دەیڵێت تەنها راوبۆچوونی خۆیەتی‌و گوزارشـــت لەرای کەســـیتر ناکات، هەروەك ناشـــکرێت هەموو خەڵکی ئەو شـــارە وەربگرین، چونکە ژمارەی چین‌و توێژەکان کە دانیشـــتوانی شـــارەکە پێکـدەهێنن، زۆرن‌و هەریەکەش بۆچوونێکی هەیە. ئەمەش کـارێکی دژوارو سـەختەو بەتوێژەرێکی ئاسـایی ناکرێت‌و؛ زیاتر کاری تیم‌و دەزگا حکومییەکانە. لەدۆخێکی لەو جۆرەدا؛ وا پێویســـت دەکات ســـامپڵێك وەربگیرێت کە نوێنەرایەتی دانیشتوانی شارەکە بکات، بەجۆرێکی ئەوتۆ کە هەڵە لەوەرگرتنی سـامپڵەکەدا روونەدات؛ چونکە ڕاسـتەوخۆ کاریگەری لەسـەر ئەنجامەکانی توێژینەوەکە دەبێت‌و گشـتاندن بۆ ئەنجامەکەی ناکرێت. بۆ نموونە: کاتێك کۆمەڵگەی توێژینەوە هەرێمی کوردســـتـان بێـت. ئەوا ئەبێـت هەر سێ پارێزگاکەی هەرێم، بەســـەنتەری پارێزگاو شـــارو شـــارۆچکەو گوندەکانەوەو

لەهەموو ناوچەکاندا ســـامپڵەکە وەرگیرابێت‌و بەرێژەیەك تیایدا هەبێت. بۆ دیاریکردنی ئەو ژمارەو رێژەیەش دەبێت بۆ رێگا زانستییەکانی وەرگرتنی سامپڵ بگەرێینەوە.

بۆ دیاریکردنی برو جۆری ئەو ســامپڵەی کە توێژەر وەریدەگرێت، پێویســـتە چەند هەنگاوێك پەیرەو بکرێت:

1. دەستنیشـانکردنی ئامانجی توێژینەوە بەوردی‌و روونی‌و راشکاوی، چونکە لەرێی ئـامـانجەوە؛ ســـامپلا دیـاری دەکرێـت، هەروەك چۆن لەرێگەی ناونیشانی توێژینەوەوە ئامازەکانی سامپڵ بەدیار دەکەون.

2. دەبێت کۆمەڵگەی توێژینەوە لە ناونیشانی توێژینەوەکەدا بوونی هەبێت.

3. جۆری توێژینەوەکە، وەســـفییە، ئەزموونگەرییە...هتـد، بۆچوونەکـان تائەندازەیەك لەســـەرئەوە کۆکن کەجۆری توێژینەوەش رۆڵی لەدیاریکردنی ژمارەی خەمڵێنراوی ســامپڵەکەدا هەیە، هەروەك لەم هێڵکارییەدا ئامازە بۆ ژمارەی خەمڵێنراوی ئەندامانی ســـامپڵی توێژینەوە بەپێی میتۆدی توێژینەوە کراوە:

| میتۆد | ژمارەی خەمڵێنراوی ئەندامانی سامپڵی توێژینەوە |
|---|---|
| پەیوەستگەرایی الارتباطية | بەلای کەمەوە 30 ئەندام بێت |
| ئەزموونگەری | 15 بۆ گروپی ئەزموونی‌و 15 بۆ گروپی کۆنترۆلکراو |
| وەسفی | %30 لەوکۆمەڵگەیەی ژمارەکەی کەمتر بێت لە500 ئەندام. |
| | %20 بۆ کۆمەڵگەیەك سەدان ئەندام (100- 1000) |
| | %10 بۆ کۆمەڵگەی هەزاران ئەندام (1000- 10000) |
| | %5 بۆ کۆمەڵگەی دەیان هەزار ئەندام (10000 - 100000) |

بەگشتی لەرووی قەبارەو ژمارەوە؛ دوو جۆر سامپڵ هەیە کە بریتین لە:
أ.**سامپڵی گەورە:** ئەو سامپڵەیە کە ژمارەی ئەندامەکانی 30 کەس‌و زیاترە.
ب.**سامپڵی بچووك:** ژمارەی ئەندامەکانی لە 30 کەس کەمترە.
دەبێت بگوترێت: هیچ ڕێگایەکی نموونەیی لەوەرگرتنی ســـامپڵدا نییە کە بۆ هەموو توێژینەوەیەك لەبارو گونجاو بێت. باشـــترین ســـامپڵیش کە لەتوێژینەوەدا وەربگیرێت؛ پشـــت بەیەك ڕێگە نابەســـتێت، ئەوە ئامانجی توێژینەوەکەیە کە ڕێگای وەرگرتنی ســـامپڵ دیاری دەکات. لەتوێژینەوەیەدا مەرج نییە تەنها ڕێگەیەك پەیرەو بکرێت؛ دەکرێت زیاتر لەڕێگایەك بۆ وەرگرتنی سامپڵ، بگیرێتەبەر. شارەزایان پێیانوایە ئەوەندەی ڕێگای وەرگرتنی سامپڵ گرنگەو دەبێت بایەخی پێبدرێت، ئەوەندە ژمارەی ئەندامانی سامپڵ گرنگ نییە.

### کێ ژمارەی سامپڵ بۆ توێژەر دیاری دەکات؟

باشـــترین ڕێگا بۆ دیاریکردنی ژمارەی ســـامپڵی توێژینەوە، گەڕانەوەیە بۆ ئەو توێژینەوە زانســـتی‌و ئەکادیمییانەی کە پێشـــتر لەهەمان بوارو کۆمەڵگەدا یاخود لەبابەتی هاوشـــێوەدا ئەنجام دراون. لەتوێژینەوەکانی پێشـــووترە، ئەتوانرێت ســـنووری ئەندامانی ســـامپڵ بخەملێنرێت‌و دیاری بکرێت. هەروەها توێژەر دەتوانێت راوێژ بەچەند پســـپۆڕێك بکات کە لەپلەی زانســـتیدا لەخۆی باڵاترن‌و پێشـــتر لەســـەر هەمان بابەت‌و کۆمەڵگە؛ توێژینەوەیان ئەنجامداوە. باشـــتروایە توێژەر لەتوێژینەوەکەیدا ئاماژە بەوە بکات ســـەبارەت بەژمارەی ســـامپڵەکەی؛ پرسی بە چ پســـپۆڕێك کردووە، بەمەش ناوبانگ‌و پلەی زانستی پسپۆڕان، سیمایەکی زانستی بەو هەنگاوەی توێژەر دەبەخشن.

## جۆرەکانی سامپڵی توێژینەوە

بەشـــێوەیەکی گشـــتی دوو جۆر ســـامپڵ هەیە (هەرەمەکی یان ئەگەرایەتی المعـاینـة الاحتمـالیـة Probability Sample) لەگەڵ نـاهەرەمەکی یـان نائەگەرایەتی المعاینة اللااحتمالية Probability Sampl - Non) هەریەك لەو دوو جۆرەش؛ چەنـدین لقیـان لێـدەبێتەوە. توێژەر دەتوانێـت بەتەنهـا پشـــت بەیەك جۆر ڕێگای وەرگرتن نەبەســـتێـتو؛ هەموو ڕێگاکانی وەرگرتنی ســـامپڵدا لەبەردەمیدا واڵایە، دیارە لەمەشـــدا؛ئامانجی توێژینەوەکەی بڕیاردەرە.

### یەکەم: سامپڵی هەرەمەکی یان ئەگەرایەتی

دیارترین جۆری ئەم سامپڵەش ئەمانەیە:

1.ســـامپڵی هەرەمەکی ســـادە: العینة العشـــوائیة البســـیطة Simple random Sample.

2.سـامپڵی هەرەمەکی ڕێکخراو العینة العشـوائیة المنتظمة Sustematic sample.

3.ســـامپڵی هەرەمەکی چینایەتی العینة العشـــوائیة الطبقیة Stratifled random Sample.

4.ســـامپڵی هەرەمەکی فرە قۆناغ یان هێشـــوویی. العینه العشـــوائیه ذات المراحل المتعددة أو العنقودیة Multi-stage random sample

5.سامپڵی بازنەیی العینة الدائریة Rotated Sampiling.

### دووەم: سامپڵی ناهەرەمەکی یان نائەگەرایەتی

دیارترین جۆرەکانی ئەمانەن:

1.سامپڵی مەبەستدار العینة العمدیة Purposive sampling

2.سامپڵی پشکەکان عینة الحصص Quota sampling

## یەکەم: سامپڵی هەڕەمەکی یان ئەگەرایەتی

لەم رێگایە یان لەم جۆرەی ســـامپڵدا، کە هەڕەمەکیو ئەگەرایەتیە، دوور لەهەر لایەنگریو خواســـتێکی توێژەر، بەشـــێوەیەکی هەڕەمەکی ســـامپڵێك لەکۆمەڵگەی توێژینەوە وەردەگرێـتو ئەگەری ئەوەی تێدایە هەر تـاکێك لەکۆمەڵگەی توێژینەوە ببێتە ئەنـدام لەســـامپڵی وەرگیراودا. واتـا دەرفەتی یەکســـان بەســـەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگەی توێژینەوە دەدرێـتو؛ رەنگە لەپرۆسـەی وەرگرتنی سـامپڵدا هەر یەکێکیان ئەو چانسـەی هەبێت بێتەناو سامپڵەکەوە.

### 1: سامپڵی هەرەمەکی سادە:

لەم جـۆرەدا هەر ئەنـدامـێکی کـۆمەڵگەی تـوێـژینەوە، هەمـان دەرفەتی ئەندامەکانیتری دەبێت بۆ ئەوەی ببێتە ئەندام لەسامپڵی توێژینەوەدا.

بـۆ نـموونە: ئەگەر کـۆمەڵگەی تـوێـژینەوەکە؛ قـۆنـاغی چـوارەمی بەشی راگەیاندنی سـکوڵی زانســتە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سـلێمانی بێت بۆ سـاڵی خوێندنی (2015- 2016)و کە ژمارەیان (40) خوێندکارەو؛ بمانەوێت (10) کەس بەســامپڵ وەربگرینو؛ پێویســـت بێت ســامپڵەکە هەرەمەکی ســـادە بێت، نابێت گۆڕاوەکانی رەگەز (کچ، کوڕ)، پســـپۆڕی (تەلەفزیۆن، رۆژنامە، پەیوەندییە گشــتییەکان)، شــوێنی لەدایکبوون (شـــار، شـــارۆچکە، گوند)، شــوێنی نیشــتەجێبوون (ناوشـــار، دەرەوەی شـــار)، باری خێزانی (ســـەڵت، خێزانــدار، جیـابووەوە)، تەمەن، زیرەکیو نمرەو...هتـد هەژمـار نەکرێن . ئەمەش بەچەند رێگایەك دەکرێت:

• ناوی خوێندکارەکان لەســـەر پەڕەی بچووك بنوسرێتو بنوشـــتێنرێتەوەو بخرێتە نێو کـارتۆن یـان تورەکەیەکەوەو بەبـاشی تێکەڵا بکرێـت. ئینجـا کەسێك دەست بەناو کارتۆنەکەدا بکاتو یەك پەڕەی نوشتاوە دەربهێنێت، واتا ناوی یەکەم خوێندکار کە دەبێتە ئەندامی ســـامپڵ، ئینجا پەڕەکە وەکو

خۆی بنوشتێنێتەوەو بیخاتەوە ناو کارتۆنەکەو سەرلەنوێ تێکەڵی بکاتەوەو؛ دانەیەکیتر دەربهێنێت، ئەمیش ئەبێتە دووەم خوێندکاری سامپڵەکە. پێویستە ئەو ناوەی کە بوو بەئەندامی سامپڵ، سەرلەنوێ بخرێتەوە ناو کارتۆنەکە، تا ئەگەرەکان لەسەدسەد وەکو یەکبن، خۆئەگەر ناوێك جارێکیتر بەدەستەوە هات، ئەوا هەژمار ناکرێت و دەخرێتەوە ناو کارتۆنەکە. بەمجۆرە تا ناوی (10) خوێندکارەکە دەردەهێنرێت. لێرەدا کەس نازانێت پێش پرۆسەی راکێشانەکە، ناوی چ خوێندکارێك دەردەهێنرێت.

• رێگایەکیتر تیروپشکەو تیایدا هەر (40) خوێندکارەکە ژمارەیان بۆ دادەنرێت و لەسەر تۆپێك ژمارەکەیان دەنوسرێت و لەدەزگایەکی تایبەتدا ئەخولێنرێتەوە تاکو (10) تۆپ دێتە دەرەوەو پاشان بەسامپڵ، وەردەگرێت. ئەکرێت بۆ وەرگرتنی ئەو سامپڵە پەنا ببرێتەبەر خشتە هەڕەمەکییەکانی ژمارە (جداول الإعداد العشوائية) کە (فیشەر وییتس و کیندال) ئامادەیان کردووەو لەزۆربەی کتێب و سەرچاوە ئامارییەکاندا بەوردی باسی لێوەکراوەو لێرەدا ئەو بوارە نییە تا لەسەر خشتە هەڕەمەکییەکانی ژمارە لەوەرگرتنی سامپڵی هەڕەمەکی سادەدا؛ بدوێین.

لەسامپڵی هەرەمەکی سادەدا ئەگەر هەیە بەرێکەوت ئەو (10) کەسەکە، هەموویان کچ یان کوڕ بن، یاخود زۆربەی زۆریان یەك پسپۆڕییان هەبێت یان ئەوانەبن کە دانیشتووی دەرەوەی شارن. بەمەش سامپڵەکە؛ نوێنەرایەتی کۆمەڵگەی توێژینەوەکەی ناکات و کێشەی گشتاندن سەر هەڵدەدات.

**2: سامپڵی هەرەمەکی رێکخراو (سیستماتیك):**

ئەم رێگایە بۆ ئەو کۆمەڵگەی توێژینەوانە گونجاوە کە ژمارەیان زانراوو دیاریکراوە. ئەگەر نموونەکەی پێشوومان هەبێت و بمانەوێت بەم رێگایە

سـامپڵ وەربگرین لەو (40) خوێندکارە، (10) کەس وەربگرین، ، پێویسـتە ئەم هەنگاوانە بگرینەبەر:
1. سـەرەتا بەبێ ئەوەی هیچ کام لەگۆڕاوەکان بەهەند وەربگیرێن، ژمارە بە (40) خوێنـدکارەکە دەدەین، لەژمـارە (1)وە تـا ژمـارە (40) ریزبەنـدیـان دەکەین.
2. ژمارەی کۆمەڵگە دابەشی ژمارەی سـامپڵ دەکەین: 40 / 10= 4 ئەم ژمارە چوارە، بنەمای رێکخستنی هەنگاوەکانە.
3. پاشـان بەهەڕەمەکی ژمارەیەك وەردەگرین کە بکەوێتە نێوان(1)و (9)وە. گریمان ژمارە (3) بەدەستەوە هات.
4. لە یەکەم هەنگاودا ئەو خوێندکارە وەردەگرین کە ژمارەکە (3)، پاشـان چوار ژمارە زیاد ئەکەینو خوێنکاری ژمارە (7) وەردەگرین، بەمجۆرە هەموو خوێندکارەکانیتر وەردەگرین. (3، 7، 11، 15، 19، 23، 27، 31، 35، 39) هەروەك لەم نمونەیەدا روونکراوەتەوە.

مۆدێلێك لەشێوازی وەرگرتنی سامپڵی هەڕەمەکی رێکخراو

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 2 | **3** | 4 | 5 | 6 | **7** | 8 | 9 | 10 |
| **11** | 12 | 13 | 14 | **15** | 16 | 17 | 18 | **19** | 20 |
| 21 | 22 | **23** | 24 | 25 | 26 | **27** | 28 | 29 | 30 |
| **31** | 32 | 33 | 34 | **35** | 36 | 37 | 38 | **39** | 40 |

بۆیە بەم رێگایەش دەگوترێت هەڕەمەکی رێکخراو، هەروەك لەنموونەکەدا دەرکەوت هەنگاوی یەکەم هەڕەمەکی بوو، کە خوێنکاری ژمارە (3) وەرگیرا، پاشان ئەوانیتر بەرێکخراوی وەرگیرانو چوار چوار رۆشتین.

### 3: سامپلی هەرەمەکی چینایەتی:

ئاشکرایە کۆمەڵگەی توێژینەوە لەزانستە مرۆڤایەتییەکاندا، چوونیەك نییەو بەسەر چەندین گۆڕاودا دابەش بووەو هەر یەکێکیش لەو گۆڕاوانە بە چین؛ هەژمار دەکرێتو، ووشەی چینایەتییەکە لەوەوە هاتووە.

بۆئەوەی شێوازی وەرگرتنی ئەم سامپلە باشتر روون ببێتەوە، ئەم نموونەیە دەهێنینەوە. گریمان توێژەرێك خوازیار بووە توێژینەوەك لەکۆمەڵگەی مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەدین بۆ ساڵی خوێندنی (2014 - 2015) ئەنجام بدات. ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵگەکەی بەپێی هەروو گۆڕاوی پسپۆڕیو باری خێزانی (1654) مامۆستا بووە. هەروەك لەم خشتەیەدا خراوەتەڕوو. کراوە.

خشتەی (1)

کۆمەڵگەی توێژینەوە بەپێی هەردوو گۆڕاوی پسپۆڕیو باری خێزانی

| کۆلێج | مامۆستای پیاوی خێزاندار | مامۆستای ژنی خێزاندار | کۆ |
|---|---|---|---|
| ئاداب | 165 | 53 | 218 |
| ئەندازیاری | 90 | 17 | 107 |
| پەروەردەی بنەڕەتی | 61 | 45 | 106 |
| پەروەردەی وەرزشی | 52 | 10 | 62 |
| کارگێڕیو ئابووری | 101 | 43 | 144 |
| زانست | 165 | 73 | 238 |
| شەریعە | 47 | 9 | 56 |
| زمان | 86 | 44 | 130 |
| کشتوکاڵ | 123 | 72 | 195 |
| یاساو رامیاری | 86 | 24 | 110 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| پەروەردە | 144 | 88 | 232 |
| هونەرە جوانەكان | 44 | 12 | 56 |
| كۆ | 1164 | 490 | 1654 |

ئەگەر توێژەر ســـامپڵى بەرێگاى هەرەمەكى چينايەتىو بەرێژەى (10%)ى كۆمەڵگەكەىو؛ بەپێى هەردوو گۆڕاوى پســـپۆڕىو بارى خێزانى وەرگرتبێت ئەوا (165.4)مامۆســـتا بووە. ديارە هەموو كەرتەكان بۆ ژمارەى تەواو نزيك دەكرێنەوە. ئەگەر نيو (0.5)و زياتر بوو دەكرێت بە(1)و ئەگەر كەمتريش بوو؛ ئەكرێـت بەســـفر. بۆ نموونە (16.5) دەكرێـت بە(17)و (5.3)ش ئەكرێت بە (5) هەروەك لەخشتەى ژمارە (2)دا خراوەتەڕوو.

خشتەى (2)

سامپڵى توێژينەوە بەپێى هەردوو گۆڕاوى پسپۆڕىو بارى خێزانى

| كۆلێج | مامۆستاى پياوى خێزاندار | مامۆستاى ژنى خێزاندار | كۆ |
|---|---|---|---|
| ئاداب | 16.5 | 5.3 | 21.8 |
| ئەندازيارى | 9.0 | 1.7 | 10.7 |
| پەروەردەى بنەڕەتى | 6.1 | 4.5 | 10.6 |
| پەروەردەى وەرزشى | 5.2 | 1.0 | 6.2 |
| كارگێڕىو ئابوورى | 10.1 | 4.3 | 14.4 |
| زانست | 16.5 | 7.3 | 23.8 |
| شەريعە | 4.7 | 0.9 | 5.6 |
| زمان | 8.6 | 4.4 | 13.0 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| کشتوکاڵ | 12.3 | 7.2 | 19.5 |
| یاساو رامیاری | 8.6 | 2.4 | 11.0 |
| پەروەردە | 14.4 | 8.8 | 23.2 |
| هونەرە جوانەکان | 4.4 | 1.2 | 5.6 |
| کۆ | 116.4 | 49.0 | 165.4 |

### 4: سامپڵی هەرەمەکی فرەقۆناغ یان هێشویی:

ئەم رێگایە زیاتر بۆ ئەو کۆمەڵگەیە شـــیاوە کە فراوانەو ژمارەی ئەندامەکانی زۆرە. چونکە ئاســـانترەو تێچوونی کەمترەو کاتو ماندوونی زۆری ناوێت بەبەراورد بە سێ جۆرەکەی پێشووتر.

ئەگەر بمانەوێت توێژینەوەیەك لەســـەر کێشـــەی قوتابیانی قۆناغی (4) بنەڕەتی لەمادەی بیرکاریدا، لەشــاری ســلێمانیدا ئەنجام بدەین، لەبەر زۆری قوتابییەکان لەناو شاردا، باشتروایە بگەڕێینەوە بۆ دابەشکردنی شار بەسەر چەند یەکەیەکی کارگێڕیدا. لەم رووەوە چەند جۆرێك لەدابەشـــکردن هەیە. لەیەکێکیاندا شاری سلێمانی بەسەر (12) مەڵبەندا دابەشکراوە، توێژەر بە هەرەمەکی ســادە، یەکێك لەو مەڵبەندانە هەڵدەبژێرێت، گریمان مەڵبەندی یەکەو ئەو مەڵبەندەش کە ژمارەیەك گەڕەکی شـــار لەخۆ دەگرێت، نزیکەی (26) خوێنـدنگەی بنەڕەتی ئەکەوێتە ئەو نـاوچە جوگرافییەوە کە قۆنـاغی چواریان تێدایە. بەهەرەمەکی یەکێك لەو خوێندنگانە وەردەگرێت، گریمان ئەو خوێندنگەیەی کە وەرگیراوە؛ ناوی قوتابخانەی (ئیراهیم ئەمین باڵدار)ەو سێ هۆبەی لەپۆلی چوارەکـان هەیە، لەنـاو ئەو سێ هۆبەیەدا، یەکێکیـان وەرئەگرێت واماندا هۆبەی (ب)یە؛ ئیدی هەموو قوتابییەکانی ئەو هۆبەیە، ئەبنە ســـامپڵی توێژینەوەکەیو دواتر توێژەر لەڕێی ئامرازەکانی توێژینەوەوە، زانیـاریو داتـاکان کۆ دەکـاتەوە. لێرەدا توێژەر ئەتوانێـت بەســـەر تەواوی

قوتابخانە بنەڕەتییەکانی شـــاری ســـلێمانیدا کە قۆناغی چواریان هەیە، گشتاندن بۆ ئەنجامی توێژینەوەکەی بکات، لەبەرئەوەی هەموو قۆناغەکانی وەرگرتنی سامپڵی بەشێوەی هەڕەمەکی ئەنجامداوەو؛ ئەگەری ئەوە هەبووە کە مەڵبەندێکیترو؛ گەڕەکێکیترو؛ قۆتابخانەیەکیترو قوتابییەکانی هۆبەیەکیتر؛ لەشـــاری ســـلێمانیدا، ببونایە بەئەندامانی ســـامپڵی توێژینەوەکەی.

### 5: سامپڵی هەڕەمەکی بازنەیی

ئەم شـــێوازەی وەرگرتنی ســـامپڵ زیاتر لەتوێژینەوەکانی بواری ڕاگەیاندندا پەیڕەو دەکرێـتو تـاڕادەیەکی زۆریش پەیوەســـتە بەمیتۆدی شـــیکاری ناوەڕۆکەوە. کاتێك توێژەر بیەوێت بەشـــێوازێکی زانســـتی ڕۆژنامەو گۆڤارو بەرنامەی ڕادیۆیی‌و تەلەفزیۆنی شیکار بکات، پەنا دەباتەبەر ماوەی دەستکرد (فترة صـــناعية Artlficial Period) واتا ڕۆژ، هەفتە، مانگ، وەرزو ســـاڵی دەستکرد؛ بۆ ناوەڕۆکی بابەتە شیکارکراوەکەی؛ درووست دەکات. ئەمەش بۆ ئەوەیە تاکو ســـامپڵێك وەربگیرێت، کە نوێنەرایەتی تەواوی ئەو ماوانە بکات کە لەکۆمەڵگەی توێژینەوەدا؛ دیاریکراون. لێرەدا نموونەو مۆدێل بۆ هەر یەك لە ڕۆژو؛ هەفتەو؛ مانگو؛ وەرزو ساڵی دەستکرد دەخەینەڕوو .

**ڕۆژی دەســـتکرد:** ئەگەر توێژەرێـك بیەوێـت شـــیکاری بەرنـامەکانی ئیســـتگەیەکی ڕادیۆیی لەماوەی شـــەش ڕۆژدا؛ بکات (ئەم شـــەش ڕۆژە کۆمەڵگەی توێژینەوەکەیە) کە ڕۆژانە شەش کاتژمێر پەخشـی ڕاستەوخۆی هەیە. ئەگەر بیەوێت ڕۆژێکی دەســـتکرد بۆ پەخشـــەکە درووســـت بکات پێویســـتی بەشـــەش ڕۆژی پەخشـــی ڕادیۆکە هەیە تا لەهەر ڕۆژێکدا یەك کاتژمێری پەخشـــەکەی وەربگرێت. ناکرێت هەموو کاتژمێرەکانی یەك ڕۆژ وەربگرێت، نەوەك ئەو ڕۆژە، بەڕێکەوت پەخشی_ ڕادیۆکە نائاسـایی بێت‌و؛ بەرنامەکانی تایبەت بووبن بەڕووداوێکی دیاریکراوەوە. لەبەر ئەمەیە، لەهەر

رۆژێکدا یەك کاتژمێر بەســـامپڵ وەردەگرێت. ئەگەر لەرۆژی یەکەمـدا؛ بەهەڕەمەکی ســـادە، کاتژمێری دووەمی پەخشـــەکە وەرگیرا؛ ئەبێت رۆژی دووەم، کاتژمێرێکیتر وەربگرێت؛ بەم شێوەیە تا شەش کاتژمێرە دەستکردەکە پڕ دەکاتەوە. لەم مۆدێلەدا، روونتر کراوەتەوە.

مۆدێلێك لەسامپڵی هەڕەمەکی بازنەیی بۆ رۆژی دەستکرد

| رۆژەکانی پەخش | کاتژمێرەکانی پەخش | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 |
| شەممە | | × | | | | |
| یەکشەممە | | | × | | | |
| دووشەممە | | | | × | | |
| سێشەممە | | | | | × | |
| چوارشەممە | | | | | | × |
| پێنجشەممە | × | | | | | |

**هەفتەی دەســـــتکرد:** ئەگەر توێژەرێك بیەوێت شـــیکار بۆ لاپەڕەکانی رۆژنـامەیەکی رۆژانە بکـات کە مـاوەی کۆمەڵگەی توێژینەوەکەی حەوت هەفتە بێت، ناکرێت هەفتەیەك لەو ماوەیە بەسامپڵ وەربگرێت‌و گشتاندنی بۆ بکات. چونکە ئەگەری ئەوەی هەیە؛ ئەو هەفتەیە گوزارشـــت لەرەوتی ئاســـایی رۆژنامەکە نەکات، ناشـــکرێت هەر حەوت هەفتەکە وەربگرێت، ئەمەش بۆخۆی کات‌و ماندوونی زۆری ئەوێت، بۆیە باشـــتروایە هەفتەیەکی دەســـتکرد دروســـت بکات، کە گوزارشـــت لەتەواوی رۆژەکانی هەفتەکانیتر بکات. گریمان لەهەفتەی یەکەمدا بەهەڕەمەکی رۆژی هەینی بەســـامپڵ،

وەرگیرا، ئەبێت هەفتەی دووەم ڕۆژێکیتر وەربگرێت بۆئەوەی هەمان ڕۆژ دووجار شـــیکاری بۆ نەکرێت. لەم مۆدێلەدا شـــێوازی وەرگرتنی ڕۆژەکانی هەفتە دەستکردەکە، ڕوونتر دەکەینەوە.

مۆدێلێك لەسامپڵی هەڕەمەکی بازنەیی بۆ هەفتەی دەستکرد

| هەفتە | ڕۆژەکانی هەفتە | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | شەممە | یەکشەممە | دووشەممە | سێشەممە | چوارشەممە | پێنجشەممە | هەینی |
| یەکەم | | | | | | | × |
| دووەم | | | | | | × | |
| سێیەم | | | | | × | | |
| چوارەم | | | | × | | | |
| پێنجەم | | | × | | | | |
| شەشەم | | × | | | | | |
| حەوتەم | × | | | | | | |

**مانگی دەســتکرد:** ئەگەر توێژەرێك بیەوێت شیکار بۆ لاپەڕەکانی چوارمانگی گۆڤارێك بکات کە هەفتەی ژمارەیەکی لێدەردەچێت، واتا شـــانزە ژمارەی گۆڤارەکە شـــیکار بکات، لێرەدا ناکرێت مانگێك وەربگرێتو هەر چوار ژمارەکەی شـــیکار بکات، چونکە ئەگەری ئەوەی هەیە کە ئەو مانگە گوزارشت لەرەوتی ئاسایی بابەتەکانی گۆڤارەکە نەکات. ناشکرێت سەرجەم ژمارەکانی ئەو چوار مانگە وەربگرێت کە دەکاتە شـــانزە ژمارە؛ ئەمەش

بۆخۆی کاتو ماندوونی زۆری ئەوێتو هیچ لەئەنجامی شـــیکارکردنەکەش ناگۆڕێت. بۆیە باشـــتروایە لەو چوار مانگەی کۆمەڵگەی توێژینەوەکە، هەر مـانـگەو یەك هەفـتە وەربـگـرێـت کە ژمـارەیەك لەگـۆڤـارەکەی تـێـدا بڵاوکراوەتەوە. ئەگەر لەمانگی یەکەمدا بەهەڕەمەکی سادە، هەفتەی سێیەم وەرگیرا، ئەبێت بۆ مانگەکانیتر ئەو هەفتەیە بەســـامپڵ وەرنەگرێت، بەڵکو یەکێك لەهەفتەکانیتر وەربگرێت، لەم مۆدێلەدا شێوازی دروستکردنی مانگی دەستکرد، روونتر دەکەینەوە.

مۆدێلێك لەسامپڵی هەڕەمەکی بازنەیی بۆ مانگی دەستکرد

| مانگەکان | هەفتەکانی مانگ | | | |
|---|---|---|---|---|
| | یەکەم | دووەم | سێیەم | چوارەم |
| کانونی دووەم | | | × | |
| شوبات | | | | × |
| ئازار | | × | | |
| نیسان | × | | | |

**وەرزی دەســـتکرد:** ئەگەر واماندا، توێژەرێك ئەیەوێت، توێژینەوە لەســەر ژمـارەکانی وەرزێکی گۆڤـارێك بکات کە مـانگی یەك ژمـارەی لێدەردەچێت، پێویســـت نـاکات تەواوی ژمـارەکانی یەکێك لەچوار وەرزەکەی ســـاڵ وەربگرێت، بەڵکو باشـــتروایە، چوار ژمـارە لەگۆڤارەکە وەربگرێتو هەر ژمـارەیەکیشـــیان تـایبەت بێـت بەمـانگێکی وەرزێکەوە. لێرەدا بەهۆی ئەم مۆدێلەوە، شێوازی دروستکردنی وەرزی دەستکرد، روون دەکەینەوە:

مۆدێلێك لەسامپڵی هەڕەمەکی بازنەیی بۆ وەرزی دەستکرد

| وەرزەکانی ساڵ | مانگەکانی وەرز | | |
|---|---|---|---|
| | یەکەم | دووەم | سێیەم |
| بەهار | × | | |
| هاوین | | | × |
| پاییز | | × | |
| زستان | × | | |

**ساڵی دەستکرد:** ساڵی دەستکردیش، بەهەمان شێوازی دروستکردنی (ڕۆژو هەفتەو مانگو وەرز)ی دەستکردەو لێرە مۆدێلێك لەچۆنێتی ڕێکخستنی ساڵی دەستکرد دەخەینەڕوو:

مۆدێلێك لەسامپڵی هەڕەمەکی بازنەیی بۆ ساڵی دەستکرد

| ساڵەکان | مانگەکانی ساڵ | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 |
| 2015 | × | | | | | | | | | | | |
| 2014 | | × | | | | | | | | | | |
| 2013 | | | × | | | | | | | | | |
| 2012 | | | | × | | | | | | | | |
| 2011 | | | | | × | | | | | | | |
| 2010 | | | | | | × | | | | | | |
| 2009 | | | | | | | × | | | | | |
| 2008 | | | | | | | | × | | | | |
| 2007 | | | | | | | | | × | | | |
| 2006 | | | | | | | | | | × | | |
| 2005 | | | | | | | | | | | × | |
| 2004 | | | | | | | | | | | | × |

ئەگەر بڕوانینە مۆدێلەکەی پێشـوو، ئەبینین توێژەر لەکۆمەڵگەی توێژینەوە کە دوانزە ساڵە، لەو ماوەیە ساڵێکی دەستکردی دروستکردووە بەبێ ئەوەی هیچ مانگێك دووبارە بوویێتەوە، نەشـــهاتووە یەکێك لەو دوانزە ســـاڵە وەربگرێت، چونکە ئاشـــکرایە کە هەر ســـاڵەو تایبەتمەندی خۆی هەیەو لەساڵەکانیتر ناچێت. وەرگرتنی تەواوی مانگەکانی هەر دوانزە ساڵەکەش کە دەکاتە (144) مانگ، بۆخۆی کاری ســـەختو دژوارەو کاتو تێچوونو ماندوونی زۆری پێویستە.

**دووەم: سامپلی ناهەڕەمەکی یان نائەگەرایەتی**

1: **ســـامپلی مەبەســـتدار**: ئەو ســـامپڵەیە کە توێژەر لەکۆمەڵگەیەکەوە وەریدەگرێتو؛ پێیوایە بەتەواوەتی نوێنەرایەتی کۆمەڵگەکەی دەکات. پشـت بەســـت بەبڕیارێکی پێشـــوەختەو لەســـەر بنەمای چەند پێوەرێکی لۆژیکیی دەرەکی کە پەیوەندی بەئەزموونی خۆیەوە هەیەو پێیوایە ئەم جۆرە ســامپڵە باشـــترینە کە دەتوانێـت نوێنەرایەتی کۆمەڵگەکە بکـات. بەڵام کێشـــەی ســـەرەکی لەم جۆرە ســـامپڵەدا ئەوەیە کە هیچ بنەمایەکی بـابەتی نییە بۆ بڕیاردان بەسەر وردی ئەنجامەکانی توێژینەوەکەداو گشتاندنی لەئایندەدا. بۆ نموونە ئەگەر توێژەرێکی کۆمەڵنـاسی توێژینەوەیەك لەســـەر گونـدەکـانی نـاوچەی شـــارەزوور بکاتو بیەوێت لەدیـاردەیەکی کۆمەڵایەتی وەك ژنو ژنخوازی بکۆڵێتەوە، دێتو بەشـێوەیەکی مەبەســتدار یەکێك لەگوندەکانی نـاوچەکە وەردەگرێتو گوایە گونـدەکانیتریش هەمان دابونەریت پەیڕەو دەکەنو هیچ جیـاوازییەکیـان لەگەڵ ئەو گونـدەدا نییە کە بەســـامپڵی وەریگرتووە.

2: **سامپلی پشكەكان** (كیوتا سامپل)

لەم جۆرە سـامپڵەدا كۆمەڵگای توێژینەوە بەسـەر چەند گروپ و چینێكدا دابەش دەكرێت و؛ لەهەر گروپ و چینێك بەشـێوەیەكی نـاهەڕەمەكی ژمارەیەك وەردەگیرێت. ئەم سـامپڵە لەهەڕەمەكی چینایەتی دەچێت بەڵام لێرەدا بەئارەزووی خۆی تاكەكانی سـامپڵەكەی هەڵدەبژێرێت بەبێ ئەوەی وابەستە بێت بەژمارەو ڕێژەی چینەكانی كۆمەڵگەی توێژینەوەوە.

ئەم جۆرە سـامپڵە ڕێگەیەكی سـادەیە بۆ پێوانەكردنی ڕای گشـتی و لەمێژە پەیمـانگای گالوپ لە وڵاتە یەكگرتووەكـانی ئەمریكا پەیرەوی دەكـات و؛ كۆمەڵگەی ئەمریكی بەسـەر چەند بەشێكدا، دابەش دەكات و لەهەر بەشـە ژمارەیەك وەردەگرێت، بۆ نموونە خوێندكاران، مامۆسـتایان، پیشـەوەران، ئەندازیاران، پیاوانی ئاینی، پزیشكان...هتد.

## ئامرازی توێژینەوە

لەتوێژینەوەی زانستیدا چەند ئامرازێك بۆ کۆکردنەوەی داتاو زانیاری هەیەو؛ هیچ ئامرازێك نییە بۆ هەموو توێژینەوەکان ببێتو؛ بۆ هەر توێژینەوەیەك ئـامرازێکی گونجـاو هەیەو مەرج نییە بۆ هیتر یـان بۆ هەموو توێژەرێـك دەسـتبدات. ئامرازی کۆکردنەوەی داتاو زانیارییەکان؛ لەتوێژینەوەیەکەوە بۆ توێژینەوەیەکیتر دەگۆڕێتو بەندە بە ئامانجو سروشتی توێژینەوەکەو جۆری ســامپڵەکەیەوە. بۆ نموونە کۆمەڵگە یان ســامپڵی توێژینەوەیەك ئەگەر نەخوێنـدەوار بێـت نـاتوانرێـت بە پێوەر(المقیـاس) یـان فۆرمی ڕاپرسی (الاستبیان، الاستفتاء، الاستبانة) زانیارییان لێوەربگیرێت، هەروەك چۆن بۆ منداڵیش نابێت کە هێشـــتا لەڕووی عەقڵییەوە لەو ئاســـتەدا نییە بڕگەو پرســـیارەکان بخوێنێتەوەو وەڵامی دروســـت بداتەوە. چاوپێکەوتنیش بۆ هەنـدێك توێژینەوە دەبێـت، بەڵام بۆ هەنـدێکیتر نـابێـت، ئەگەر ژمـارەی سـامپڵ کەم بوو ئەوا بەئاسـانیو لەماوەیەکی کورتدا ئەکرێت چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا بکرێت، بەڵام ئەگەر ژمارەی ئەنـدامانی ســـامپڵ گەورە بوو؛ لەم حـاڵەتەدا ڕەنگە بەکارهێنـانی پێوەر یـان فۆرمی ڕاپرسی گونجـاوتر بێت بەو مەرجەی ئەندامانی سامپڵ خوێندەوارو عاقڵو کامڵ بن.

### سەرچاوەکانی بڕگەو پرسیارەکانی ئامرازی توێژینەوە

ئامادەکردنی بڕگەو پرسـیارەکانی چاوپێکەوتنو فۆرمی ڕاپرسیو پێوەر، بنەمای زانســـتی خۆیـان هەیەو توێژەر نـاتوانێـت تەواوی بڕگەو پرســـیـارەکـان لەئەندێشـەی خۆیەوە بهێنێتو ڕیزیان بکات. لەداڕشـتنی بڕگەکاندا، ئەبێت ئاماژە بەو ســـەرچاوانە بکرێت کە ســـودی لێ وەرگرتوون. خۆئەگەر توێژەر بەتەواوەتی پشـــتی بەفۆرم یان پێوەرێکی ئامادەکراو بەســـتبوو، لەم حاڵەتەدا ئەبێت ســـەرلەنوێ ڕاســـتیو جێگیری ئامرازەکە؛ دەربهێنێتەوە. بەڵام ئەگەر

خودی توێژەرەکە خۆی پێوەر یان فۆرمەکەی ئامادە کرد، پێویستە لەهێنانی برگەو پرسیارەکاندا؛ پشت بەم سەرچاوانە ببەستێت:

**1. ئەزموونی توێژەر:** زۆرێك لەتوێژەران لەبواری بابەتی توێژینەوەکەیاندا، ساڵانێك ئەزموونی تیۆری‌و پراکتیکییان هەیەو ئەکرێت لەدارشتنی برگەو پرسیارەکاندا؛ پشت بەئەزموونی رابردوویان ببەستن.

**2. توێژینەوەی پێشوو:** دوابەدوای گەڕان‌و پشکنینی سەرچاوە زانستییەکان، رەنگە توێژەر دەستی بەچەند سەرچاوەیەکی زانستی (ماستەرنامەو تێزی دکتۆراو توێژینەوەی زانستی) بگات کە لەشوێنێترو سەردەمیتردا لەسەر هەمان بابەت‌و گۆراو؛ ئەنجامدراون. هەموو ئەو توێژینەوانەش لەکۆتایی لاپەڕەکانیاندا، ئامرازی توێژینەوەی خۆیان خستۆتەڕوو، ئەکرێت کەم تا زۆر سودیان هەبێت‌و ژمارەیەك برگەو پرسیاریان لێوەربگیرێت.

**3.سەرچاوە زانستییەکان:** وەك کتێب‌و گۆڤارو بڵاوکراوە زانستییەکان کە توێژەر کۆی کردونەتەوە، ئەمانیش بۆخۆیان گەنجینەیەکی بەکەڵکن بۆ توێژەرو؛ ئەتوانێت دوای پشکنین‌و خوێندنەوەیان، ژمارەیەك برگەو پرسیاریان لێ هەڵبهێنجێنێت‌و سوودیان لێوەربگرێت.

**4.شارەزاو پسپۆران:** لەسەرجەم هەنگاوەکانی توێژینەوەدا؛ توێژەر پێویستی بەراوێژکردنە بەشارەزاو پسپۆرانی بوارەکەی خۆی؛ تا هاوکاری بکەن‌و رێنمایی بدەنێ، بەتایبەتیش لەقۆناغی ئامادەکردنی ئامرازی توێژینەوەکەیدا. لەرووی ئەکادیمییەوە باشترەوایە پسپۆڕەکان پلەی زانستییان هەبێت؛ لەبەرزترینەوە (پرۆفیسۆر، پرۆفیسۆری یاریدەدەر، مامۆستا، مامۆستای یاریدەدەر) یان ئەو شارەزایانەی کە ساڵانێکی دوورودرێژە لەهەمان بواردا ئەزموونی دەوڵەمەندیان هەیە.

**5.فۆرمی راپێوی بەرایی:** سەرەکیترین سەرچاوەیە بۆ دەستکەوتنی برگەو پرسیارەکانی ئامرازی توێژینەوە. توێژەر چەند پرسیارێکی کراوە (1- 5) ئاراستەی ژمارەیەك نزیکەی (40 – 50) کەس لەئەندامانی سامپڵی

توێژینەوەکەی دەکات. ئەوانیش ئەگەر هاوکارییان کردو ئازادانە وەڵامی پرسیارەکانیان دایەوە. دواتر پشکنین بۆ وەڵامەکان دەکاتو ڕێژەی دووبارەکانیان دەردەهێنێتو؛ ژمارەیەك بڕگەیان لێدروست دەکاتو؛ دەیانخاتە نێو ئامرازی توێژینەوە. هەتا ژمارەی ئەو سامپڵە وەرگیراوە زۆرتربێتو تا زیاتر هاوکاری توێژەر بکەنو وەڵامی پرسیارەکان بەوردی بدەنەوە؛ ئەوا ڕاوبۆچوونی جیاواز کۆدەکرێتەوەو دواجار ئامرازی توێژینەوەکە؛ دەوڵەمەندتر دەبێت.

**چاوپێکەوتن** المقابلة Interview

چاوپێکەوتن ئامرازو کەرەستەیەکی زانستییە بۆ کۆکردنەوەی داتاو زانیاری لە ئەندامانی سامپڵو کۆمەڵگەی توێژینەوە. ئەم ئامرازە لەکۆمەڵێك بڕگەو پرسیار پێکدێت کە ئامانجەکانی توێژینەوە بەدی دەهێنن، توێژەر ئاراستەی کەسێك یان چەند کەسێکی دەکاتو وەڵامەکانی وەردەگرێتەوە، واتا وەڵامدەر بەشێوەی زارەکی نەك بەنووسین وەڵامی خۆی دەداتەوە.

**جۆرەکانی چاوپێکەوتن:**

**یەکەم بەپێی ئامانجو بوار:** چاوپێکەوتن ئەم چوار جۆرە سەرەکییەی هەیە:

**1.چاوپێکەوتنی ڕوپێوی:** ئەم جۆرە بۆ ڕاپرسی گشتی دەبێتو چەند پرسیارێکە بەژمارە کەمن بەڵام ئاراستەی کەسانێکی زۆر دەکرێت؛ بەمەبەستی دەرخستنو زانینی دیدو بۆچوونیان لەسەر کەیسێکی هەنووکەیی یان بۆ هەر کێشەیەك لەبوارەکانی ژیاندا کە پەیوەست بێت بەخەڵکانێکی زۆرەوە.

**2.چاوپێکەوتنی دەستنیشانکاری:** ئەم جۆرەیان بۆ دیاریکردنی کێشەو هۆکارەکانی یاخود ڕادەی مەترسی دیاردەیەك دەخرێتەڕوو؛ سەرباری دیاریکردنی ئەو فاکتەرانەی ڕۆڵیان لەسەرهەڵدانی کێشەو قەیرانەکاندا؛ هەبووە.

**3.چاوپێکەوتنی چارەسەریی:** زیاتر لەبواری پزیشکیدا بەکاردەهێنرێت، وەك بینینی نەخۆش لەلایەن پزیشــکەوە بەمەبەســتی چارەســەرو کەمکردنەوەی ئەو هۆکارانەی رۆڵیان هەبووە لە توشــبوونی بەنەخۆشی. ئەم رێگایە لەمێژە لەبواری تەندروستیدا بەکاردەهێنرێت.

**4.چاوپێکەوتنی رێنمایی:** ئەمجۆرەی چاوپێکەوتن بۆ ئامۆژگاریو رێنماییە، بەرلەروودانی هەر کێشەو گرفتێك ئیتر هەر کایەو بوارێکی ژیاندا بێت.

**دووەم بەپێی ئاستو ژمارە:**

**1.چاوپێکەوتنی تاکایەتی:** بۆ بابەتێکە کە بارگاوی بێت بە هەڵچوونو سۆزو؛ توێژەر لەگەڵ یەك کەسدا ئەنجامی دەدات.

**2.چاوپێکەوتنی گروپایەتی:** چاوپێکەوتنی کۆمەڵێك کەســـە لەیەك کاتو شــوێندا، تا ژمارەیان کەمتربێت باشــترە، پێویســتە توێژەر ئەوە بزانێت؛ ئەو زانیارییانەی کە دەشـێت بەچاوپێکەوتنی گروپ دەسـتبدەکەون، سـنورداڕو رواڵەتین وەك: رەگەز، تەمەن، بـاری گوزەران...هتـد. زۆرکات وەڵامەکان بەبەڵێو نەخێرو راستەوخۆن. پێویستە توێژەر لەکاتی پرسـیارکردندا رەچاوی ئەمانە بکات: -

أ. رەزامەندی ئەو کەسە لەسەر ئامرازی بەکارهاتوو وەربگرێت.

ب. دەبێت پرســـیارەکانی بۆ هەموو تـاکەکانی گروپەکە؛ وەك یەکو بێت بەهەمان ریزبەندی بێت. ئەگەر توێژەر رەچاوی ئەم خاڵە نەکات؛ لەرووی ئامارییەوە کێشــەی بۆ دروســت دەبێت. خۆئەگەر کەســەکان بەریزبەندی پرســیارەکان وەڵام نەدەنەوە کارەکە قورس دەبێت، بۆیە پێویســتە بزانرێت چۆن وەڵامەکان دەدرێنەوە؛ دەبێت وەڵامی هەموو پرسیارەکان وەربگیرێن.

**بنەماکانی چاوپێکەوتن**

چاوپێکەوتن پرانسیپی خۆی هەیەو ناکرێت هەڕەمەکییانە ئەنجام بدرێت، پشت بەچەند بنەمایەکی زانستی دەبەستێت تاکو بەباشترین شێوە ئامانجەکانی خۆی بپێکێت. سەرەتای هەموو چاوپێکەوتنێك قسەو باسی گشتییە کە لەچوارچێوەی بابەتەکەدان، واتە راستەوخۆ ناچێتە نێو جەوهەری بابەتەکەوە، بەشێوەیەکی پلەدار پرسیارەکان دەوروژێنرێت. ئەگەر پێشتر پرسیارەکان بدرێتە ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا سازدەکرێت؛ رەنگە باشتر بێت؛ تا خۆی ئامادە بکات، هەروەك پێویستە توێژەر؛ پێشتر پرسیارەکانی لەگەڵا چەند کەسێکیتردا تاوتوێ کردبێت تا بەرچاوی روون بێتو بزانێت چ وەڵامێکی دەست دەکەوێت، هەروەها ئەبێت پرسیارەکان جەوهەری بن. توێژەر ئەتوانێ لەئەنجامی پرسیاری ناراستەوخۆوە وەڵامی پێویستی دەستبکەوێت؛ ئەمەش دەکەوێتە سەر زیرەکیو لێهاتوویی توێژەر. گرنگترین ئەو بنەماکانی چاوپێکەوتن ئەمانەن:

1.دیاری کردنی ئەو کەسانەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکرێت، واتا کێن ئەو کەسانەی مەبەستە لەرێگەی چاوپێکەوتنەوە زۆرترین زانیاریان لێ وەربگریت یان زۆرترین زانیاری بدرکێنن؟، ئەبێت ئەو کەسانە ئامادەییان تێدابێت بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان. هەروەها دەبێ بزانرێت چەند کەس پێویستە لەسەر ئەو دیاردەیە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکرێت؟ ئایا ژمارەی ئەو کەسانەو شێوازی هەڵبژاردنیان؛ نوێنەرایەتی کۆمەڵگەی توێژینەوەکە دەکەنو دەکرێت وەڵامەکانیان گشتاندنی بۆ بکرێت؟.

2.ئامادەکاری بۆ چاوپێکەوتن: دیاریکردنی کاتو شوێنی گونجاو بۆ ئەو کەسانەی ئامادەییان تێدایە بەشداری چاوپێکەوتن بکەن، توێژەر نابێت کاتی خۆی بسەپێنیت، بەڵکو بەرێکەوتن کاتو زەمەنی پێویست لەنێوان

توێژەرو ئەو کەسانەدا دیاری دەکرێت، سەرباری شوێنی چاوپێکەوتنەکە؛ کە پێویستە لەرووی فیزیایی و کۆمەڵایەتییەوە شیاوو لەبار بێت.
3.دیاریکردنی پلانی چاوپێکەوتن و پرسیارەکانی. پرسیارەکان لەکوێوە سەرچاوە دەگرن؟ ئەبێت ئامانجی توێژینەوەکە بەدیبهێنن و ئاوێنەی بن.
4.پێویستە توێژەر مەشقی لەسەر شێوازی چاوپێکەوتن کردبێت و؛ بتوانێت هاوکاری لێکۆڵراوان یان ئەندامانی سامپڵی توێژینەوەکە بەدەست بهێنێت، واتە بەشێوەیەکی راستگۆیانەو راشکاوانە ئامانجی چاوپێکەوتنەکەیان پێبڵێت؛ تا ئەوانیش راشکاوانە ئامادەیی خۆیان بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان دەرببڕن، چونکە ئەگەر لێکۆڵراو ئامانجی توێژینەوە نەزانێت، رەنگە بەشداری نەکات یاخود راستگۆیانە وەڵام نەداتەوە. پێویستە توێژەر لە پرۆسەی مەشقکردندا ئەم خاڵانە رەچاوبکات: -

- خولقاندنی کەش وهەوای دۆستانە کە جێگەی بڕواو متمانە بێت.
- دەبێت بزانێت چۆن پرسیارەکان دادەرێژێت و ئاراستەیان دەکات؟ ئەوەندە لێوەشاوە بتوانێت وەڵام بەلێکۆڵراوان بدرکێنێت، بۆ ئەمەش دەبێت بەرووبەکی خۆشەوە دەست پێبکات و؛ بەشێوەیەکی سروشتی پرسیار بکات نەك کەشێکی پۆلیسی ناسروشتی بخولقێنێت. هەروەها دەبێت سەرنج لەروخساری کەسەکەو بەرزی و نزمی دەنگی بدات، هەروەها ئەبێت لەرێی زمانی جەستەوە بتوانێت هەندێك زانیاری دەستبکەوێت کە رەنگە لەئاخاوتنەکانەوە نەدرکێندرێن.
- زۆرجار لێکۆڵراو لە پرسیارەکە تێناگات، بەمەش وەڵامی هەڵە دەداتەوە، پێویستە توێژەر جارێکیتر بەوەڵامەکاندا بچێتەوە تا دڵنیا بێت لەڕاستی و دروستی و وردی وەڵامەکان.

## تۆمارکردنی چاوپێکەوتن

ئایا چاوپێکەوتنەکە لەکاتی خۆیدا تۆماربکرێت، یان نەکرێتو دواتر لەشـوێنێکیتردا توێژەر تۆماری بکات؟ ئایا ئامێری تۆمارکردن بەکاربهێنێت؟ یان پشـت بەیادوەری خۆی ببەسـتێتو دواتر تۆماریان بکات؟ لەهەموو حـاڵەتەکـانـدا ئەبێـت ڕەزامەنـدی لێکۆڵراو سـەبـارەت بەو ئـامرازەی بەکاردەهێنرێت بۆ تۆمارکردنەکە؛ وەربگیرێت. ئەگەر کەسـەکە ڕەزامەندی نەدابوو لەسـەر تۆمارکردنی چاوپێکەوتنەکەی؛ ئەوکات پشـت بە یادەوەری دەبەسترێت، ئەویش ئەکەوێتە سەرئەوەی چەند لەو وتانەی لەیاد دەمێنێت کە کەسـەکە دەرکاندونی، جگە لەو زانیارییانەی ڕوخسـارو ئەندامەکانی جەسـتەیەوە سـەرنجی لێداوەو وەریگرتوون، لەم حاڵەتەدا باشـتروایە توێژەر بەنووسـین تێبینییە سـەرەکییەکان ئەوانەی کە پێی دەڵێن سـەرەقەڵەم، بنوسـێتەوە، تاکو هێڵە گشـتییەکان کلیلێك بن بۆ یادکەوتنەوەی تەواوی زانیاری نێو وەڵامەکان.

**فۆرمی ڕاپرسی** "الاستبیان Questionnaire"

یەکێکە لە گرنگترین ئـامرازەکانی توێژینەوە لەزانسـتە مرۆڤایەتیەکانـداو؛ زۆرترین بەکارهێنانی هەیە. ئەم ئامرازە، بریتیە لەکۆمەڵێك بڕگەو پرسـیار کە خودی لێکۆڵراو بەبێ یـارمەتی توێژەر؛ وەڵامیـان دەداتەوە. ڕەنگە لەڕێگەی پۆستەوە بنێردرێت بۆ لێکۆڵراوان یاخود ڕاستەوخۆو ڕووبەڕوو؛ توێژەر پێیان بدات. کەواتە ئامادەبوونی توێژەر مەرجێك نییە هەروەك لەچاوپێکەوتندا پێویسـتە. لەم ئـامرازەدا؛ داتـاو زانیـاری لەبـارەی هەسـتونەسـت، پاڵنەرەکانیان، دیدوبۆچونو، بیروباوەڕو؛ حەزوئارەزووی تاکەکەسـەکان وەردەگیرێت. واتە ئەو بوارانەی کە ڕەنگە نەکرێت لەڕێگەیترەوە زانیارییان لەسەر کۆبکرێتەوە.

فۆرمی راپرسی ئەگەر لەرێگەی پۆستەوە بنێردرێت پێویستە رێنمایی چۆنییەتی وەڵامدانەوەشی لەگەڵدا بێت. هەروەها دەبێ ئەندامەکانی سامپڵی توێژینەوە بەشێوەیەکی وردو زانستی چ وەك ژمارە، چ وەك ناونیشان دەستنیشان کرابن. ئەمە لەکاتێکدایە کە لەو ناوچە جوگرافییەدا؛ خزمەتگوزاری پۆستو گەیاندن کارابنو؛ پۆست بچێتو بێتەوە کەسەکان لەشوێنی خۆیاندا جێگیربن. توێژەر ئەتوانێت لەرێی ئیمێلی ئەلەکترۆنییەوە فۆرمەکان بنێرێت، بەو مەرجەی خزمەتگوزاری ئینتەرنێت لەکاردا بێتو رەزامەندی لێکۆڵراوان وەرگیرابێتو پێویستە رێنمایی چۆنییەتی وەڵامدانەوەشی لەگەڵدا بێت. رەنگە توێژەر راستەوخۆ بچێتە شوێنی کارو فۆرمەکان دابەش بکاتو؛ زانیاریو رینمایی پێویست بۆ پرکردنەوە بدات. ئەمە تێچوونی کەمترەو رەنگە لەکاتی پرکردنەوەشدا؛ لەرێگەی تێبینییەوە هەندێك زانیاریتری دەستبکەوێت؛ کە لە پۆستو ئیمێلی ئەلەکترۆنیدا بەردەست نابن بۆی. لەهەردوو شێوازەکەدا دەبێت ئەو تێبنییە بنووسرێت کە وەڵامەکان بەنهێنی دەمێنێتەوەو بۆ توێژینەوەی زانستییە، یاخود پێویست بە نوسینی ناو ناکات، چونکە ناو نوسین ئازادی سنوردار دەکاتو؛ کەسەکە لەوەڵامدانەوەدا دەسلەمێتەوەو وەکو پێویست زانیارییەکان نادات.

فۆرمی راپرسی بۆ نەخوێندەوار بەکارنایەت؛ چونکە مەرجی سەرەکییە خودی کەسەکە خۆی؛ فۆرمەکە بخوێنێتەوەو بەدەستو قەڵەمی خۆی نەك توێژەر؛ وەڵام بداتەوە. هەروەها بۆ رەفتاری کۆمەڵایەتی هەنووکەیی بەکارنایەت، چونکە لەو دیاردەیەدا پێویستە ئامرازی تێبینیکردن بەکاربێت.

## جۆرەکانی فۆرمی راپرسی

بەگشتی فۆرمی راپرسی دەکرێت بە سێ بەشەوە:

**1.فۆرمی راپرسی کراوە:** لەم جۆرەدا لێکۆڵراو ئازادە لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانو؛ هیچ کۆتو بەندێکی لەسەر نییە، بەویستی خۆی گوزارشت

لەبیروباوەرو دیدوبۆچوونی خۆی دەکات، بەرانبەر بەهەر پرسیارێك کە کراوە؛ هیچ وەڵامێك دانەنراوە تاکو یەکێکیان هەڵبژێرێت.

ئەگەر لێکۆڵراو هاوکاری توێژەری کردو وەڵامی پرسیارەکانی بەباشی دایەوە؛ ڕەنگە لایەنی خراپی فۆرمی ڕاپرسی کراوە لەوەدا بێت کە لێکۆڵراو بەئارەزووی خۆی ئەنوسێت‌و درێژدادڕی دەکات، ئەمەش لەرووی ئامارییەوە کێشە بۆ توێژەر دروست دەکات‌و ناتوانێت چارەسەری ئامارییان بکات؛ لەبەر زەحمەتی جیاکردنەوەی دووبارەکان‌و هەر یەکەی شتێکی نووسیوەو زۆرجار خاڵی هاوبەش هێندە کەمە ناتوانرێت کۆبکرێنەوە، جگە لەوەی کاتی زۆری دەوێت، ئەگەری هاوکاری نەکردنیش زۆرترە.

**2.فۆرمی ڕاپرسی داخراو:** لەم جۆرەیاندا لێکۆڵراو ئازاد نییە چ وەڵامێك دەداتەوەو دەینوسێت، بەڵکو لەنێوان دوو وەڵامدا بۆ نموونە: (بەڵێ، نەخێر) یەکێکیان هەڵدەبژێرێت‌و بژاردەی سێیەمی لەبەردەمدا نییە. خراپەکانی فۆرمی ڕاپرسی داخراو، ئەوەیە کە لێکۆڵراو هیچ ئازادییەکی لەوەڵامدانەوەدا نییەو؛ ناتوانێت گوزارشت لەبیرو بۆچوونەکانی خۆی بکات، بەڵام لەرووی ئامارییەوە ئاسانەو توێژەر ماندوو نابێت.

**3.فۆرمی ڕاپرسی نیمچەکراوە یان نیمچەداخراو:** کراوەی داخراوو؛ داخراوی کراوەشی پێدەگوترێت. واتە لێکۆڵراو ئازادە لە هەڵبژاردنی یەك بژاردە؛ لەنێوان چەند وەڵامێکدا بۆ هەر پرسیارێك کە ئاراستەی کراوە (ا، ب ، ج، د. هـ). داخراوە چونکە بۆی نییە لەوانە زیاتر هەڵبژێرێت کەبۆی دانراوە. کراوەشە چونکە بژاردەکانی لەدووان زیاترە. بەلای شارەزایانەوە باشتروایە بژاردەکان لەپێنج دانە زیاتر نەبێت تاکو پرۆسەی هەڵبژاردن قورس نەبێت. کاتێك کەسێك بیەوێت لەنێوان پێنج وەڵامدا، یەکێکیان هەڵبژێرێت، زۆر لەوە ئاسانترە لەنێوان نۆ یان دە وەڵامدا هەڵبژاردن‌و بەراوردکاری بکات. ئەمجۆرە لەهەردوو جۆرەکەیتر باشترەو ئازادی ئەدات‌و سنوریشی بۆ دیاریکردووە، لەرووی ئامارییەوە ماندووبوونی کەمترە.

باشـــتروایە لەفۆرمی راپرســـیداو؛ لەبەرخاڵە بەهێزەکانیان؛ هەرسێ جۆرەکە (کراوە، داخراو، نیمچەکراوە) لەپرســـیارەکاندا هەبن. هەندێك بڕگە هەیە گشـــتین‌و بیرکردنەوەی ناوێت‌و تەنها (بەڵێ، نەخێر)ی بۆ دادەنرێت باشـــترە لەنێوان پرســـیارەکاندا هەبن تا بەهۆیانەوە لێکۆڵراو پشـــوو بدات‌و بێزار نەبێت.

**بنەماکانی دارشتنی بڕگەو پرسیارەکان:**

کۆمەڵێك پرەنیســـپ‌و بنەما هەیە کە پەیوەندییان بەدارشـــتنی بڕگەکانەوە هەیەو ئەبێت رەچاو بکرێن ئەوانیش ئەمانەن:

1. پێویســـتە پرســـیارەکان راســـتەوخۆ لە ئەندامانی ســـامپڵی توێژینەوەکە بکرێت، واتا کەســـەکە رای خۆی بنووســـێت نەك بەناوی هەمووانەوە وەڵامبداتەوەو بنوسێت. بۆ نموونە: بۆچی بەمەبەستی خوێندنەوە؛ سەردانی کتێبخانەی گشتی زانکۆ ناکەیت؟ نەك بەمجۆرە بپرسێت: بۆچی خوێندکاران بەمەبەستی خوێندنەوە سەردانی کتێبخانەی گشتی زانکۆ ناکەن؟
2. پێویستە هەر بڕگەیەك یەك پرسیارو یەك بیرۆکە لەخۆبگرێت‌و بەستەری (و) لەنێوانیاندا نەبێت.
3. پرسیارەکە لەرووی زمانەوانیەوە روون‌و ئاشکرا بێت.
4. دوورکەوتنەوە لەو وشانەی ئاڵۆزن‌و دوو لێکدانەوە زیاتر هەڵدەگرن.
5. هەر وشـەیەك زیادەو بێ رۆڵ بوو؛ لاببرێت، رسـتەکان با کورت‌و پوخت‌و مانادارین.
6. بڕگەکە بەجۆرێك دانەرێژرێت کە ئاماژە بێت بۆ وەڵامێکی دیاریکراو، واتا لەپرسیارەکەوە هیچ ئاماژەیەك نەبێت بۆ یەکێك لە وەڵامەکان.
7. پرســـیارەکان بەجۆرێك نەکرێن کەســـەکە بەدوای وەڵامی ئەکادیمی‌و بەســـەندد بگەرێت ، ئەبێ بەبیروبۆچوونی خۆی وەڵام بداتەوە نەك لەبەر

بەســەندگەرایی کۆمەڵایەتی (المرغوبیة الاجتماعیة) بۆ وەڵامێك بگەڕێت کە لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە ویستراو بێت.

8. پرسیارەکان پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەبێتو لێی لانەدات.

9. بڕگە دەبێت رستەی تەواو بێتو بیرۆکەکەی لەخۆ بگرێت، واتە رستەی بەسود بێت. نموونە:

(1) وازت لە خوێندن هێناوە:	أ. بەڵێ	ب. نەخێر

(2) ئەگەر بەڵی بوو:

أ. ئابوری (   ) ب. کۆمەڵایەتی (   ) ج. سیاسی (   ).

بڕوانە پرســیاری دووەم، رســتە نییەو بیرۆکەی تەواوی تێدا نیە، باشــتربوو بنوسرێت لەبەر چ هۆکارێك وازت لەخوێندن هێناوە:

ا. ئابوری	ب. کۆمەڵایەتی	ج.سیاسی	د. تەندروستی.

10. هەوڵ بدرێت پرسیارەکە وەها بکرێت تەنها یەکێك لەبژاردەکان، وەڵام بێت بۆی، هەروەها دەکرێت پرسیارەکە بەجۆرێك بێت؛ هەموو بژاردەکان، وەڵامبن و لێکۆڵراو ریزبەندیان بکات.

11. بڕگەکان ژمارەیان بۆ دائەنرێت لە (1، 2، 3، 4، .....)

**پرسیار: ژمارەی بڕگەکان (پرسیارەکان) چەند بێت؟**

وەڵامی ئەم پرســیارە تایبەتە بەئامانجی توێژینەوەو ئەو گۆڕاوانەوە کە لێیان دەکۆڵرێتەوە، ئەگەر بڕگەکان ژمارەیان کەم بوو ئەوا زانیاریو داتای کەم دەســتدەکەون، بەڵام پرســیارەکان زۆر بوون، ئەوا زۆرترین زانیاری کۆدەکرێتەوە لەســەر ئەو دیاردەیەی توێژینەوەی بۆ دەکرێت. ئەگەرچی زۆری پرســیار دەبێتە بێزاری وەڵامدەرانو رەنگە وازبهێنن؛ بەشــێکی وەڵام نەدەنەوە. دەبێت توێژەر هاوکاری ئەندامانی سامپڵی توێژینەوەکەی مسۆگەر کردبێت. لەهەر فۆرمێکدا رەنگە لەرێگەی نزیکەی (50 - 70) پرســیارەوە بتوانرێت زانیاری پێویســت کۆبکرێتەوە، ئەو رێژەیەش تەنها خەمڵاندنەو تایبەتمەندی توێژینەوە بۆخۆی بڕیار دەدات کە ژمارەی بڕگەکان چەند

بێت، لێرەدا باشتروایە بگەڕێینەوە بۆ رای پسپۆڕو شارەزایانو توێژینەوەکانی پێشوو.
زۆرجار ناوەڕۆکی پرسیارێك لەشێوەی جیاوازدا؛ دەخزێندرێتە نێو پرسیارەکانیترەوە، تاکو بزانرێت لێکۆڵراو؛ لەوەڵامدانەوەدا وردو راستگۆیە یاخود سەرپێی وەڵامدەداتەوەو کارەکە بەڕێی دەکات. بۆیە پێویستە بەووردی وەڵامەکان بخوێندرێتەوە، تا دەرکەوێت کە هەردوو وەڵامەکە پێچەوانەی یەکترن یان وەك یەکن، ئەگەر هەستکرا وەڵامەکە دووڕویی تیایە ئەبێت ئەو فۆرمە دوربخرێتەوە. لەوانەیە هەندێك فۆرمیش بە هەڵە پڕبکرێتەوە، لەهەموو حاڵەتێکدا پێویستە توێژەر ژمارەیەك فۆرمی زیاتر ئامادەبکاتو بڵاوی بکاتەوە، هەمیشە ئەگەری ئەوە هەیە رێژەی (20%)ی فۆرمەکان بەناتەواو دابنرێنو دواجار دووربخرێنەوە، لەبەر ئەمەیە شارەزایانی بواری ئامار دەڵێن: ئەگەر سامپڵ (100) کەس بوو، ئەبێت توێژەر (120) فۆرم دابەش بکات.

**بنەماکانی دارشتنی بژاردەکانی برگەکان.**

1. باشتروایە ژمارەی بژاردەکان لەپێنج زیاترنەبێت. کاتێك وەڵامدەر تەماشای بژاردەکان دەکات بەئاسانی ئەتوانێت هەڵبژاردن بکاتو بەیەکتری بەراوردیان بکات.
2. نابێت هیچ بژاردەیەك دوو بیرۆکەو زیاتری؛ لەخۆبگرێت.
3. پێویستە کورتو پوخت بن‌و، دەبێت بژاردە لەبرگە کورتتر بێت. ئەگەر بژاردەیەك کورت نەکرایەوەو درێژ بوو؛ باشتروایە بکرێت بەبڕگە.
4. دەبێت درێژی بژاردەکان لەیەکەوە نزیك بێت، نەك یەکێك کورتو دوو ووشە بێتو یەکێکیش دوو دێرو نیو .

5. ئەگەر وشـــەیەك لە هەموو بژاردەکاندا؛ دووبارە ببێتەوە؛ یان ئەبێت ووشـەکە لاببرێت یاخود ئەو وشـەیە هەڵبگرێتو بیخرێتە نێو برگەکەیەوە. بۆ نموونە:

• تۆی باوك چۆن لەگەڵ منالەکانت؛ مامەلە دەکەیت:

ا. بەشێوازی نەرم و نیان (     ) ب. بەشێوازی دڵرەق (     )

ج. بەشێوازی دادپەروەرانە (     ) د. بەشێوازی دیموکراسی (     ).

ووشـــەی (بەشـــێواز) کە لەهەموو بژاردەکاندا هەیە، پێویســـتە ببرێتە نێو برگەکەوە، یان هەر لادەبرێت چونکە بەلابردنی ووشـەکە؛ هیچ لەبابەتەکە ناگۆرێتو، ئەگەر لەگەلیدا بێت لەرووی دارشتنەوە ناشرینەو زیادەیە.

6. بژاردەکـان دەبێـت بەپیـت (أ، ب، ج، د، ه) رێکبخـرێن، بۆئەوەی لەبرگەکان جیابکرێنەوە کە بەژمارە(1،2،3،4،5) ریزکراون.

7. ئەبێت لەتەنیشت بژاردەکانەوە بۆشاییەك هەبێت، ( دوو کەوانە، یاخود چوارگۆشە) بۆ ئەوەی هێمای راست (   ) لەناویدا بنووسێت.

8. بژاردەکـان لەدێری ســـەربەخۆداو لەخـوار برگەوە دەنووسرێـت نەك لەهەمان دێری برگەکەدا بێت.

بەمەبەســـتی ســـودوەرگرتن لە کاتو کەمکردنەوەی تێچوون، باشـــتروایە وەڵامەکان لەپەرەیەکی ســـەربەخۆدا بنوسرێن، تاکو فۆرمی راپرســـییەکە بۆ چەنـدجـاریکتر بەکـاربهێنرێتەوە. ئەمەش بەتـازەترین رێگەی وەڵامـدانەوە هەژمـاردەکرێت. پەرەی وەڵامـدانەوە، رێك بەقەد ژمـارەی برگەکانەو هیچ نووســـینێکی تێدا نییەو تەنها شـــوێنی وەڵامدانەوەی تێدایەو بەپێی ژمارەی ســـامپڵەکە؛ بەســـەریاندا دابەش دەکرێت. رەنگە خودی توێژەرەکە خۆی پرســـیارەکان بخوێنێتەوە، دواتر ئەندامانی ســـامپڵ توێژینەوە لەســـەر ئەو پەرەیە وەڵام بـدەنەوە. گریمـان فۆرمەکە لەپەنجـا برگە پێکهـاتووەو هەر برگەیەکیش پێنج بژاردەی هەیە، ئەوســـا پەرەی وەڵامدانەوە بەم شـــێوەیە ئامادە دەکرێت :

| ژمارەی فۆرم:<br>بەرواری پڕکردنەوە:<br>هەر زانیارییەکیتر.... | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | أ | ب | ج | د | هـ |
| 2 | أ | ب | ج | د | هـ |
| 3 | أ | ب | ج | د | هـ |
| 4 | أ | ب | ج | د | هـ |
| 5 | أ | ب | ج | د | هـ |
| 6 | أ | ب | ج | د | هـ |
| . | ... | ... | .... | ... | .... |
| . | ... | ... | .... | ... | .... |
| . | ... | ... | .... | ... | .... |
| 50 | أ | ب | ج | د | هـ |

ئەم ڕێگەیەی وەڵامدانەوە، بەتایبەتی لەچارەسـەری ئاماریدا سـوودی زۆری لێوەردەگیرێتو کارئاسانییەو؛ هەموو وەڵامەکان لەسەر یەك ڕوون بەتایبەتی ئەگەر ژمارەی ئەندامانی سـامپڵو ژمارەی بڕگەکان زۆر زۆر بوون، ئەگەرنا ئەوا پێویستە پرسیار بە پرسیار تەماشای لاپەڕەکانی فۆرمی هەر ئەندامێك بکرێتو کاتێکی زۆری پێدەچێت. سـەرباری ئەوەی بۆ وردبینیش ئاسـانترەو خێراترین هەنگاوە بۆ دورخسـتنەوەی ئەو فۆرمانەی فڕوفێڵیان تێدایەو ڕاستگۆنین.

**پێوەر** المقیاس Scale

توێژینەوە نوێو هاوچەرخەکان، کەمتر فۆرمی راپرسی بەکاردەهێنن‌و زیاتر روو لەپێوەر ئەکەن. چونکە ئەو وردیو خەسڵەتو مەرجە زانستییانەی لەپێوەردا هەیە لەفۆرمی راپرسیدا نییە. تەنها (راستیو جێگیری) بۆ فۆرمی راپرسی دەردەهێنرێتو تەنانەت هەندێك توێژەر؛ واز لەجێگیریش دەهێنن‌و بەدەرهێنانی راستی رواڵەتی کۆتایی پێدێنن. بەڵام لەپێوەردا پێویستە مەرجەکانی (بابەتیبوون، شیکاری برگە؛ هێزی جیاکەرەوەی برگە، راستی، جێگیری، ) بۆ دەربهێنرێت. ئامادەکردنی پێوەر بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت کە بریتین لەمانە:

1. دیاریکردنی تەوەرەکانی پێوەرو دواتر ئامادەکردنی برگە بۆ هەر تەوەرێك، ئەویش لەم رێیانەوە (ئەزموونی توێژەر، توێژینەوەکانی پێشووتر، سەرچاوە زانستییەکانی وەك کتێبو گۆڤارو بڵاوکراوە زانستییەکانو؛ راوێژکردن بەپسپۆڕو شارەزایان لەگەڵ فۆرمی راپێوی بەرایی) کە سەرچاوەی بنەڕەتین بۆ دیاریکردنی ژمارەی تەوەرو برگەو؛ بیرۆکەی نێو هەر تەوەرو برگەیەکی پێوەرەکە.

2. دوابەدوای دیاریکردنی تەوەرەکانو ئامادەکردنی ژمارەیەك برگە بۆ هەر تەوەرێك. ئینجا هێزی جیاکەرەوەی برگەکان دەردەهێنرێت. شارەزایانی بواری ئامادەکردنی پێوەر(دەروونیو کۆمەڵایەتی) پێیانوایە: قەبارەی سامپڵی هێزی جیاکەرەوەی برگەکان؛ نابێت لە (400) کەس کەمتر بێت، خۆ ئەگەر ژمارەی سامپڵەکە لەوەش زیاتر بێت؛ ئەوا گونجاوترە بەئاسانی دوو گروپی پەرگیر لەخەسڵەتدا؛ دەستدەکەون. هەندێك لەپسپۆڕانی بواری پێوانەو هەڵسەنگاندن؛ دەستکەوتنی ئەو ژمارەیە؛ بەکارێکی ئەستەمو زەحمەتی دەبینن، بۆیە بەباشی دەزانن رێژەی سامپڵی جیاکەرەوەی برگەکان؛ بەپێی ژمارەی برگەکان بێت ئەویش بەمەرجی (پێنج بۆ یەك). واتا پێنج کەس بۆ

هەر بڕگەیەك؛ ئەگەر زیاتریش بێت باشـــترە. کاتێك ژمارەی بڕگەکان (50) بێت، ئەوا پێویستە (250) کەس بۆ سامپڵی جیاکەرەوە وەربگیرێت.
ئەگەر ســـامپڵی جیاکەرەوە دیاریکراو پێوەرەکەیان پێدراو وەڵامیاندایەوە، ئینجا نمرەکانیان لەبەرزەوە بۆ نزم ریزبەند دەکرێت. پاشـــان دوو گرووپی پەرگیریان لێوەردەگیرێت بەمشێوەیە: رێژەی (27%) لەو کەسانەی بەرزترین نمرەو؛ رێژەی (27%) لەو کەســـانەی نزمترین نمرەیان وەرگرتووە. گریمان ســـامپڵەکەمان (400) کەســـە، لەم حاڵەتەدا (108) لەوانەی زۆرترین نمرەیان هەیەو (108) کەســـیش لەوانەی کەمترین نمرەیان هەیە؛ وەردەگیرین.
دوای دەرهێنـانو جیـاکردنەوەی نمرەی دوو گرووپە پەرگیرەکە، ئینجـا بەکۆمپیوتەرو لەرێی پرۆگرامی پاکێجی ئاماریی زانســـتە کۆمەڵایەتییەکانەوە (SPSS)وە، ناوەندی ژمێرەیی‌و لادانی پێوەریی بۆ نمرەکانیان دەردەهێنرێت‌و، بەهـای (T) هەژمـارکراویش دەردەهێنرێـت‌و؛ دواتر بەپلەی ئـازادی‌و؛ لانی کەمی ئاستی بەڵگەیی (0.05) بەهای (T) هەژمارکراو لەگەڵ
بەهای (T)خشـــتەییدا؛ بەراورد دەکرێت‌و بۆمان دەرکەوێت کام بڕگەیە؛ بەڵگەدارەو هێزی جیاکەرەوەی هەیە، کامەش هێزی جیاکەرەوەو خەســڵەتی بەڵگەداریی نییە؛ لەپێوەرەکە دەردەهێنرێت‌و دوور دەخرێنەوە.
3. لەم قۆنـاغەدا راســـتیی بڕگەکـانی پێوەرەکە دەردەهێنرێـت ئەویش بەبەکارهێنانی هاوکۆلکەی پەیوەســـتبوونی (Person) لەنێوان نمرەی هەر بڕگەیەك‌و لەگەڵ نمرەی گشـــتی تەوەرەکەی خۆی لەلایەك‌و، ئینجا نمرەی هەر بڕگەیەك لەگەڵ نمرەی گشـــتی تەواوی بڕگەکانی هەموو تەوەرەکانی پێوەرەکە. بۆ ئەمەش باشـــتروایە پشـــت بەکۆمپیوتەرو پرۆگرامی (SPSS) ببەسترێت.
4. دوای دەرهێنانی راســـتیی، هاوکۆلکەی جێگیریش دەردەهێنرێت‌و هەژمار دەکرێت، ئەویش بەیەکێك لەرێگاکان (دووبارە کردەوەی تێســـت، شـــیکاری

جیاوازی یەك ئاراستە...هتد) دیارە ئەم پرۆسەیەش هەر لەرێی کۆمپیوتەرو بەبەکارهێنانی پرۆگرامی (SPSS).

5. سەرباری دەرهێنانی هێزی جیاکەرەوەی برگەکانو راستیو جێگیریی، لەم سالآنەی دواییدا خەسڵەتێکیتریش سەربارکراوە کە بریتییە لە(هەستیاری پێوەر) ئەوی لەرێی پشت بەستن بەرێگای جاکسۆن بۆ دەرخستنی توانای پێوەرەکە بۆ خەملاندنی پەیوەندی لەنێوان (ئەدای کرداری)و ئەو (خەسڵەتەی)ی کە رێی برگەکانەوە دەپێورێت بۆ دابرکردنی کاریگەریی لابەلای هەر گۆراوێکیتر کە رەنگە شوێنەواری خۆی بەجێبهێڵێت. بۆ ئەمەش باشترواییە راوێژ بەپسپۆرانی بواری پێوانەو هەڵسەنگاندنو ئامار بکرێتو؛ پشت بەکۆمپیوتەرو پرۆگرامی (SPSS) ببەسترێت.

6. دوا قۆناغ دلنیا بوونە لەوردیو راستگۆیی وەلآمی ئەندامانی سامپڵی توێژینەوە. ئەویش لەرێی فێڵێکی زانستییەوە کە (پێوانەی دەرخستنی درۆ)یەو بریتیە لەدووبارە دانانەوەی چەند برگەیەکی پێوەرەکە لەجێگایتردا، تا بزانرێت ئەندامی سامپڵەکە بەیەك شێوە وەلآمی هەمان برگەیان لەهەردوو جێگە جیاوازەکەدا داوەتەوە. دیارە ئەگەر دوو وەلآمەکەی دژ بەیەك بوو، لەو حاڵەتەدا فۆرمی پێوەرەکەی دوور دەخرێتەوەو هەژمار ناکرێت.

پەسەندکردنو دوورخستنەوەی هەر برگەیەك بەپێی هاوکۆلکەی جیاکەرەوەی برگەیەك، بەرای پسپۆرانی بواری پێوانەو هەڵسەنگاندن بەپێی ئەم ئاستانەیە:

1. ئەگەر هاوکۆلکەی جیاکەرەوەی گەورەتر بێت (0.40) ئەوا برگەکە توانایەکی بەرزو باڵای جیاکردنەوەی هەیە.

2. ئەگەر هاوکۆلکەی جیاکەرەوە لەنێوان (0.30 – 0.39) بێت، ئەوا برگەکە توانای جیاکردنەوەکە لەئاستی باشەدایە.

3. ئەگەر هـاوکۆلکەی جیـاکەرەوە لەنێوان (0.20 – 0.29) بێـت، ئەوا بڕگەکە توانای جیاکردنەوەی تا ئەندازەیەك باشـەو؛ پێویسـتی بەچاککردن هەیە.

4. ئەگەر هاوکۆلکەی جیاکەرەوە کەمتر بێت لە (0.19) ئەوا بڕگەکە توانای جیاکردنەوەی لاوازەو باشتروایە دوربخرێتەوە.

**تێبینیکردن** الملاحظة Observation

لەراسـتیدا هیچ میتۆدێکی توێژینەوە نییە کە پشـت بە تێبینی یان چاودێری نەبەسـتێت. تێبینیکردن یەکێکە لەئامرازەکانی کۆکردنەوەی داتاو زانیاری، بەمانا پسـپۆرییەکەی بریتیە لەتێبینیکردنی بابەتیانەو مەبەسـتدار، توێژەر لەڕێی هەسـتەکانی بینینو بیسـتنەوە سـەرنج دەدات بەبێ ئەوەی پشـت بەراوبۆچوونی کەسـەکە ببەسـتێتو زانیاری وەڵامدەر لەڕێی دانپێدانانو دەربڕینی خۆییەوە کۆبکرێتەوە؛ هەروەك لەچـاوپێکەوتنو فۆرمو پێوەردا هەیە.

**تێبینی زانستیی** لەکورتترین پێناسەدا بریتیە لەسەرنجدانی ورد لەدیاردەیەك؛ لەڕێی کەرەسەو ئامێرو ئامرازی چاودێریو تۆمارکردنەوە کە لەگەڵ سروشتی دیـاردەکەدا بگـونجێن، بەمەبەسـتی زانـینو نـاسـینی خەسـڵەتو تایبەتمەندێتییەکانی.

ئەو هۆکارانەی وا لەتوێژەر دەکەن پەنابەرێتەبەر تێبینیکردن زۆرن لەوانە:

1. رزگاربوون لەکەموکورتییەکانی؛ شـێوازی دانپێـدانـانو دەربڕینی خۆیی لەکۆکردنەوەی داتـادا. لەبەر رۆڵی نێگەتیڤی فـاکتەری پەسـەنـدگەرایی کۆمەڵایەتی (المرغوبیة الاجتماعیة)و یادکەوتنەوەی یادەوەرییەکانی رابردوو، زۆرجار زانیارییەکان وردنینو ناتەواون.

2. رەفتاری مرۆڤەکان لەهەلومەرجی سروشـــتی خۆیدا تۆمار دەکرێت بەبێ کـاریگەری کـۆتـو بەنـدەکـانی میـتۆدی ئەزمـووگەریی، کە لەژینگەیەکی دەستکرددا تاقیکردنەوەکە ئەنجام دەدرێتو واقیعی نییە.
3. لەم شێوازەدا توێژەر دەتوانێت سوود لەهاوکاری کەسانیتر وەربگرێتو بۆ شـیکاری رەفتارە تۆمارکراوەکەو؛ دەرهێنانی جێگیری لەرێگای دوو شـیتەڵکار یان زیاترەوە.

**هەنگاوەکانی ئەنجامدانی تێبینیکردن:**

1. دیاریکردنی ئامانج: ئەبێت توێژەر بەوردی ئەو ئامانجە دەستنیشان بکات کە خوازیارە لەرێی تێبینیکردنەوە بەدی بهێنێت.
2. دیاریکردنی ژمارەی ئەو کەسانەی کە تێبینی رەفتاریان دەکرێت.
3. دیاریکردنی رۆژی تێبینیکردنو ئەو کاتەش کە پرۆسـەی تێبینی پێویسـتی پێیەتی، لەبەرئەوەی رەفتارەکانی مرۆڤ لەکاتێکەوە بۆ کاتێکیتر؛ گۆرانکاری بەسەردا دێت.
4. رێکخسـتنی هەلومەرجی شـوێنو ژینگەی پێویسـت بۆ ئەنجامدانی تێبینیکردن.
5. دیـاریکردنی ئەو بوارو چـالاکییـانەی کە پرۆسـەی تێبینیکردنەکە دەیانگرێتەوە.
6. تۆمارکردنی داتاو زانیارییەکان، پێویسـتە توێژەر تواناو ئەزموونی هەبێت لەوەرگرتنو دیاریکردنی ئەو بوارو بابەتانەی کە بۆ تێبینی دیاری کردوون.

لەم ئـامرازەی کـۆکـردنەوەی داتـادا، بـاشـتروایە کەسی تـێبـینەر بەبێ بەشداریکردن؛ تێبینی تۆمار بکاتو دورەپەرێز بێتو؛ لەهەموو لایەنگیرییەك داماڵراو بێت. کێشـەی سـەرەکی لەتێبینی کردندا؛ هاوسۆزیو لایەنگیرییە کە تەواوی پرۆسـەکە دەخاتە ژێر پرسـیارەوە، پێویسـتە تا ئەوپەری ئاسـت؛ سـنورداربکرێـت، ئەویش لەرێی هەڵبژاردنی تێبینەری کـاراو لێهـاتووی

مەشـــقپێکراوەوە، هەروەها باشـــترین ڕێگاش ئەوەیە کە زیاتر لەکەســێك بەپرۆســـەکە هەڵبســتێـت‌و؛ تۆمـاری بکەن‌و بەراوردو شــیکاری داتـا تۆمارکراوەکان بکەن‌و؛ هیچ کام لەو تێبینەرانەش زانیارییان لەســـەر ئامانج‌و گریمانەکانی توێژینەوەکە نەبێت.

**کەموکورتییەکانی تێبینیکردن زۆرن لەوانە:**

1. زۆربەی ئەو کەســـانەی کە هەســـت دەکەن لەچاودێری‌و تێبینیدان، ڕەفتاریان دەگۆڕن‌و خۆیان دەنوێنن.
2. پەیوەســـتە بەو کاتەوە کە تیایدا ڕوودەدات‌و؛ ڕەنگە نەتوانرێت وەکو پێویست پلان جێبەجێبکرێت.
3. هەنـدێك حـاڵەت هەیە؛ زەحمەتە بەم ڕێگایە داتاو زانیاری لەســەر کۆبکرێتەوە وەك ژیانی تـایبەتی تـاکەســـان‌و شـــێوازی بیرکردنەوەو دیدو بۆچوونەکان.
4. تێچوونی زۆرترە لەئامرازەکانیتری توێژینەوە.
5. هەندێکجار بوونی تێبینەری نامۆو نەناسراو ڕەنگە کاربکاتە ســـەر ڕەوتی ڕووداوەو لەسروشتیبوون؛ لایدەدات.

ئەشـــێت **تێبینیکردن بەبەشـــداری** (الملاحظـة بـالمشـــارکـة)و **بەبێ بەشـــداریکردنی توێژەر** ئەنجـام بـدرێـت. ئەمەش هەڵومەرجی ســـامپڵی توێژینەوەکە بڕیار دەدات کامیان پەیڕەو بکات. لەشێوازی **بەشـداریکردندا**؛ توێژەر ئەچێتە نێو کۆمەڵگەی توێژینەوەو شـــوناسی خۆی ئاشـــکرا ناکات‌و وەك یەکێك لەوان ڕەفتار دەکات‌و؛ پەیوەســـت ئەبێت بەداب‌ونەریت‌و کولتوریـانەوەو؛ بەبێ ئەوەی هیچ کەســـێـك لەو کۆمەڵگەیە بزانێـت ئەم کەســـە؛ بەمەبەســـتی توێژینەوە لەناویانـدایە، وەك توێژینەوەکانی زانـای بەنـاوبـانگی کۆمەڵنـاسی ئەمریکی (مـارگرێـت میـد Margaret Mead) کە لەســییەکانی ســەدەی بیســتەمدا؛ لەدورگە دووره دەســتەکانی غینیای نوێ ئەنجامیدان‌و چووە نێو هەرسێ کۆمەڵگە سـەرەتاییەکانی (ئارابش Arapesh

و مندۆگۆمۆر Mundugumorو چامبولی Tchambuli)یەوەو سەلماندنی کە خەسڵەتەکانی جێندەرییەکانی (کچانی بوونو کوڕانی بوون)ی هەردوو رەگەزی نێرومێ، بایۆلۆژی نینو پەیوەندییان بەکولتوری کۆمەڵگەوە هەیەو ئەکرێت بەگۆڕانکاری لەپەروەردەو شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ کچو کوڕدا؛ ئاڵۆگۆڕیان پێبکرێتو پێچەوانە بکرێنەوە.

بەڵام تێبینیکردن **بەبێ بەشداریکردنی توێژەر**، لەم شێوازەدا توێژەر بەشێوەیەکی فەرمیو بەسیفەتی توێژەر؛ ئەچێتە نێو کۆمەڵگەی توێژینەوەو شوناسی خۆی ئاشکرا دەکاتو خۆی دەناسێنێتو؛ ئامانجی توێژینەوەکەی باس دەکاتو، هەموو کەسێك لەو کۆمەڵگەیە دەزانێت کە ئەم کەسە بەمەبەستی توێژینەوە لەناویاندایە.

## مەرجو خەسڵەتە زانستییەکانی ئامرازی توێژینەوە

### بابەتیبوون

یەکێکە لەگرنگترین خەسڵەتەکانی ئامرازی توێژینەوەو؛ پێچەوانەی خوداگەراییە، واتە دیدو بۆچوونو ئارەزووی توێژەر بەسەر توێژینەوەکەوە نەبێت. پێویستە توێژینەوەی زانستی داماڵراو بێت لەهەموو دەمارگیریو تێڕوانینو بڕیارێکی تاکەسی. ئەبێت برگەو پرسیارو رێنماییەکانی وەڵامدانەوە؛ وەها دابڕێژرێن کە هەموو ئەندامانی سامپڵی توێژینەوە وەکویەك لێی تێبگەنو ماناکانیان بەیەك شێوە؛ راڤە بکرێنو لێکبدرێنەوەو لەرووی زمانەوانیەوە؛ دوو راڤەکردن هەڵنەگرێت.

ئەو فاکتەرانەی کاردەکەنە سەر بابەتیبوون زۆرن وەك پلەی رۆشنی، هەتا برگەو پرسیارەکانی ئامرازی توێژینەوە، رۆشنبن، ئاستی بابەتیبوون بەرز دەبێتەوە. هەروەها ئاستی تێگەشتنی لێکۆڵراو بۆ سروشتی ئامرازەکەو رێگای جێبەجێکردنو تۆمارکردنی وەڵامدانەوە. گرنگترین مەرجەکانی هێنانەدی بابەتیبوون؛ لێرەدا ئاماژەیان پێدەدەین:

1. پێویستە مەرجەکانی ئەنجامدانو ڕێنمایی‌و هەژمارکردنی نمرەکان بەوردی روون بکرێنەوە.
2. پێویستە کارڕاییەکانی پێوانە سادەو ئاسانبن بۆ ئەوەی ئەنجامی ورد بەدەستبهێنرێت.
3. هەتا دەکرێت کەرەستەو ئامێری نوێ بەکاربهێنرێت تاکو وردترین ئەنجام بەدیبێت.
4. پێویستە بەر لەجێبەجێکردنی هەر ئامرازێك، کلیلی راستکردنەوەی وەڵامەکان ئامادە بکرێت.
5. هاوپێچ کردنی ڕێنمایی وەڵامدانەوە لەگەڵ ئامرازەکەدا؛ بەمەبەستی ئاشناکردنی لێکۆڵراو بەشێوازی وەڵامدانەوە.

**راستیی** الصدق Validity:

ئەو برگەو پرسیارانەی کە لەئامرازی توێژینەوەدان، پێویستە تەنها ئەو دیاردەیە یان ئەو گۆڕاوە بپێون کە لەبنچینەدا بۆی ئامادەکراوە. ئەگەر برگەکانی پێوەرەکە تایبەتە بەپێوانەکردنی زیرەکی کۆمەڵایەتییەوە، ئەبێت هەر زیرەکی کۆمەڵایەتی بپێوێت نەك گۆڕاوێکیتر. راستیی بریتیە لەتوانای ئامرازی توێژینەوە بۆ پێوانەکردنی ئەو دیاردەیەی، کە بانگەشەی پێوانەکردنی بۆ دەکات.

پێوانە لە زانستە سروشتییەکاندا راستەوخۆ وردو بابەتییەو؛ هەر مادەیەك یەکەی پێوانەی خۆی هەیە (مەتر، لیتر، گرامو...هتد)، مەتر کە بۆ پێوانەی درێژیو پانییە، مادەکە بەرجەستەیەو بەئاسانی دەپێورێت، بەڵام لەدیاردە مرۆییو کۆمەڵایەتییەکاندا، پێوانەکردن ئاسان نییەو توێژەر ناڕاستەوخۆ لەرێی ئامرازێکەوە ئەنجامی دەدات، کە بریتیە لەکۆمەڵێك برگەو پرسیارو پێیوایە دیاردەکەی بۆ دەپێون، رەنگە برگەو پرسیارەکانی توێژەر ئەو دیاردەیە

نەپێون کە مەبەستیەتی. ئەم دڵنیابوونەش لەرێی دەرهێنانی راستی ئامرازی توێژینەوەکەوە، ئەنجام دەدرێت.

**رێگاکانی دەرهێنانی راستی:**

راستی لەئامرازی توێژینەوەدا چەند جۆرێکی هەیە، لێرە تەنها ئاماژە بەسیانیان دەدەین ئەوانیش:

**یەکەم: راستیی رواڵەتی**

مەبەست لەراستی رواڵەتی ئامرازی توێژینەوە، ئایا ئامرازەکە لەرووکەش‌و رواڵەتدا، تاچەند دیاردەکە ئەپێویت، بۆ ئەو مەبەستەش برگەو پرسیارەکان، پشانی چەند کەسێکی پسپۆڕو شارەزای بوارەکە ئەدرێت، بۆ ئەوەی رای خۆیان لەسەر یەکەبەیەکەی بە (باش و خراپ‌و هەموارکردن) دەربڕن.
لێرەدا پێویستە ئەم خاڵانە رەچاو بکەین:

1. هەتا ژمارەی پسپۆڕەکان زۆرتر بێت؛ لەرووی زانستییەوە باشترە.
2. دەبێت لە بوارەکەدا پسپۆڕبن، یاخود پسپۆڕییەکەیان نزیك بێت لەپسپۆڕی بوارەکەوە.
3. هەتا پلەی زانستی پسپۆڕان بەرز بێت، باشترە.
4. ئەبێت ژمارەی پسپۆڕەکان تاك بێت، بۆ ئەوەی رای زۆرینەو کەمینە دەربهێنرێت. ئەگەر زۆرینە بەباشی دانا، ئەوا برگەکە دەمێنێتەوەو ئەگەر بەخراپیان دانا، ئەوا دوور دەخرێتەوە.

**دووەم: راستیی ئەزموونی**

مەبەست لەم جۆرە بوونی بەڵگەی کرداری یان ئەزموونییە کە ئامرازەکە ئەو دیاردەیە دەپێوێت کە لەبنچینەدا بۆ پێوانەکردنی ئامادەکراوە. لێرەدا پەنادەبرێتە بەر ئامرازێکی دەرەکی سەربەخۆ کە بۆ پێوانەکردنی هەمان دیاردە کەسانیتر ئامادەیان کردووەو راستی‌و جێگیرییان بۆ دەرهێناوە. ئەوکاتە توێژەر ئەنجامی ئامرازەکەی خۆی لەگەڵ ئەنجامی ئامرازە دەرەکییەکەدا بەراورد

دەکاتو هاوکۆلکەی پەیوەستبوون لەنێوان هەردوو ئەنجامەکەدا دەدۆزێتەوە. ئەگەر پەیوەستبوونەکە پۆزەتفو بەهێزبوو واتا لە(0.60) زیاتربوو، ئەوا بۆی دەردەکەوێت کە ئامرازی توێژینەوەکەی راستی تێدایە، ئەگەر پەیوەستبوونەکە لاوازبوو، مانای وایە بەهای راستی بێ هێزەو؛ ئەبێت بەدوای چارەسەردا بگەرێتو بیدۆزێتەوە.

**سێیەم: راستیی وەرگێڕان**

زۆرجار توێژەران بۆ کۆکردنەوەی داتاو زانیاری، پەنادەبەنەبەر ئامرازێکی ئامادەکراو، بەو مەرجەی ئەو ئامرازە تەواوی خەسڵەتە زانستییەکانی تێدا بێت، رەنگە ئەو ئامرازە پێوەرێکی جیهانی بێتو بۆ زمانە زیندووەکان وەرگێڕدرا بێتو؛ لەلایەن توێژەرانی نەتەوە جیاوازەکانەوە بەکارهێنرابێت. گریمان توێژەرێکی کورد کە ئەندامانی سامپڵەکەشی کوردن، پێوەری زانایەکی بەناوبانگی دەستکەوتووەو لەتوێژینەوەکەیدا بەکاریدەهێنێتو پێوەرەکەش؛ بەزمانی ئینگلیزی نووسراوە. لەم حاڵەتەدا پێویستە راستی وەرگێڕان بۆ پێوەرەکە دەربهێنێتو ئەم هەنگاوانە بگرێتەبەر:

**یەکەم**: سەرەتا ئەبێت وەرگێڕێکی یاسایی پسپۆڕ؛ شارەزا لەهەردوو زمانی کوردیو ئینگلیزیدا، پێوەرە رەسەنو ئۆرجیناڵەکەی؛ لەزمانی ئینگلیزییەوە بۆ وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی.

**دووەم**: لەم قۆناغەدا پێویستە پسپۆڕێکی زمانی ئینگلیزی کە ئەبێت شارەزای هەردوو زمانی کوردیو ئینگلیزی بێت (نابێت هەمان ئەو کەسە بێت؛ کە پێشتر پێوەرەکەی لەئینگلیزییەوە بۆ کردووە بەکوردی). ئەبێت وێنەیەکی کوردی پێوەرەکە؛ سەرلەنوێ وەربگێڕێتەوە سەر زمانی ئینگلیزی.

**سێیەم**: لەم قۆناغەدا هەردوو وێنەی پێوەرەکە کە بەزمانی ئینگلیزین (یەکەم ئۆرجیناڵەکەو دووەم ئەوەی لەکوردییەوە کراوە بەئینگلیزی)، بەمەبەستی بەراوردکردن؛ بدرێن بەپسپۆڕێکی زمانی ئینگلیزی، باشتروایە ئەم پسپۆڕەش

هیچ کام لەو دوو پســپۆڕەی پێشــوو نەبێت. خۆئەگەر بۆی دەرکەوت کە هەردوو وێنە ئینگلیزییەکە؛ زۆر لەیەك دەچن‌و لەڕووی مـانـاوە؛ هیچ جیاوازییەکیـان نییە، ئەو کاتە توێژەر ئەتوانێت وێنە کوردییەکە بەســەر ســامپڵی توێژینەوەکەیدا دابەش بکات. بەڵام ئەگەر جیاوازی زۆر لەنێوان هەردوو وێنە ئینگلیزییەکەدا هەبوو، توێژەر ناچارە جارێکیتر هەمان پرۆســە ئەنجام بداتەوەو؛ پەنا بەرێتەبەر پسپۆڕیترو بەهەر سێ قۆناغەکەی پێشوودا بڕواتەوەو سەرلەنوێ جێبەجێیان بکاتەوە.

**جێگیری** الثبات Reliability

یەکێك لەخەســڵەتە بنەڕەتییەکانی ئامرازەکانی توێژینەوەو کە پێویســتە بەرلەوەی ئامرازەکە پراکتیزەو جێبەجێ بکرێت؛ دڵنیابین لەبوونی، خەسڵەتی جێگیرییە. بایەخی پێوانەکردنی نمرەی جێگیری ئامرازی توێژینەوە؛ لەوەدایە کە هەر کاتێك بەکارمانهێنا، هەمان ئەنجامەمان پێبداتەوە. ئەو ئامرازەی کە ناجێگیرەو هەر جارەو ئەنجامێکمان بەدەســتەوە دەدات، ناکرێت پشــتی پێببەســتین‌و بڕوا بەئەنجامەکانی بکەین‌و؛ توێژینەوەکەش جێگای گومانەو تەنها بەفیڕۆدانی کات‌و تێچوون‌و ماندووبوونەو هیچیتر. بۆیە جێگیریی بەو مـانـایە دێـت کە ئـامرازەکە (چـاوپێکەوتن، فۆرمی ڕاپرسی، پێوەرو تێبینی‌و تێســتەکـان) چەنـدجـار لەگەڵ هەمـان گروپ‌و ســـامپـڵ‌و؛ لەهەمـان هەلومەرجدا، جێبەجێ بکرێت، ئەبێت هەمان ئەنجام بەدەســتەوە بدات. چەمکی جێگیری بەو واتایە دێت کە ئامرازەکە هەمیشــە بتوانێت هەمان ئەنجام بەدیبهێنێت ئەگەر دووجار بەسەر هەمان گروپدا جێبەجێبکرێتەوە.

**ڕێگاکانی دەرهێنانی جێگیری:**

توێژەر بەچەند ڕێگەیەك دەتوانێت بەهای جێگیری ئامرازی توێژینەوەکەی بدۆزێتەوە، گرنگترین ڕێگاکانیش ئەمانەن:

**یەکەم: ڕێگەی دووبارە کردنەوە**

لەم ڕێگەیەدا ئامرازی توێژینەوەکە، دووجار بەسەر هەمان سامپڵدا، جێبەجێدەکرێتەوە. بەمەرجێك ماوەی زەمەنی نێوان هەردوو تاقیکردنەوەکە؛ لەسێ هەفتە کەمتر نەبێت، چونکە لەو ماوەیەدا؛ کەسەکە لەیادی دەچێت، پرسیارو برگەکانی فۆرمەکەی چۆنو بەچ شێوەیەك وەڵامداوەتەوە. ئەمەش بۆ ئەوەیە فاکتەری یادەوەری کەسەکە؛ ڕۆڵی لەجێگیری وەڵامەکانیدا نەبێت.

مەرج نییە ژمارەی ئەندامانی سامپڵی جێگیری بەقەد ژمارەی سامپڵی توێژینەوەکە بێت. ئەشێت کەمتریش بێت بەڵام باشتروایە ژمارەی سامپڵی جێگیری لە(40 - 60) ئەندام کەمتر نەبێت، دیارە هەتا زۆریش بێت؛ باشترە.

ئەبێت توێژەر لەهەردوو تاقیکردنەوەدا، هەمان هێما یان ژمارە؛ بۆ هەر ئەندامێکی بەشداربوو لەسامپڵی جێگیریدا دابنێت، تاکو لەچارەسەری ئاماریدا کاریان لەسەر بکات. بۆ نموونە بەشداربوویەك کە ناوی (یاد)ە، لەتاقیکردنەوەی یەکەمدا؛ ژمارە (1) پێدراوە، لەتاقیکردنەوەی دووەمیشدا ژمارە (1)ی پێدەدرێتەوەو بەمحۆرە بۆ هەموو ئەندامەکانیتری سامپڵی جێگیری.

پاشان لەڕێی ئامارەوە؛ هاوکۆلکەی پەیوەستبوون لەنێوان هەردوو وەڵامەکەدا دەردەهێنرێتو بەپێی بەهاکەی بڕیاری بەسەردا دەدرێت. خۆئەگەر بەهای پەیوەستبوونەکە (+1) بوو، ئەوە مانای وایە، وەڵامی کەسەکان لەهەردوو تێستەکەدا سەدلەسەد وەکو یەکنو هیچ گۆڕانێکی بەسەردانەهاتووە. بەڵام ئەگەر (-1) بوو، لێرەدا وەڵامەکانیان لەسەداسەد، پێچەوانەی یەکترن. هەتا هاوکۆلکەی پەیوەستبوونەکە بەرز بێت؛ ئاماژەیە بۆ جێگیری ئامرازی توێژینەوەکە. بەگشتی بەلای شارەزایانەوە ئەگەر

بەهاکە (0.60)بوو ئەوا پەســـەندەو خۆئەگەر بەرەوژوو دەربچێت واتا (0.75، 0.80)و ئاماژەیە بۆ زیاتر جێگیریی ئامرازی توێژینەوە.

**دووەم: ڕێگەی بەنیوەکردن** التجزئة النصفية:

ئەگەر بەم ڕێگایە بەهای جێگیری دەربهێنرێت، پێویســـتە گونجاوی ناوەکی لەنێوان بڕگەکانی ئامرازی توێژینەوەکە (فۆرمی ڕاپرسی، پێوەرو تێســـتەکان) هەبێتو؛ هەموویان لەنێو یەك بواردابن. دوای ئەوەی فۆرمەکە دەدرێت بەئەندامانی ســـامپڵی توێژینەوەو؛ ئەوانیش وەڵامی ســـەرجەم بڕگەکانی دەدەنەوە، پاشـــان ئەبێت، بڕگەکان؛ بکرێت بەدوو بەشـــەوە، گروپێکیان هەموو ئەو بڕگانەی کە ژمارەکانیان تاکە (1،3،5،7،9،....هتد)و گروپەکەیتریش هەموو ئەو بڕگانەی کە ژمارەکانیان جووتە (2،4،6،8،10....هتد). پاشان لەڕێی ئامارەوە؛ هاوکۆلکەی پەیوەستبوون لەنێوان بڕگە تاكو بڕگە جووتەکاندا؛ دەردەهێنرێتو بەپێی بەهاکەی بڕیاری بەسەردا دەدرێت.

**سێیەم: ڕێگەی وێنە هاوتاکان** الصور المتكافئة

لەم ڕێگەیەدا دوو وێنە لەئامرازی توێژینەوەکە (فۆرمی ڕاپرسی، پێوەرو تێستەکان) دروست دەکرێت کە ناوەڕۆکدا وەکو یەکبنو؛ لەشێوەو فۆرمدا جودابن، بەمەبەستی پێوانەکردنی هەمان دیاردە. هاوکات هەردوو فۆرمەکە کە لەشـــێوەدا جیاوازن، دەدرێت بەئەندامانی ســـامپڵی توێژینەوەو ئەوانیش وەڵامی هەردووکیان دەدەنەوە. پاشـــان لەڕێی ئامارەوە هاوکۆلکەی پەیوەستبوون لەنێوان هەردووکیاندا دەردەهێنرێتو؛ بەپێی بەهاکەی بڕیاری بەسەردا دەدرێت.

**چوارەم: ڕێگای کۆدەر- ڕیچاردسۆن**

لەم ڕێگایەدا بڕگەکانی ئامرازەکە (فۆرمی ڕاپرسی، پێوەرو تێســـتەکان) زیاتر لەجارێك بۆ دوو نیوە؛ دابەش دەکرێت، هەر جارەو بەڕێگایەکی جیاواز.

پاشـــان دواتر هـاوکۆلکەی پەیوەسـتبوون لەنێوان هەردوو نیوەکەدا دەردەهێنرێت، ئەکرێت برگەکانی ئامرازەکە بەسـەر چەند بەشـێکدا (زیاتر لەدوو بەش) دابەش بکرێتو بەو مەرجەی هەر بەشـە تەوەرێك بێتو؛ لەناو برگەکانی هەر تەوەرێکیشـدا لێکچوونی ناوەکی هەبێت. لەم رێگایەدا بەهای جێگیری بەپێی چەند هاوکێشـەو یاسـایەك دەردەهێنرێن (کۆدەر-ریچاردسـۆن سـاڵی 1937دایانرشـتن‌و دیارتینیان یاسـای 20 و21ی کۆدەر-ریچاردسۆنە) بەهۆیانەوە گونجاوی ناوەکی لەنێوان رەهەندو دەستەواژەکانی ئامرازەکاندا هەژماردەکرێن. ئەو هاوکێشـانەش لەزۆربەی کتێبو سـەرچاوە زانسـتییەکانی ئـامـاردا، ئـامـاژەیان بۆ کراوە، هەروەها دەکرێت پشـت بەکۆمپیوتەر ببەسـترێـت؛ لەرێی پرۆگرامی پـاکێجی ئـامـاریی زانسـتە کۆمەڵایەتییەکانەوە (SPSS)وە.

## پەیوەندی نێوان راستیو جێگیری

راسـتی؛ جێگیریش لەخۆ دەگرێتو روویەکە لەرووەکانی. راسـتی گشـتگیرترە لەجێگیری، چونکە جێگیری ئـامرازی توێژینەوە بەڵگە نییە بۆ راسـتی ئامرازەکە، رەنگە نمرەی تاکەکەسـەکان وەك خۆی بێتو گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسـەردا نەیەت بەڵام نمرەکەیان راسـت نەبن‌و ئەو دیاردەیە یان ئەو بوارە نەپێوێت کە لەبنچینەدا ئامرازەکەی بۆ ئامادەکراوە. بۆیە دەکرێت بڵێین: هەموو ئامرازێکی راسـت؛ بەزەرورەت جێگیریشـە. ئەگەر فۆرم یان پێوەری راسـت ئەوە بپێوێت کە پێویسـتە بیپێوێتو؛ بەوردی گوزارشـت لەئەدای راسـتەقینەی تاکەکەس بکات، ئەوا لەهەمان کاتدا جێگیریشـە. بەڵام فۆرم یان پێوەری جێگیر مەرج نییە بەزەرورەت راسـت بێتو؛ رەنگە ئەرکێکیتر جێبەجێ بکات نەك ئەو ئەرکەی کە پێویستە جێبەجێی بکات.

## نووسینی توێژینەوە

دوای ئەوەی توێژەر سەرجەم ڕێکاری و هەنگاوەکانی توێژینەوەکەی تەواو دەکات؛ چاوەڕوان دەکرێت بەشێوەیەکی بابەتی و ڕێکخراو و پشتبەست بەسەرچاوەی زانستی؛ توێژینەوەکەی بنوسێتەوەو پێشکەش بەو لایەنەی بکات؛ کە توێژینەوەکەی بۆ ئەنجامداوە. ئەگەر خوێندکارە؛ ئەوا پێشکەش بەو بەشە زانستییەی دەکات کە بەمەبەستی وەرگرتنی بڕوانامەیەك (دبلۆم، بکالۆریۆس، ماستەر، دکتۆرا) تیایدا دەخوێنێت. وەك نەریتێك هەر زانکۆو دامەزراوەیەکی زانستیش لەناملیکەیەکدا، مەرج و ڕێنماییەکانی؛ چۆنێتی نووسینەوەی توێژینەوەی زانستی تایبەت بەخۆی هەیەو بڵاوی کردۆتەوەو؛ ڕەنگە ساڵانەش گۆڕانکاری بەسەردا بهێنێت. بەڵام چەندین بنەمای گشتی هەیە کە پێویستە توێژەر؛ پێیانەوە پەیوەست بێت و؛ لەزۆربەی ناوەندە ئەکادیمییەکاندا؛ پەیڕەو دەکرێت و؛ وەك کارنامەی نووسینی توێژینەوەی زانستی لێهاتووەو؛ لەکاتی لەهەڵسەنگاندنی توێژینەوەدا؛ لەلایەن لیژنەی تاوتوێوە؛ بەهەند وەردەگیرێن و دواجار کاریگەرییان بەسەر کوالیتی توێژینەوەو بڕیاری لیژنەکەوە ئەبێت. لێرەدا لەسەر ئەو بنەما گشتییانە دەدوێین:

**یەکەم: زمانی توێژینەوە**

1. توێژینەوە بۆ کۆمەڵانی خەڵك نانووسرێت؛ بۆ لایەنی پسپۆڕو تایبەتمەند دەنووسرێت؛ زمانی دارشتنی تێکست و ناوەڕۆکەکەی؛ جیایە لەو زمانەی کە لەڕۆژنامەو گۆڤاری جەماوەریدا بەکاردێت. وەکچۆن جیایە لەپەخشان و چیرۆك و هەر ژانرێکی ئەدەبی. ڕستەو دەستەواژەکانی زمانی توێژینەوەی هەر بوارێکی زانست؛ ئاراستەی پسپۆڕانی تایبەتمەند دەکرێت و؛ بەسەرچاوە پشتئەستورەو؛ خشتەو وێنەو شێوەو هێڵکاری و هاوکێشەی لەخۆگرتووەو؛ دووره لەو زمانەی ئاوێتەیە بەئەندێشەو خودگەرایی و مانای نێو دڵی شاعیر.

2. لەتوێژینەوەدا؛ چەمکەکانی (من) یان (ئێمە) پەسەندکراو نین و؛ ئاماژەن بۆ فیزو خۆبەگەورە زانین، هەردەم چەمکی (توێژەر) یان (توێژەران) بەکاردەهێنرێت.

3. دیارە توێژینەوە تەواو کراوە ئینجا دەنووسرێتەوە؛ بۆیە زەمەن لەتەواوی بەشەکانی توێژینەوەدا؛ رابردووەو هەمیشە توێژەر باسی ئەو هەنگاوو رێکارییانە دەکات کە ئەنجامیداون. بۆ نموونە دەنووسێت: توێژەر (300) خوێندکاری بەسامپڵ وەرگرتووە، نەك (300) خوێندکار بەسامپڵ وەردەگرێت.

4. زمانی توێژینەوە بایەخی گەورەی هەیە لەگەیاندنی پەیامەکانی توێژەردا، پێویستە توێژەر لەووشەکاری و ئیدیۆم و جوانکاری و زاراوەی بێگانەو داتاشراوو نەشیاوەکان؛ دوور بکەوێتەوە. ئەبێت زمانەکەی؛ روون و راشکاو بێت و تەمومژو ئاڵۆزی پێوە دیارنەبێت، ئەمەش پەیوەندی بەپاشخانی زمانەوانی توێژەرەوە هەیە تاچەند بەدواداچوونی هەیەو دەخوێنێتەوەو ئاگاداری زاراوەو چەمك و ووشەو هاوواتاکانی؛ زمانی بواری توێژینەوەکەیەتی.

5. پێویستە توێژەر؛ خۆی لەبڕیاری رەهاو شێوازی زیادڕەوی بپارێزێت، ووشەکانی: هەرگیز؛ بەتەواوەتی، هەمیشەو ...هتد بەکارنەهێنێت و لەجێگەی ئەوانە: رەنگە، لەوانەیە، وەك ئاشکرایە، ئەتوانین بڵێین...هتد، بەکاربهێنێت.

6. لەهێنانی دەق و تێکستەو؛ تەنانەت لەناو سەرجەم برگەو پەرەگرافەکانی توێژینەوەدا، نابێت پرۆسەی خاڵبەندی فەرامۆش بکرێت و؛ پێویستە بەوردی کاریان لەسەر بکرێت بەتایبەتیش ئەم ئاماژانە:

- خاڵ (.): لەکۆتایی هەموو رستەیەکی تەواودا؛ بەکاردەهێنرێت.
- کۆما (،): لەنێوان دوو رستەدا بەکاردەهێنرێت کە لەڕووی ماناوە بەیەکەوە پەیوەستن. یاخود لەنێوان ووشە هاوواتاکان و؛ خەسڵەتە دووبارەکان، یان لەدوای ووشەی بەڵێ و نەخێر.

• کۆماو خاڵ (؛): لەو کاتەدا بەکاردەهێنرێت کە هێشـــتا مانای رســـتەکە تەواو نەبووەو؛ زیاتر لەنێوان بەشـــەکانی رســـتەی درێژدا دادەنرێت. یان لەنێوان دوو رستەدا کە رستەی دووەم هۆکار بێت بۆ رستەی یەکەم.

• دووخاڵ لەســـەر یەك (:): بۆ روونکردنەوەو جیاکردنەوەیە، زیاتر لەدوای ئەم چەمكو دەستەواژانەوە بەکاردێت (بریتیە: ووتی: بۆ نموونە: ... هتد).

• دووخاڵ لەســـەر یەكو هێڵێك (:-): لەدوای دەســـتەواژەی مەرجدارەوە بەکاردێت. بۆ نموونە:

رەفتاری مرۆڤ لەم رەگەزانەی خوارەوە پێکهاتووە:-

هەڵچوونی، جوولەیی، عەقڵی.

• کورتە هێڵ (-): لەسەرەتای دێڕدا. بۆ نموونە:

- بەشی یەکەمی توێژینەوەکەت تەواو کردووە؟.

- بەڵێ، گەیشتوومەتە کۆتایی و چەند دێڕێکی کەم ماوە.

یـاخـود لەنـێوان بڕێردراوەکـان، دوو ژمـارە، دوو پیـت بەکـاردهێنرێـت (34 - 35)، (ج - ح).

• سێ خاڵ (...): لەکاتی ئامارەدان بەچەنـد بەشو لایەنێك دادەنرێت؛ کە هەندێکیان بنوسرێتو پێویســـت بەنووســـینی ئەوانیتر نەکات. بۆ نموونە: هۆکارەکان بریتین لە: ئابوری، کۆمەڵایەتی، تەندروستیو ... هتد.

7. لەکاتی وەرگرتنی دەق لەسـەرچاوەوە: ئەگەر بەبێ دەسـتکاریو دەقاودەق وەرگیرابێـت ئەو دەقەکە دەخرێتە نێوان دوو جووت کەوانەی بچووکەوە ("............") بەڵام ئەگەر دەســـتکاری کرابوو، ئەوا لەکاتی نووســـینیدا؛ کەوانەی ناوێت.

## دووەم: ڕێکخستنی بەشەکانی توێژینەوە

هەر توێژینەوەیەکی زانســـتی کە تایبەتە بەبابەتێکی دیاریکراوەوە؛ پەڕەکانی بەسەر چەند بەشێکدا دابەش دەکرێت‌و؛ پێویستە یەکێتی بابەت؛ بەسەر تەواوی بەش‌و پەڕەکانیەوە بەدیبکرێت. ئەگەر توێژینەوەکە؛ تیۆری‌و پراکتیکی بوو (وەك زۆربەی زۆری ئەو توێژینەوانەی کە لەزانکۆو پەیمانگاو ناوەندە ئەکادیمییەکانی هەرێمی کوردســـتاندا؛ ئەنجامدراون‌و دەدرێن)، ئەبێت ئەم خاڵانە ڕەچاو بکرێت:

1. هاوسەنگی لەنێوان لایەنی تیۆری‌و پراکتیکیدا هەبێت‌و؛ باشتروایە ژمارەی پەڕەی هەردوو لایەنەکە، لەیەکەوە نزیکبن.
2. هاوســـەنگی لەنێوان بەشـــەکان هەبێت‌و؛ باشـــتروایە ژمارەی پەڕەی بەشـــەکان لەیەکەوە نزیك بن، نەك بەشـــێك (70)پەڕە بێت‌و بەشـــێکیش (14) پەڕە بێت.
3. نابێت بۆشـــایی لەنێوان لاپەڕەکانی بەشـــێکدا هەبێت، واتا تەواوی لاپەڕەکان پڕ بکرێنەوە.
4. باشـتروایە هەموو زیادەیەك لەناوەڕۆکی بەشـەکانی توێژینەوەدا؛ لاببرێت‌و دوور بخرێتەوە. زۆری ژمارەی لاپەڕەکانی توێژینەوە؛ ئاماژە نییە بۆ باشی‌و کوالێتی‌و بەرزی ئاســـتی توێژینەوەکە، بەڵکو ئاماژەیە بۆ بێ توانایی توێژەر لەهونەری پوختکردنەوەو؛ جیاکردنەوەی گرنـگ لەگرنگترو؛ گرنگتر لەگرنگترین. ڕاســـتە هەموو بوارە زانســـتییەکان وەك یەك نین‌و ڕەنگە لەهەندێك بواری زانســـتدا (وەك مێژوو) ژمارەی پەڕەی توێژینەوەکانیان لەبوارەکانیتر؛ زیاتر بێت، ئەویش بەهۆی زۆری بەڵگەنامەو دۆکیومێنت‌و ســـەرچاوەی بەکارهاتووەوە. ئەمڕۆ لەزانکۆ پێشـــکەوتووەکانی جیهاندا؛ ژمارەی پەڕەکانی ماســـتەرنامەو تێزی دکتۆرا، لەنێوان (15 - 25) پەڕەدایەو؛ کەچی توێژەران لەزانکۆکانی هەرێمدا؛ شانازی بەئەستووری‌و (350)و (450)

لاپەڕەی؛ توێژینەوەکانیانەوە دەکەن. ئەمەش لەکاتێکدایە کە زۆرینەی زۆری پەڕەکان لەسەرچاوەوە هێنراون بەرهەمی ڕەنجی کەسانیترن‌و؛ خزێنراونەتە بەشە تیۆرییەکانەوە.

5. ئەگەر لەتوێژینەوەدا خشتەو شێوەو هێڵکاری‌و نەخشەو وێنە، هەبوون. پێویستە هەر یەکێك لەوانە ژمارەو ناونیشانیان بۆ دابنرێت‌و بەپێی دەرکەوتنیان؛ ڕیزبەند بکرێن‌و لەتەواوی توێژینەوەدا بەیەك زنجیرە؛ ژمارە وەربگرن، نەك بەپێی بەشەکانی توێژینەوەکە ژمارەیان پێبدرێت. واتا یەکجار خشتەی ژمارە (1)و یەکجار خشتەی ژمارە (2) هەیە، نەك لەهەر بەشێکدا، خشتەکان ژمارەیان هەبێت‌و چەند خشتەیەك؛ ژمارەیان وەك یەك وابێت، یا بەشەکانیش جیاوازبن. شێوەو هێڵکاری‌و نەخشتەو وێنەش بەهەمان ڕێسا بەیەك زنجیرە؛ ژمارەیان پێدەدرێت. تەنها بۆ خشتەکان؛ ژمارەو ناونیشانی خشتە لەسەروو خشتەکەوە دادەنرێت. بۆ ئەوانیتر؛ ژمارەو ناونیشان لەژێریاندا دادەنرێت‌و دەنووسرێت.

6. وەکچۆن بابەتەکان پێڕستیان بۆ دەکرێت، هەر بەوجۆرە پێڕست بۆ خشتەو شێوەو هێڵکاری‌و نەخشتەو وێنەو پاشکۆش دەکرێت، هەریەکەیان بەجیا لەدوای پێڕستی بابەتەکانەوە دادەنرێن. ئەبێت لەپێڕستی خشتەدا (ژمارەو ناونیشان‌و لاپەڕە) هەبێت. هەروەها شێوەو هێڵکاری‌و نەخشتەو وێنەو پاشکۆش، بەهەمان شێوە لەپێرستدا جێگیر دەکرێن. بەم جۆرەی خوارەوە :

پێڕستی خشتەکان

| ژمارەی خشتە | ناونیشانی خشتە | لاپەڕە |
|---|---|---|

7. لاپەڕەکانی توێژینەوە لەپێشەکییەوە ژمارە وەردەگرن (لەهەندێك بەشی زانستیدا لەجیاتی پێشەکی؛ پوختەی توێژینەوە دادەنرێت)، یاخود لەبەشی یەکەمەوە؛ ژمارەیان بۆ دادەنرێت‌و؛ پاشکۆکانیش ژمارە وەردەگرن‌و بەشێکن

لەتوێژینەوە. ژمارەش لەبەشی ســەرەوەی پەڕە؛ لای چەپەوە دادەنرێت. ئەمەش بۆ جیاکردنەوەی توێژینەوەیە لەکتێبو گۆڤارو هەر بڵاوکراوەیەکیتر. بەڵام پەڕەکانی ســەرەتا بەپیتی رۆمانی یان عەرەبی؛ زنجیرە دەکرێنو؛ لەبەشی خوارەوەی پەڕەو لەناوەڕاستیدا؛ دەنووسرێت.

**سێیەم: رێکخستنی سەرچاوەکان**

هەر بڕگەو پەرەگرفێك لەســەرچاوەوە؛ وەرگیراو لەتوێژینەوەدا بەکارهێنراو دانرا، پێویستە ئاماژە بەسەرچاوەکەی بکرێت. ئەگەر توێژینەوەکە بەزمانی کوردی یان عەرەبی نووسرایەوە، ئەوکاتە رێکخســتنی ســەرچاوەکان؛ بەپێی پیتی عەرەبی هیجائی (أ، ب، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ، ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ف، ق، ك، ل، م، ن ، ه، و، ي) ریزبەند دەکرێن. ئەگەر وەها ریزکرا، ئەوا پێویست ناکات ژمارە بۆ سەرچاوەکان دابنرێت.

بۆ ئاماژەدان بەسەرچاوە، دوو شێوازی باو هەیە، پێویستە توێژەر یەکێکیان هەڵبژێرێتو نابێت لەتوێژینەوەکەیدا، بەشێك لەسەرچاوەکان بەشێوەی یەکەمو بەشەکەیتریش بەشێوەی دووەم بنوسێت. دوو شێوازەکەش ئەمانەن:

**یەکەم: شێوازی کۆن:** لەم شێوازەدا لەنێو دێرەکانی دەقو پەرەگرافەکاندا ئاماژەیەك دادەنرێت؛ جا ئەستێرە (*) یاخود ژمارە بێت، لەپەراوێزی لاپەڕەکەشدا، واتا بەشی خوارەوەی لاپەڕەکە؛ سەرچاوەی دەقەکە دەنووسرێت.

**دووەم شێوازی نوێ:** ئەم جۆرەیان شێوازی ئەمریکی (هارڤارد)ی پێدەوترێت. هەر بڕگەو پەرەگرافێك لەسەرچاوەوە وەرگیراو لەتوێژینەوەدا بەکارهێنرا، راستەوخۆ لەجێگای خۆیدا؛ ئاماژە بەسەرچاوەکەی دەکرێت بەم شێوەیە: (ناوی نووسەر، ساڵ: لاپەڕە). بۆ نموونە: (بۆکانی، 2008: 22). بەڵام ئەگەر نووسەرێك لەساڵێکدا دوو کتێبی هەبوو، لەم حاڵەتەدا،

پیتەکانی (أ، ب) بەزنجیرە دەخرێتە دوای ناوی نووسەرەکەوە، گریمان نووسەرەکەی پێشوو دوو کتێبی لەساڵی (2008)دا هەبوو، بەمجۆرە ئاماژەی بۆ دەکرێت: (بۆکانی،أ، 2008: 22). (بۆکانی، ب، 2008: 29).
ئەوەی گرنگە، جۆری سەرچاوەکە نییە، بەڵکو ئاستو پێگەو ناوبانگی زانستی؛ نووسەرەکەیە کە بەشێك لەبابەتەکەی وەرگیراوەو؛ توێژەر بۆ توێژینەوەکەی سوودی لێوەرگرتووە. لەدوای ئەمەوە؛ ئاستو بایەخی سەرچاوەکە دێت. کتێبو تێزی دکتۆراو ماستەرنامەو بڵاوکراوەو گۆڤاری زانستیو رۆژنامە، ئێنتێرنێتو وانەووتار (محاضرة)... هتد. ئەو سەرچاوانەن کە لەتوێژینەوەدا کەڵکیان لێوەردەگیرێن.
زمانی نووسینی سەرچاوە دەستکاری ناکرێتو وەك خۆی دادەنرێت، بەهەر زمانێك نووسرا بوو، پێویستە لەنێو تێکستەکانی سەرجەم بەشەکانو؛ لەلیستی سەرچاوەکانی توێژینەوەدا؛ بەهەمان زمان بنوسرێتەوە، کوردی بەکوردی، عەرەبی بەعەرەبیو فارسی بەفارسی.
سەبارەت بەمێژووی نووسینی سەرچاوە (کۆنو نوێ)، ئاشکرایە ئەو توێژینەوانەی کە وەردەگیرێن هەتا نوێ بن باشترەو تازەترین داتاو زانیارییان لەخۆ گرتووە. ئەمەش بەو مانایە نایەت کە توێژینەوەی کۆن؛ هیچ کەڵكو بایەخێکیان نییە. بەڵام رەنگە بۆ کتێب ئەم بۆچوونە بەتەواوەتی راست نەبێت، چونکە بابەتەکانی نێو زۆربەی کتێبە نوێیەکان؛ دووبارە کردنەوەی ئەو بابەتانەن کە لەکتێبە کۆنەکاندان بەتایبەتیش ئەگەر نووسەری کتێبە کۆنەکان زاناو شارەزاو پسپۆڕە بەناوبانگەکان بن. بۆیە کۆنیو نوێی سەرچاوە؛ بەهێندەی ناوو ناوبانگی زانستی نووسەر گرنگ نییە.
لەهەندێك حاڵەتدا ئەگەر سەرچاوەکە مێژووی بڵاوکردنەوەی تێدا نەبوو، دەنووسین (ب. م.) واتا بێ مێژوو، بەعەرەبیش (د. ت.) واتا (دون تأريخ). ئینگلیزیش (n.d.) دەنووسرێت. خۆئەگەر سەرچاوەکە دەزگای

بڵاوکردنەوەی تێدا نەبوو، دەنووســـین (ب. د.) واتا بێ دەزگای بڵاوکردنەوە. بەعەرەبیش (د. ن) واتا (دون ناشر). بەئینگلیزیش (n.p.) دەنووسرێت.
لەتوێژینەوەی دەرچوونی بکالۆریۆس‌و ماســـتەرنـامەو تێزی دکتۆرادا، هەنـدێکجـار تەواوی ســـەرچـاوەکـان بەدوای یەکـدا دەنووسرێن، بەڵام باشـــتروایە جیابکرێنەوە بۆ (کتێب، تێزی دکتۆراو ماســـتەرنامە ئێنتەرنێت‌و ســـەرچاوە ئەلەکترۆنییەکان: بڵاوکراوەو گۆڤاری زانســـتی‌و رۆژنامە، کتێبی پیرۆزو کۆنفرانس‌و دەســـتورو یاســـاکان‌و وانەووتارو هیتر. لێرەدا شـــێوازی جێگیرکردنی هەر یەکێك لەو سەرچاوانە، بەنموونەوە؛ روون دەکەینەوە.
1.**کتێـــب**: لەهەموو حـاڵەتەکـانـدا؛ نـاوی کتێبەکە بەرەنگێکی تۆختر دەنووسرێـت، یـاخود هێڵی بەژێردا دەهێنرێـت. خۆئەگەر کتێبێـك ژمـارەی چاپی لەســـەر نەنووسرا بوو، مانای وایە یەکەمین چاپی کتێبەکەیە، بۆیە لەســـەرچاوەکانیشـــدا ئەکرێت چاپی یەکەم نەنووسرێت. زیاتر چاپی دووەم‌و سێیەم‌و بەرەو ژوور دەنووسرێت، خۆ ئەگەر چاپە نوێیەکە، زیادەی خرابووە ســـەرو بژاردە کرابوو، ئەبێت توێژەر لەســـەرچاوەدا ئاماژە بەو دەســـتکاری کردنە بدات.

- ئەگەر کتێبەکە یەك کەس نووسیبووی: ناوی کۆتایی یان نازناوی نووسەر لەســـەرەتادا دەنووسرێت‌و؛ پاشـــان ناوی یەکەمی کەســـەکە، ســـاڵ، ناوی کتێب، شوێنی بڵاوکردنەوە، چاپ، دەزگای بڵاوکردنەوە.

| |
|---|
| بۆکانی، سابیر (2006): لەنێوان هەست‌و نەستدا، چاپی یەکەم، سلێمانی، چاپخانەی رەنج. |

- ئەگەر کتێبەکە دوو نووســەری هەبوو: تەنها نووسـەر یەکەم؛ نازناوەکەی یان ناوی کۆتایی لەســەرەتادا دەنووسرێت پاشـان ناوی خۆی‌و باوكـو باپیرەی

دەنووسرێت. بۆ ناوی نووسەری دووەم، ئەکرێت هەمان شێوەی نووسەری یەکەم بنوسرێت یاخود وەك خۆیو بێ دەستکاری بنووسرێت. ئینجا سال، ناوی کتێب، شوێنی بڵاوکردنەوە، چاپ، دەزگای بڵاوکردنەوە.

| |
|---|
| عوده، احمد سليمان و ملكاوي، فتحي حسن (1992)، اساسيات البحث العلمى، الطبعه الثانية، مكتبة الكتاني، اربد، الاردن. |
| عوده، احمد سليمان و فتحي حسن ملكاوي (1992)، اساسيات البحث العلمى، الطبعه الثانية، مكتبة الكتاني، اربد، الاردن. |

• ئەگەر کتێبەکە؛ سێ کەس یان زیاتر نووسیبوویان. تەنها نووسەری یەکەم نازناوەکەی یان ناوی کۆتایی لەسەرەتادا دەنووسرێتو پاشان ناوی خۆیو باوكو باپیرەی دەنووسرێت، ناوی ئەوانیتر نانووسرێتو تەنها دەگوترێت (وئەوانیتر) بەعەرەبیش (واخرون)و بەئینگلیزیش (et. al) ئینجا سال، ناوی کتێب، شوێنی بڵاوکردنەوە، چاپ، دەزگای بڵاوکردنەوە. بۆ نموونە: ئەم ناوانە کتێبێکیان نووسیوە (گلعت منصور، أنور الشرقاوی، عادل عزالدين، فاروق ابو عوف) بەم جۆرە ئاماژە بەکتێبەکەیان دەکرێت:

| |
|---|
| منصور، طلعت و اخرون (1978)، اسس علم النفس العام، الطبعة الاولى، مكتبة الأنجلو المصرية، القاهرة. |

• ئەگەر کتێبەکە وەرگێران بوو. یەك نووسەرو یەك وەرگێری هەبوو. ناوی نووسەر، سال، ناوی کتێب، ناوی وەرگێر، شوێنی بڵاوکردنەوە، چاپ، دەزگای بڵاوکردنەوە.

| |
|---|
| جەعفەر، نوری (2007)، سروشتو پەرەسەندنی هزر، وەرگێرانی سابیر بۆکانی، خانەی وەرگێران، چاپی یەکەم، چاپخانەی شفان، سلێمانی. |

• ئەگەر کتێبەکە وەرگێڕان بوو. دوو نووســـەرو یەك وەرگێڕی هەبوو. ناوی نووســـەر، ســـاڵ، ناوی کتێب، ناوی وەرگێڕ، شـــوێنی بڵاوکردنەوە، چاپ، دەزگای بڵاوکردنەوە.

| |
|---|
| القصیر، ملیحه عونی و صبیح عبدالمنعم احمد (2002)، سۆسیۆلۆژیای خێزان، وەرگێڕانی ســـابیر بەکر بۆکانی، ســـەنتەری توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو کۆمەڵایەتیو تاوان، چاپی یەکەم، چاپخانەی داناز، سلێمانی. |

• ئەگەر کتێبەکە وەرگێڕان بوو. یەك نووســـەرو دوو وەرگێڕی هەبوو، ناوی وەرگێڕەکان، وەك نـاوی دوو نووســـەری یەك کتێـب، دەنووسرێـت. بەڵام ئەگەر کتێبەکە وەرگێڕان بـوو. زیـاتر لەدوو وەرگێڕی هەبوو، بەمجۆرە دەنووسرێت: ناوی نووسەر، ساڵ، ناوی کتێب، ناوی یەکەم وەرگێڕ، پاشان دەنووسرێت (ئەوانیتر)، شوێنی بڵاوکردنەوە، چاپ، دەزگای بڵاوکردنەوە. بۆ نموونە: ئەم چەند وەرگێڕە کتێبێکیان کردووە بەکوردی (ڕێبوار ســـیوەیلی، موسلح ئیروانی، مراد حەکیم، دارا سوبحان، ئەبوبەکر عەلی، دڵشاد حەمەو تەحسین تەها) بەمشێوەیە دەنووسرێت:

| |
|---|
| موحسینی، مەنوچێهر (2006)، دەروازەکانی کۆمەڵناسی، وەرگێڕانی ڕێبوار سـیوەیلیو ئەوانیتر، چاپی دووەم، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر. |

دووەم: **تێزی دکتۆراو ماســتەرنامە**: بەمشـێوەیە لەسـەرچاوەکاندا جێگیر دەکرێت:

• تێزی دکتۆرا: توێژەر، ناونیشانی توێژینەوە، تێزی دکتۆرای بڵاونەکراوە (غیر منشورة). کۆلێج، زانکۆ، شار.

| |
|---|
| خالد، حســن فخرالدين (2014)، ثقافة الســلام و علاقتها بالقلق الوجودي و الاتفاق مع الاخرين لدى طلبة الجامعة، أطروحة الدكتوراه غير منشورة، كلية التربية الأساس، جامعة السليمانية. |

بەڵام ئەگەر تێزەکە بڵاوکراوە بوو، واتا توێژەرەکە لەشــێوەی کتێبدا، چاپو بڵاوی کردبووەوە، بەڵام لەناو کتێبەکەدا ئاماژەی بەوە کرد بوو کە ئەم کتێبە لەبنچینەدا تێزی دکتۆرایە، ئەو کاتە بەمجۆرە دادەنرێت.

| |
|---|
| بوكانى، صابر بكرمصطفى (2008): مجلات الأطفال فى اقليم كوردستان العراق، أطروحة دكتوراه منشـورة، كلية العلوم الاجتماعية، جامعة كوية، دار السلام الثقافي، خانقين. |

• **ماستەرنامە**: ماستەرنامەی بڵاوکراوە، هەروەك تێزی دکتۆرای بڵاوکراوە دەنووسرێت. بەڵام بڵاونەکراوە بەم جۆرە جێگیر دەکرێت.

توێژەر، ناونیشــانی توێژینەوە، ماســتەرنامەی بڵاونەکراوە یاخود بڵاو کراوە (منشورە، غیر منشورە). کۆلێج، زانکۆ، شار.

| |
|---|
| عبدالرحمن، كاوە عزالدين (2012)، اســتخدام المؤثرات الصــورية فى التغطية الأخبارية للفضـائيات الكوردية وتأثيرها فى بناءو القائم بالاتصـال للمضـمون، رسـالة الماجسـتير غير منشـورة، كلية الاعلام، جامعة جنان، طرابلس، لبنان. |

سێیەم: **ئینتەرنێتو سەرچاوە ئەلەکترۆنییەکان**: هەندێك بنەمای گشتی هەیە کە پێویستە لەجەختیان لەسەر بکرێتەوە لەکاتێکدا کە مامەڵە لەگەڵ

سـەرچـاوە ئەلەکترۆنییەکـان دەکەین‌و زانیـاری‌و داتـایـان لێوەردەگرین، ئەکرێت لێرەدا کورتیان بکەینەوە:
1. ئەبێت ئاماژە بەسەرجەم داتا بنچینەییەکانی سەرچاوەکە بکرێت وەك: ناوی نووسەر، ئەو لایەنەی زانیارییەکانی بڵاوکردۆتەوە. خۆئەگەر ناوی نووسەرو ئەو لایەنەی زانیارییەکانی بڵاوکردۆتەوە؛ نادیاربوو، ئەوسا ناونیشانی ووتار یان توێژینەوەکە ئاماژەی پێدەدرێت.
2. هەر شتێك کە ئاماژە بێت بۆ ناسینەوە، دیاری دەکرێت وەك: مێژووی بڵاوکردنەوەو ژمارەو بەرگ‌و...هتد.
خۆئەگەر زانیارییەکە لەسیدیەوە (CD- ROM) وەرگیرابوو، پێویستە بخرێتە نێوان دوو کەوانەوە.
3. ئەو مێژووە دیاری دەکرێت کە تیایدا توێژەر سەردانی پێگە یان ماڵپەڕە ئەلەکترۆنییەکەی کردووە.
4. ناونیشانی پێگە یان ماڵپەڕە ئەلەکترۆنییەکەی بەتەواوەتی دەنووسرێت.

| |
|---|
| دستور العراق، جمهورية العراق، الامانة العامة لمجلس الوزراء، 2015/10/11<br>http://cabinet.iq/PageViewer.aspx?id=2 |

بۆ سەرچاوەکە ئینگلیزیش هەر وەهایە، هەروەك لەم نموونەیەدا هەیە.

| |
|---|
| Capley, Suzane. Jane Austen s Works. 4Sep. 2002<br>http: members.aol.com/suse.htm |

**چوارەم: گۆڤاری زانستی:** سەبارەت بەووتار یان توێژینەوەی بڵاوەکراوە لەگۆڤارە زانستیی‌و ڕۆژنامەکاندا، سەرەتا ناوی نووسەر پاشان ناونیشانی توێژینەوەکە، ناوی گۆڤار، ژمارەی گۆڤار، مێژوو، ژمارەی پەڕە.

| |
|---|
| مصطفی، صابر بکر وعادل حه مه عارف مؤمن، ڕۆڵی گۆڤاری منداڵان لەپرۆسەی گەشەپێکردنی کۆمەڵایەتیدا، گۆڤاری زانکۆی سلێمانیB ، ژمارە 36 ئابی 2012، لاپەڕە 65. |

**پێنجەم: کتێبی پیرۆزو و کۆنفرانس‌و دەستورو یاساکان وانەووتار:**

**کتێبە پیرۆزەکان:**

| |
|---|
| القران الكريم، سوره المائده. أيه 71 |

**کۆنفرانسەکان:** ئەگەر توێژینەوەیەك لەکۆنفرانسێکدا بڵاوکرایەوە، ئەکرێت بەسەرچاوە وەربگیرێت، بەمشێوەیە:

| |
|---|
| بۆکانی، سابیر، بەها لەکتێبی (خوێندنەوەی کوردی) پۆلی دووەمی بنەڕەتیدا/ توێژینەوەیەکی شیکارییە، کۆنفرانسی_ تایبەت بەپەروەردەو زمان لەوەزراەتی پەروەردەو ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێم لەهەولێر لەڕۆژانی (22- 2/24 / 2014). |

**دەستورو یاساکان:**

| |
|---|
| هەرێمی کوردستانی عێراق، پەرلەمان، یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، ژمارە (40)ی ساڵی (2004)، لەبڵاوکراوەکانی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، 2010. |

## چاوپێکەوتنی کەسێتی

| |
|---|
| خەیات، کمال، پرۆفیســۆری ئابوری، ســەرۆکی زانکۆی ســلێمانی، رۆژی چاوپێکەوتن 2005/1/19 |

**وانەووتار:**

لەکاتێکدا توێژەر لەوانەووتاری مامۆســتایەکەوە؛ زانیاری وەردەگرێتو؛ ئەیەوێت لەسەرچاوەکانیدا، ئاماژەی بە بەشێك لەوانەووتارەکە بدات.

1. هەتا پلەی زانستی مامۆستاکەش بەرز بێت (لەبەرزترینەوە: پرۆفیسۆر، پرۆفیسۆری یاریدەدەر، مامۆستا، مامۆستای یاریدەدەر) ئەوا سەرچاوەکەی بەهێزترو برواپێکراوتر دەبێت.

2. لەهەموو حاڵەتەکاندا پێویستە مۆڵەتی لەمامۆستاکە وەرگرتبێت. شێوازی دانانی وانەووتاریش بەمجۆرەیە:

**نـاوی وانەبێژ نـاونیشــــــانی وانە، مێژووی ووتنەوەی وانەکە، لەکوێ وتراوەتەوە.**

## سەرچاوەکان:

جگە لەو سەرچاوانەی لەسەرەتاداو لە نێو بابەتی (لەجیاتی پێشەکی)دا؛ ئاماژەیان بۆ کراوە، لەنووسینی ئەم کتێبەدا، سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:


1. أبو علام، رجاء محمود (1999)، مناهج البحث العلمي في العلوم التربوية و النفسية، القاهرة.
2. البداينة، ذياب (1999)، المرشد في كتابة الرسائل الجامعية، اكاديمية نايف العربية، الرياض.
3. بوحوش، عمارو محمد الذنيبات (1989)، مناهج البحث العلمي، اسس و اساليب، مكتبة المنار، الزرقاو، الاردن.
4. جابر، عبدالحميد جابرو احمد خيري كاظم (1973)، مناهج البحث في التربية و علم النفس، دار النهضة العربية، القاهرة.
5. جاكوبسي، ل.ج.واري، د. روازففيتش، أ. (2004)، مقدمة للبحث في التربية، ترجمة سعيد الحسيني و عادل عبدالكريم ياسين،دار الكتاب الجامعي، العين (الامارات).
6. الحسن، احسان محمد و عبدالمنعم الحسني (1981) طرق البحث الاجتماعي، وزارة التعليم العالي و البحث العلمي، بغداد.
7. حسين، سمير محمد (1976)، بحوث الاعلام- اسس و مباديو، عالم الكتب، القاهرة.
8. حسين، سمير محمد : تحليل المضمون ،(القاهرة: عالم الكتب )، 1982م
9. حطاب، حسن وعوني ياس عباس(1986).أسس البحث العلمي, مطبعة وزارة التربية, بغداد ,العراق.

10. الحمداني، موفق و أخرون (2006)مناهج البحث العلمي- اساسيات البحث العلمي، الطبعة الاولي، الوراق للنشرو التوزيع، عمان، الاردن.
11. حمود، خضير كاظم وموسي سلامة اللوزي.منهجية البحث العلمي،ط1، مكتبة الجامعة، عمان، الاردن، 2008.
12. داود، عزيز حنا وأنور حسين عبد الرحمن (2008). مناهج البحث التربوي، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، بغداد، العراق.
13. الزوبعي، عبد الجليل ابراهيم ومحمد أحمد الغنام (1984). مناهج البحث في التربية، مطبعة جامعة بغداد، بغداد، العراق.
14. شحاته، حسن (1998). المناهج الدراسية بين النظرية والتطبيق، مكتبة الدار العربية للكتاب، القاهرة.
15. طعيمة، رشدي (1987): تحليل المحتوي في العلوم الإنسانية، مفهومه، أسسه، استخداماته، دار الفكر العربي، القاهرة.
16. عبيدات، محمدو بونصار، محمد ومبيضين، عقلة (1999)، منهجية البحث العلمي: القواعد و المراحل و التطبيقات، دار الوائل، عمان.
17. عدس، عبدالرحمن (1997)، اساسيات البحث التربوي، دار الفرقان، عمان.
18. عريفج، سامي و اخرون(1992)، البحث العلمي: مفهومه و ادواته و اساليبه، دار الفكر، عمان.
19. عودة، احمد سليمان و فتحي حسن ملكاوي (1992)، اساسيات البحث العلمي، مكتبة الكتاني، اربد، الاردن.
20. فان دالين، ديوبولت (1997)، مناهج البحث في التربية و علم النفس، ترجمة محمد نبيل نوفلم و سلمان الخضيري و طلعت منصور، ط7، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة.
21. العكش، فوزي عبدالقادر طه (1995)، البحث العلمي: المناهج و الاجراوات، المطابع التعاونية، عمان.

22. قنـديلجي، عـامر ابراهيم (2002)، البحـث العلمي و اسـتخـدام مصادرالمعلومات التقليدية و الالكترونية، دار البازوري، عمان.
23. القيم، كامل حسـون (2007)، مناهج و اسـاليب كتابة البحث العلمي في الدراسات الانسانية، المكتبة الوطنية، بغداد.
24. الكيلاني، عبدالله زيد (2004)، دليل الرسائل والاطاريح الجامعية، دار المسيرة، عمان.
25. محمد، علي عودة (2012)، مناهج البحث في التربية و علم النفس، ط1، مكتبة عدنان، بغداد.
26. ملحم، سـامي محمد (2002)، مناهج البحث في التربية و علم النفس، دار المسيرة، عمان، الاردن.
27. النّجار، فايز جمعة وأخرون (2010)، أسـاليب البحث العلمي (منظور تطبيقي)، دار الحامد للنشر والتوزيـع، عمان، الاردن.

پاشكۆی (1)
نموونەی توێژینەوەیەك بەڕێبازی شیكاری ناوەڕۆك

# بەها لەكتێبی (خوێندنەوەی كوردی) پۆلی دووەمی بنەڕەتیدا/ توێژینەوەیەكی شیكارییە

**پ.ی.د.سابیر بۆكانی 2014**

## پوختەی توێژینەوە

ئەم توێژینەوەیە شـــیكاری ناوەڕۆكە بۆ كتێبی خوێندنەوەی كوردی قۆناغی دووەمی بـنەڕەتی كە پـرۆگـرامـێكە بەڕێـوەبەرایەتی گشـــتی پـرۆگـرامو چاپەمەنییەكانی وەزارەتی پەروەردەی حكومەتی هەرێمی كوردســتان، بڕیاری لەســـەرداوەو لەســـەرجەم قوتابخانە حكومییەكانی هەرێمی كوردســتاندا دەخوێندرێت. ئامانجی ســـەرەكی دیاریكردنی ئەو بەهایانەیە كە لەبابەتەكانی ناو كتێبەكەدا جەختی لەســـەر كراوەتەوە تا بزانرێت كام بەها زیاتر لەوانیتر بایەخی پێدەدراوەو چ بەهایەكیش كەمتر گرنگی پێدراوە، یاخود بەتەواوەتی فەرامۆش كراون. هەروەها هەوڵدراوە بۆ دیاریكردنی ژمارەی ئەو لاپەڕانەی بۆ پێدانی بەهاكان تەرخان كراون، لەگەڵ ڕووبەری وێنەو ژانرە ئەدەبییەكان لەكتێبەكەدا. هەر چەنـدە بەهـاكـان لەپرۆگرامو كتێبی قوتـابخـانەكـانـدا بـایەخێكی مەزنیـان هەیە بەڵام توێژینەوەی زانســـتیی لەم بوارەدا؛ كەمو دەگمەنو ئەوەنـدەی توێژەریش ئاگادار بێـت لەلایەن وەزارەتی پەروەردەوە بەهـاكـان بەپێی قۆنـاغەكـانی خوێنـدنی بنەڕەتی، بەوردی دیـاری نەكراونو لەلیستێكدا بە ڕیزبەندی ئاماژەیان بۆ نەكراوە.

لەم توێژینەوەیەدا ئاماژە بەگرنگی قۆناغی منداڵیو هەســـتیاری پرۆســـەی فێركردن لەقۆنـاغی منـداڵی نـاوەنـدیـدا كراوە كە تەمەنی (6 – 9ســـاڵی)

دەگرێتەوە، ئەمەو سەرباری خستنەڕوی ماناو چەمکی بەهاو پۆلێنەکانیو لەگەڵ ئاماژەدان بەچەند توێژینەوەیەکی پێشوو کە لەهەمان بواردا لەوڵاتانیتر ئەنجامدراون. بەمەبەستی هێنانەدی ئامانجەکانی ئەم توێژینەوەیە سەرجەم بابەتەکانی نێوکتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەڕەتی شیکارکراون کە بریتین لە (28) بابەت، (9) هۆنراوەو(19)وتار(داڕشتن)و چیرۆك کە لەگەڵ (52)وێنەی قەبارە جیاوازدا لەتویێ (80) لاپەڕەدا خراونەتەڕوو.

بەمەبەستی شیکارکردنی بەهاکانی نێو بابەتەکانی کتێبەکەو زانینی جۆرو ڕێژەیان، پۆلێنی وایت Whit بۆ بەهاکان هەڵبژێردراوەو بەکار هێنراوە لەرێکارییەکانی پرۆسەی شیکاردا، فۆرمێك بۆ دیاریکردنی بەهاکان ئامادەکراوە، راستی و جێگیری فۆرمەکە دەرهێنراوە، لەو فۆرمەدا بەها بەدەستەی شیکارو ڕستەش وەك یەکەی شیکاردیاریکراوە، هەروەها ڕوپێوی لاپەرەکان کراوە لەگەڵ ڕوپێوی هەر وێنەیەك کە هاوشانی هەر بابەتێك دانراوە. لەکۆتاییدا ئەنجامەکانی خراونەتەڕوو کە گرنگترینیان بریتییە لەمانە:

لەکتێبی ناوبراودا (324)بەها بوونی هەیە دیارترینیان ئەمانەن (مەعریفە، تەندروستی، کار، ئاکار، پێداگریو کۆڵنەدان، نیشتمانپەروەری، رۆشنبیری گشتی، راستگۆیی، چالاکی، ئەزموونی نوێ، وروژاندن، جوانی، جوگرافیای کوردستان، یەکێتی گروپ، خۆشەویستیو هاورێیەتی). چەند بەهایەك کەمتر دەرکەوتوون وەك (لێبوردەیی، خاکەڕایی، پاکوخاوێنی، ئاسوودەیی، مێژووی کورد، کلتوری کوردی،...). ئەم بەهایانەش بەهیچ جۆرێك دەرنەکەوتوونو بایەخیان پێنەدراوە (گونجانو ئاسایشی هەڵچوونی، پێزانین، ڕواڵەت، سەربەخۆیی، خۆشگوزەرانی و ئایین). ریزبەندی گروپ بەهاکانش بەم جۆرەیە (کۆمەڵایەتییەکان، خۆشبارییەکان، جەستەییەکان، کردارییەکان، مەعریفییەکان، نیشتمانییەکان، ئاکارییەکان، خۆییەکان)

هەروەك روبەرێکی بچوك بۆ وێنە تەرخانکراوەو رەنگی کەم بەکارهێنراوەو بۆشـــایی ســـپی لەلاپەڕەکاندا زۆرەو ژانری چیرۆك کەمتر بایەخی پێدراوە، ئەمانەو جگە ئەنجامەکانو چەند پێشنیارو راسپاردەیەك.

**کێشەی توێژینەوە**

کتێبی خوێنـدن یەکێکە لەگرنگترین ئەو کەرەســـانەی کە قوتـابخـانە لەرێگەیەوە ئەو ئەرکە جێبەجێ دەکات کە کۆمەڵ لەئەســـتۆی داناوەو ئەو ئامانجانەش بەدی دەهێنێت کە بۆی دیاریکردوون. پشـکی شـێری ئەو ئەرك و ئـامـانجـانەی کە کتێبی خوێنـدن لەقۆنـاغە ســـەرەتـاییەکانی بنەڕەتیـدا لەســـەرشـــانیەتی، بەر کتێبی خوێنـدنەوە دەکەوێـت، بەو پێیەی تـایبەتە بەزمانو ئاخاوتنەوەو زمانیش هۆکارێکی ســـەرەکییە بۆ یارمەتیدانی منداڵ لەگەشـــەی مەعریفی و کۆمەڵایەتیو دەروونی و هەڵچونی قوتابیدا.( غراب، 1995: 48).

هەر چەنـدە بەهاکان لەپرۆگرامو کتێبی قوتـابخـانەکانـدا بایەخێکی مەزنیان هەیە بەڵام توێژینەوەی زانســـتیی لەم بوارەدا؛ کەمو دەگمەنەو ئەوەنـدەی تـوێـژەریـش ئـاگـادار بێـت لەلایەن وەزارەتی پەروەردەوە بەهـاکـان بەپێی قۆنـاغەکـانی خوێنـدنی بنەڕەتی، بەوردی دیـاری نەکراونو لەلیســـتێکـدا بەڕیزبەنـدی ئامارەیان بۆ نەکراوە تابزانرێت؛ لەگەڵ پێشـــکەوتنە خێراکانی بوارە جیاجیاکانی ژیانـدا رێدەکەن؟ چونکە هـاوشـــانی بەرەو پێشـــچوونی شـارسـتانیەتی مرۆڤایەتی دەیان بەهای نوێش دێنەئاراوە کە دەبێت لەدانانی پرۆگرامەکانی خوێنـدنـدا بەهەنـد وەربگیرێن. هەر لەروانگەیەوە شـــیکاری ناوەرۆکی کتێبەکانی خوێندن، ئەرکێکی بەردەوامی توێژەرانی بوارەکەیەو دەبێت سـالانە ئەو شـیکارە بۆ یەکە بەیەکەی کتێبەکان ئەنجام بدرێت لەگۆشـەی ئەم پێوەرەوە، هەڵسەنگاندنیان بۆ بکرێت.

## بایەخی توێژینەوە

کتێبی خوێندن گرنگترین کەرەسـەیە کە لەرێیەوە قوتابخانە ئەرکەکانی خۆی ئەنجامدەداتو ئامانجەکانی بەدیدەهێنت. کۆمەڵگە قوتابخانەی بەبریکاری خۆی داناوەو ئەرکی پەروەردەو گەشـەپێگردنی منداڵو نەوەکانی خسـتۆتە ئەسـتۆیەوە تا لەڕوی رۆشـنبیری کۆمەڵایەتییەوە پێیانبگەیەنێت. کتێبی خوێندنەوەش یەکێکە لەو کەرەسـانەو رۆژانە لەبەردەسـتی منداڵدایەو مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، دەقو بابەتو وێنەو نیگارەکانی دەبینێت کە ناوەڕۆکەکەیان دەیان بەهای هەمەجۆریان لەخۆگرتووەو دەیگوازنەوە بۆ منداڵ. بەهاش کە گرنگترین رەگەزی رۆشـنبیریو کولتورییەو رۆدەچێتە ژیانی تاكو کۆمەڵەوە، هەر لەکۆنەوە جێگای بایەخی بیرمەندو فەیلەسـوفان بووەو لەسـەردەمی ئەمرۆشـدا لەلایەن پسـپۆرانی زانسـتە مرۆڤایەتییەکانەوە گرنگی پێدەدرێت. لەرۆژگاری ئەمرۆدا بەها بە یەکێك لەرەگەزەکانی پرۆسەی پەروەردە هەژمار دەکرێتو گەیاندنو فێرکردنی بەهاو وەرگرتنیان، ئامانجی سەرەکی پرۆسەی پەروەردەیەو ئەرکی هەرە گرنگییەتی. سیستمی پەروەردەیی لەهەر کۆمەڵگەیەکدا رۆڵێکی گەورە دەگێڕێت لەبنیاتنانی بەها جوانو پۆزەتیفەکاندا لەمێشـکی تازەپێگەشـتوواندا‌و دواتر رەنگدانەوەی لەرەفتارەکانیاندا. دەرئەنجامی هەموو پرۆسـەیەکی فێرکاری بریتییە لەو بەهایانەی گەیاندوویەتیو بەدەستی هێناون. جا ئەگەر ئەمە بەدینەهاتبێت، مانای وایە ئەوەی بەدەسـت هاتووە لەئاسـتی مەعریفەو لێهاتوویەکاندا نینو کەڵکی ئەوتۆیان لێنەکەوتۆتەوە. (زاهر، 1984،:12)و (الفرحان و مرعي، 1988: 98).

ئایندەی هەر کۆمەڵگایەك ئەوەندەی پەیوەسـتە بەو بەهایانەوە کە هەڵیبژاردوون، ئەوەندە پەیوەسـت نییە بەبەکارهێنانی پێشـکەوتنەکانی تەکنۆلۆژیاوە، چونکە بەهاکان کاریگەرییان لەسـەر بچوکترین و وردترین

ئەرکی رۆشـــنبیری هەیە بەبەکارهێنانی تەکنۆلۆژیاشـــەوە. (الكيلاني،1988: 33).

رەگەزەکانی پرۆسـەی پەروەردەو فێرکردن لەقوتابخانەی فەرمی حکومیدا کە بریتین لەمامۆســتاو قوتابیو پرۆگرامو کەرەســـە فێرکارییەکان، هەموویان بەیەکەوە فەلســەفەو ئامانجی پەروەردە بەدیدەهێنن، بەڵام ناوەرۆکی کتێبی خوێندنو بەتایبەتیش کتێبی خوێندنەوە لەقۆناغی بنەرەتیدا، پشـکی شـێری بەردەکەوێت لەگەیاندنی ئەو بەهایانەدا کە کۆمەڵ خوازیارە بەتاکەکانی بگەیەنێت. (مقدادي،1997:60).

**ئامانجەکانی توێژینەوە**

ئەم توێژینەوە هەوڵیداوە ئەم ئامانجانە بەدیبهێنێت:

1. دیاریکردنی رێژەی ئەو لاپەڕانەی تەرخانکراون بۆ پێدانی بەهاکان بەقوتابی، بەبەراورد بەرێژەی گشـــتی لاپەڕەکان لەکتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەرەتیدا.
2. دیاریکردنی ئەو بەهایانەی لەکتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەرەتیدا بەقوتابیان دەدرێنو ریزبەندکردنیان بەپێی بایەخو دەرکەوتنو چەندبارە بوونەوەیان، هەروەها دیاریکردنی گرووپی بەهاکان.
3. دیاریکردنی رووبەری تەرخانکراو بۆ وێنە لەلاپەرە شـــیکارکراوەکانی کتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەرەتیدا.
4. دیاریکردنی ژمارەی لاپەڕەکانی ژانرە ئەدەبییەکان لەکتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەرەتیدا کە بەهۆیانەوە بەهاکان بەقوتابی دەدرێن.

**دیاریکردنی چەمکەکان**

**بەها:** بەهەموو ئەو شـــتانە دەگوترێت کە شـــایانی بایەخپێدانن و گرنگن لەڕووی ماددی یان مەعنەوی یان کۆمەڵایەتی یان ئاکاری یان ئایینی و جوانییەوە.( smith،1994 :679 ). یان بەها ئەو چەمکانە کە کاریگەری

لەســـەر ڕەفتاری خەڵکی بەجێدەهێڵنو راســـتو پەســـەند دیاریدەکەن. (Baldridge,1980, p:105).

**کتێبی قوتابخانە**: بەلای (Rowntras &syllabus)وە بریتیە لەپوختە یان هێڵە گشـتییەکانی ناوەڕۆکی مادەی کۆرسـێك یان لەکتێبێکی قوتابخانە، ئەو کتێبەش زانیاریو ڕاوبۆچوونو بەهاو ئەو لێوەشـاوەییانەی لەخۆگرتووە کە بۆ گەشەپێدانی مێشکی قوتابی پێویستن. (فاچل، 1994: 56).

لەپێناســـەیەکیتردا کتێبی قوتابخانە(Text Book) بریتییە لەو کتێبەی بۆ بەکارهێنانی پۆل دارێژراوەو کۆمەڵێك شارەزای پسپۆر لەیەکێك لەبوارەکانی مەعریفەدا؛ ئامادەیانکردووە بەجۆرێك لەگەڵ ئاسـتی گەشـەو پێگەشـتنی قوتـابیـدا بگونجێـت، بۆ یەکێـك لەقۆنـاغەکانی خوێنـدنەو ئەو ئـامـانجە پەروەردەیی‌و زانســـتییە بەدی دەهێنێـت کە لەفەلســـەفەی کۆمەڵگەوە دیاریکراوە. ( محمد ، 1999 :291).

پێناســـەی کارڕایی کتێبی قوتابخانە بریتییە لەکۆمەڵێك بابەت لەدووتوێی نـاوەڕۆکێکی دیـاریکراودا کە (چەمـكو زانیـاریو هزرو بنەمـاو بەهـاکان)ی لەخۆگرتووە لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجی پەروەردەییدا بەمەبەسـتی گەیاندنی بەقوتابی تاکو بۆ گەشـــەپێدانی دیدو بۆچوونی پەســـەندکراو، ســـوودی لێوەربگرێت.

قۆنـاغی دووەمی بنەڕەتی: یەکێکە لەقۆنـاغەکانی خوێنـدنی بنەڕەتیو لەدوای بڕینی قۆنـاغی یەکەمەوە دەســـپێدەکاتو تەمەنی قوتـابی لەنێوان (7 - 8) ساڵیدایەو دواتر دەچێتە قۆناغی سێیەمی بنەڕەتی.

شـــیکـاری نـاوەڕۆك: میـتۆد یـان شـــێوازێکی تـوێژینەوەیە، تـوێژەران لەتوێژینەوەکانیاندا بەکاریدەهێنن بۆ وەصـفکردنی ناوەڕۆکی دیارو شـاراوەی ئەو مـادیەیەی کە دەیـانەوێـت لەڕووی شـــێوەو نـاوەڕۆکەوە شـــیکـاری بکەن.(حسین،1983 : 19).

## توێژینەوەکانی پێشوو

توێژینەوەی **مقدادي** (1997): بەناونیشـــانی (بەها پەروەردەییەکان لەکتێبی خوێندنەوەی عەرەبی قۆناغی خوێندنی بنەڕەتی لەئەردەن) ئامانجی توێژەر دیاریکردنی بەها پەروەدەییەکانە لەکتێبی خوێندنەوەی عەرەبی قۆناغی خوێندنی بنەڕەتیدا. پشـــتی بەمیتۆدی شـــیکردنەوەی ناوەرۆکی بەســـتووەو لەئەنجامدا ئەم بەهایانەی دیاریکردووە کە لەریزی پێشـــەوەدان: هاوکاریو هەرەوەزی، خۆشـویسـتنی فێربوون، ئازایەتی، رێزگرتنی بەرانبەر، چێژوەرگرتن لەجوانی، ئارامگرتن، فێربوونی کارو بەزەیی. ئەم بەهایانەش کەمتر چەندبارە بوونەتەوە: پاکوخاوێنی، ژینگەپارێزی، پەیڕەوکردنی رێســـاکانی تەندروســـتی، قبوڵکردنی کەمئەندامانو دار ڕواندن. (مقدادي، 1997: 59-70).

توێژینەوەی **العبادي**(2003): بەناونیشـــانی (بەهاکان لەکتێبی خوێندنەوەی هەر چوار قۆناغی (1،2،3،4) بنەرەتی لەســـوڵتاننشـــینی عوممان). ئامانجی توێژینەوەکە بریتییە لەدۆزینەوەی بەهـاکانی نـاو کتێبی ئەو چوار قۆنـاغەی خوێندن. توێژەر بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی؛ میتۆدی شـــیکاری ناوەڕۆکی بەکارهێناوەو رستەو بیرۆکەی کردووە بەیەکەی شیکارەکەیو بەم ئەنجامانە گەشـــتووە: بەهاکان لەکتێبی خوێندنەوەی قۆناغی یەکەمی بنەڕەتیدا بریتین لە: یاریکردنو چالاکی، پاکوخاوێنی، جوانی، جەژن، هاوڕێیەتی و ئەندامێتیو کارکردن. لەکتێبی خوێندنەوەی قۆناغی دووەمی بنەڕەتیدا ئەم بەهایانە زیاتر لەوانیتر دەرکەوتوون: پاکوخاوێنی، جوانی، یاریو وەرزشـــکردن، وەرگرتنی مەعریفە، کارکردنو شـــانازیکردن بەنیشـــتمانەوە. لەکتێبی خوێندنەوەی قۆناغی ســـێیەمی بنەڕەتیدا بەهـاکانی کۆمەڵایەتی، ئاینیو ئاکاری زیاتر جەختیان لەسەر کراوەتەوە. بەڵام لە بەهاکان لەکتێبی خوێندنەوەی قۆناغی چوارەمی بنەڕەتیدا بریتین لە: تەندروســـتی، خۆشـــباری، جوانیو بەهای

سـیاسـیش کەوتۆتە دوای پلەی ڕیزبەندییەکەوە. (انترنت، التعليم في كتب القراءة).

**پەروەردەو بەها**

پەروەردە لەبنچینەدا پرۆسەیەکی بەهاییەو ئامانجەکەی گەشەپێکردنی تاكو گروپە بۆ ئاسـتێکی بەرزتری کامڵبوونو پێگەشـتنو ڕۆشـنبیرکردنی بەردەوامو نەپچڕاوە (لطفي،1993:44). قوتابخانەش بۆخۆی کاراترین ڕێگاو باشـترین کەرەسـەیە بۆ گواسـتنەوەی بەها ویسـتراوو پەسـەندەکراوەکانو چاندنی لەناخو دەروونی قوتابیدا، ئەویش بەهۆی پرۆگرامی خوێندنەوە. لەدارِشـتنو ئامادەکردنی پرۆگرامی قوتابخانەدا، بابەتی بەهاکان خاڵی دەسپێكو سەرەتای بڕیارو هەنگاوی یەکەمە لەو کارەدا. بەگشـتی ئامانجەکانی پرۆگرامی خوێندن خۆی لەخۆیدا، چەند دەستەواژەو حوکمێکی بەهایانەیەو لەسەر ئەو بناغەیە ناوەڕۆکی بابەتەکانی  پرۆگرامی هەر مادەیەك؛ ئامادە دەکرێتو دواتر لەڕێی وانەکـانەوە کـار بۆ بەدیهێنـانیـان دەکرێـت. لەم گۆشـەیەوە ئەوەی لەپرۆگرامەکانـدا پێویسـتە جەختی زیاتری لێبکرێتەوە پرۆگرامی خوێنـدنو کتێبەکانیەتی، لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی کتێبی خوێندنەوە گشـتیەو بۆ سـەرجەم گروپی بەهاکان دەسـتدەداتو گشـتگیرەو تەواوی بەهاکان لەنێو بابەتەکانیدا جێی دەبێتەوە. لەقۆناغی خوێندنی بنەڕەتیدا؛ کتێبی خوێندنەوە، سـەرەتای پرۆسـەی فێکردنو فێربوونەو ڕۆڵێکی دیارو مەزن دەگێڕێت بۆ ئەو قۆناغەی ژیانی مرۆڤ و بەردی بناغەی کەسـێتی ئایندەی قوتابی لەسـەر بەندە.( أحمد،1999: 33). هەر بەم بۆنەیەوە پێویسـتە ئاماژە بەوە بدرێت کە وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا زۆرباش ڕۆڵی بەهاکانیان لەنەخشـاندنی کەسـێتی مرۆڤدا درك پێکردووە، بۆیە لەسـاڵی (1978)دا ڕێکخراوی (گروپی ئەوروپی بۆ لێکۆڵینەوە لەسیستمی بەهاکان)یان پێکهێناوە، ئامانجی ئەم ڕێکخراوەش

دارشـــتن‌و ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی ئەزموونگەرییە ســـەربارەت بە بەها ئاکاری‌و کۆمەڵایەتییە باوەکانی کۆمەڵگەی ئەوروپی. (Abraham,1985).

**قۆناغی منداڵی ناوەند**

لەم قۆناغەدا تەمەنی منداڵ (6-8) ســـاڵانە. ئەو تەمەنەیە کە دەچێتە بەر خوێندن‌و لەچوارچێوەی خێزان دێتەدەرەوەو تێکەڵ بەژینگەیەکی کۆمەڵایەتی نوێ دەبێت‌و پەیوەندی هاورێیەتی پێکدەهێنێت. لەناخی منداڵدا حەزی زانینی گەشـــە دەکات‌و پێیخۆشـــە ئەودیو ماڵ‌و چیاو دەروبەری شـــارەکەی ببینێت‌و پێی بگات، بیر لەئاســـمان‌و ژێر زەوی دەکاتەوەو بەدوای زانیاریدا دەگەرێت‌و پرســـیار دەکات، لەناخی خۆی‌و لەدەرەوەی خۆی دەروانی‌و رادەمێنێت. بەلای ئەدەبیاتدا ئارەزوومەندەو چێژ لەو چیرۆك‌و حیکایەتە خورافی و فۆلکلۆریانە وەردەگرێت کە لەگەڵ ژینگەو واقیعەکەی خۆیدا یەکدەگرنەوە.(ئاشـــتی،1999:71-72). هەر لەم تەمەندایە کە تامەزۆی ئەدەبی ئەندێشـــەیی خەیاڵییەو بەبیســـتنی حیکایەتی جنۆکەو دێو و شـــەیتان‌و کورتەبالاکان ئاســـوودەو دڵخۆش دەبێت، بۆیە دەکرێت ئەم قۆناغە بەقۆناغی ئەندێشـــەی ئازاد ناوزەد بکرێت. (أبومعال،1988:22-25). ئەندێشـــەی منداڵ داهێنەرانەیەو هەندێجار بەرەو ئامانجی زانســـتی پەلدەکێشـــێت، چونکە بەخێرایی گەشـــە دەکات‌و رووی لەئاســـۆی دوورەو لەســـنوری ژینگەو دەوروبەرەکەی خۆی تێدەپەرێت. زمانی منداڵ لەم قۆناغەدا زمانی جوڵەیە، بۆیە چالاکی‌و جوڵە ئەو دەروازەیەن کە دەبێت لێیانەوە بچینە جیهانی فێربوونی منداڵەوە، وەرزش‌و یاریکردن ئەو ئامرازە ســـەرنجراکێش‌و کاریگەرەن کە ســـەرچاوەن بۆ وەرگرتنی ئەزموون‌و شـــارەزایی (الهیتي، 1988:87).

## ڕێکارییەکانی توێژینەوە:

### میتۆدی توێژینەوە:

بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی توێژینەوە، میتۆدی وەسفی بەکارهێنراوەو پشت بەشێوازی شیکاری ناوەڕۆك (Content Analysis) بەستراوە. کە یەکێکە میتۆدە بەکارهێنراوەکان بۆ لیکۆڵینەوە لەناوەڕۆکی بابەتە نووسراو بیستراوو بینراوەکان، ئەویش لەرێی دارشتنی پلانێکی تۆکمەوە بۆ هەڵبژاردنی سامپڵێك لەمادەکەو پاشان دیاریکردنی پۆلێنی بەهاکانو شیکردنەوەی لەڕووی چەندێتی و چۆنێتییەوە. (طعيمه، 1986: 23 ).

سنوری ئەم توێژینەوەیە کتێبی (خوێندنەوەی کوردی)یە بۆ پۆلی دووەمی بنەڕەتی، چاپی پێنجەم سالی (2012)، کە لیژنەیەك لەوەزارەتی پەروەدەی هەرێم دایاننا‌وەو لەلایەن بەرێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرامو چاپەمەنییەکانەوە، بریاری لەسەر دراوە کە لەسەرجەم قوتابخانە حکومییەکانی سەر بەوەزارەتی پەروەردە، بخوێندرێت.

دوای خوێندنەوەو پشکنینی لاپەڕەکانی ئەو کتێبە، توێژەر هەندێك پێودانگی بۆ شیکارکردنی بابەتەکان دیارکردووە. پاشان لەڕێژەی (35%) ئەو لاپەڕانەی کە شیاوی شیکارکردن بوون، بەسامپڵی وەگرتووە. بەم شێوەیەو دوای دورخستنەوەی ئەو لاپەڕانەی بۆ شیکارکردن نەشیاوبوون. هەروەك لەخشتەی (1) روونکراوەتەوە:

خشتەی (1)

لاپەڕەی تەرخانکراو بۆ بابەتەکان

| بابەت | ژمارەی لاپەڕە | % |
|---|---|---|
| بابەتو وێنە | 28 | 35 |
| هیتر | 52 | 65 |
| کۆ | 80 | 100 |

ڕێژەی (65%)ی لاپەڕەکان بریتی بوون لە بەرگ‌و پێرست و ڕاهێنان‌و چالاکی‌و پیتەکان‌و واتای ووشــەکان. ئەم بابەتانە بەپێی ئامانجەکانی ئەم توێژینەوە بۆ شیکارکردن شیاو نەبوون‌و دورخراونەتەوە. چونکە ئەو بابەتانە ئامانج لێیان ڕاهێنانە لەســەر لێوەشــاوەیی نووســین‌و دەســتوخەت‌و ژمارەکردن‌و کۆنترۆلکردنی شـێوەی پیت‌و ووشــەو ڕسـتەکان‌و ڕیزکردنی چەمکەکان. ئەم جۆرە دورخســتنەوانەش بۆخۆی زانســتییەو لەزۆربەی پرۆســەکانی شیکارکردنی ناوەڕۆکدا پەیرەو دەکرێت.

**دەســتەی شــیکار**: لەبەرئەوەی ئامانج لەم توێژینەوەیەدا، دیاریکردنی ئەو بەهایانەیە کە لەکتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەڕەتیدان، بۆیە (بەها) لەشـیکارکردنی ناوەڕۆکی ئەو کتێبەدا بەدەسـتەی شـیکار دانراوە، ئەو بەهـایـانەی کە گونجـاون بۆ ئەو تەمەنەی مرۆڤ کە قۆنـاغی منـداڵی ناوەڕاســتەو لەگەڵ خەســڵەتەکانی گەشــەو پێداویســتی ئەو قۆناغەدا دەگونجێن‌و لەبارن.

لەژێر ڕۆشـنانیی تیۆرەکان‌و ئەدەبییاتی پەروەردەییدا، دوای گەڕان‌و پشـکنینی سـەرچاوە زانسـتییە پەیوەندیدارەکان. بەمەبەسـتی شـیکارکردنی بەهاکانی نێو بابەتەکانی کتێبەکەو زانینی جۆرو ڕێژەیان، پۆلێنی وایت Whiteبۆ بەهاکان هەڵـبژێـردراوەو بەکـار هـێـنراوە ( بـکـر، 1975:47-58)، (الـعـجـیـلی، 1985:187-201)، (الـحـمـدانی، 1988: 163-177). (بـوکـانی، 2007، 178-190). هەروەك لەپـاشــکۆی (1) خراوەتەڕوو. دوای دیـاری کردنی سـامپڵ‌و بەمەبەسـتی دەستکەوتنی داتای پێویسـت، توێژەر پشـتی بەفۆرمێك بەسـتووە (هەروەك لەپاشـکۆی ژمارە(2) خراوەتەڕوو) کە بۆ ئەم توێژینەوە دارێژراوەو پاش فۆرمی شیکار کردنەکە بەچەند شارەزاو پسپۆڕێك دراوە.

**یەکەی شیکار**: مەبەست لەیەکەی شیکار ئەو ڕەگەزانەیە کە لەڕێگەیانەوە دەســتەی شــیکار، هەژمار دەکرێت، لەم توێژینەوەشــدا ڕســتەی تەواو

بەیەکەی شـــیکـار دانراوە کە بریتییە لە یەکەی هزر (Theme) وەك یەکەیەکی بنەڕەتی بۆ شـــیکارکردنی بەهاکان. واتا ئەو بەهایانەی راشـــکاوانە لەرسـتەکاندا گوزارشـتیان لێوە کراوەو بۆ هەریەك لەمامۆسـتاو قوتابی دیارو رۆشـنەو پەیپێدەبەن. هەروەها یەکەی ( چەندبارە بونەوە) بۆ هەژمارکردنی هەر پۆلێك لەپۆلی بەهـاکان بەکارهێنراوەو تێکڕای یەکەکان لەپرۆسـەی شـیکارکردندا سـەنگی وەك یەکیان پێدراوەو ئەمەش بۆخۆی رێگایەکی باوەو زۆرترین بەکارهێنانی هەیە، جگە لەیەکەی(سـم2) بۆ پێوانەکردنی رووبەری وێنەو بابەتەکانیتر.

بۆ پێوانەکردنی نەگۆڕیی یاخود جێگیری (الثبات Reliability) سـەرجەم لاپەڕە شـیکارکراوەکان. جارێکیتر توێژەر شـیکاری کردوون بەجیاوازی ماوەی زەمەنی مانگێك نێوان شـیکاری یەکەمو شـیکاری دووەمدا. بەپێی یاسـای هۆڵسـتی، برە داتای (ڕێکەوتن: الاتفاق) لەسـەر ناوزەدو پۆلێن کردنی هزرو بەهـاکان بەپێی پۆلێنەکەی وایـت دەرهێنراوە، بەجۆرێـك لەنێوان هەردوو شـیکارەکەی توێژەردا لەدووکاتی جیاوازدا کردویەتیە نزیکەی 0.90. لەرێی ئەم هاوکێشەیەوە:

$$\text{جێگیری} = \frac{\text{ن} \times \text{ناوەندی رێکەوتنی نێوان دوو شیتەڵکارەکە}}{1 + (\text{ن} - 1)\ \text{ناوەندی رێکەوتنی نێوان دوو شیتەڵکارەکە}}$$

ن: یەکسانە بە ژمارەی شیتەڵکارەکان. ( طعیمة، 1987: 181)

**هەنگاوەکانی شـــیکارکردن**: خوێندنەوەی هەر وانەیەك لەوانەکانی نێو کتێبەکە بەوردی، پاشـــان پارچەکردنی (تقطیع) هەر دەقو بابەتێك بۆ

رســـتەی تەواو، دواتر دیاریکردنی بەهای زاڵو جۆرەکەی لەرســـتەکانداو تۆمـارکردنی لەخـانەی تـایبەت بەجۆری بەهـاکە لەنێو فۆرمەکەدا. ئینجـا هەژمارکردنی چەندبارەی ژمارەی هەر بەهایەك و دەرهێنانی رێژەی ســـەدی یەکە بە یەکەی بەهـاکانو هەر گروپێـك لەگروپی بەهـاکان. ســـەبـارەت بەرووبەریش بەیەکەی پێوانەی سم2 روبەری سەرجەم وێنەو بابەتو ژانرە ئەدەبییەکان پێوانە کراوە.

## خستنەڕووی ئەنجامەکان

**ئامانجی یەکەم:** سەبارەت بەئامانجی یەکەم کە بریتییە لەدیاریکردنی رێژەی ئەو لاپەڕانەی تەرخـانکراون بۆ پێدانی بەهـاکان بەقوتابی بەبەراورد بەرێژەی گشـــتی لاپەڕەکان لەکتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەرەتیدا. لەدوای هەژمـارکردنو بەراورد کردن، توێژەر بەم ئەنجـامە گەشـــتووە، هەروەك لەخشتەی ژمارە (2) روونکراوەتەوە:

خشتەی (2)

رێژەی ئەو لاپەڕانەی تەرخانکراون بۆ پێدانی بەهاکان

| لاپەڕەی تەرخانکراو | ژمارەی لاپەڕە | روبەر سم2 | % |
|---|---|---|---|
| بۆ بەهاکان | 28 | 12376 | 35 |
| بۆ مەبەستی تر | 52 | 22984 | 65 |
| کۆ | 80 | 35360 | 100 |

شـــایانی ئاماژەیە رێژەی (35%) ی لاپەڕەکان بۆ پێدانی بەهاکان، رێژەیەکی کەمە بەبەراورد بەکۆی گشـــتی لاپەڕەکان، ئەمەش بۆخۆی مانای لاوازی بایەخدان دەگەیەنێت بەگرنگی بەهاکان لەنێو لاپەڕەکاندا.

**ئامانجی دووەم:** ســەبارەت بەئامانجی دووەم کە بریتی بوو لەدیاریکردنی ئەو بەهـایـانەی لەکتێبی خوێنـدنەوەی کوردی قۆنـاغی دووەمی بنەرەتیـدا

بەقـوتـابـیـان دەدرێـنو ریـزبەنـدکـردنـیـان بەپـێی بـایەخو دەرکەوتـنو چەندبارەبوونەوەیان. لەدوای شـــیکاری ناوەرۆکی کتێبی ناوبراو، توێژەر ئەم بەهایانەی دیاریکرد، هەروەك لەخشتەی ژمارە( 3) خراوەتەڕوو:

خشتەی (3)

ریزبەندنی بەهاکان بەپێی ریزبەندی دەرکەوتنیان

| بەها | چەندبارە | ریزبەندی |
|---|---|---|
| مەعریفە | 24 | 1 |
| تەندروستی | 22 | 2 |
| کارکردن | 21 | 3 |
| ئاکار | 13 | 4.5 |
| پێداگریوکۆڵنەدان | 13 | 4.5 |
| نیشتمانپەروەری | 12 | 6.5 |
| رۆشنبیری | 12 | 6.5 |
| راستگۆیی | 11 | 10.5 |
| چالاکی | 11 | 10.5 |
| ئەزموونی نوێ | 11 | 10.5 |
| وروژاندن | 11 | 10.5 |
| جوانی | 11 | 10.5 |
| جوگرافیای کوردستان | 11 | 10.5 |
| یەکێتی گروپ | 10 | 14.5 |
| خۆشەویستیو هاوڕێیەتی | 10 | 14.5 |
| بەهای ئابووری | 9 | 16 |
| کەسێتی روخۆش | 8 | 17 |
| لێبودەیی | 7 | 19.5 |

| | | |
|---|---|---|
| 19.5 | 7 | خۆراك |
| 19.5 | 7 | خۆشیو شادی |
| 19.5 | 7 | تەبایی/ هاوتابوون |
| 23.5 | 6 | گوزارشی خۆیی داهێنەرانە |
| 23.5 | 6 | بەخشندەیی |
| 23.5 | 6 | بنەماکانی رەفتار |
| 23.5 | 6 | پاشەکەوت |
| 26.5 | 5 | پاکوخاوێنی |
| 26.5 | 5 | زیرەکی |
| 29.5 | 4 | ئابووری |
| 29.5 | 4 | ئازادی |
| 29.5 | 4 | ملکەچی |
| 29.5 | 4 | موڵکی گشتی |
| 32 | 3 | ناشەڕانگێزی |
| 37 | 2 | خاکەڕایی |
| 37 | 2 | زمانی کوردی |
| 37 | 2 | دادپەروەریی |
| 37 | 2 | ئاسوودەیی |
| 37 | 2 | کرداری/واقعیبوون |
| 37 | 2 | بەدەستهێنان |
| 37 | 2 | کۆنترۆڵکردن |
| 37 | 2 | هێز |
| 37 | 2 | سوربوون |
| 44 | 1 | دابینکردنی ئابووری |

| | | |
|---|---|---|
| کولتوور | 1 | 44 |
| حەسانەوە | 1 | 44 |
| مێژوو | 1 | 44 |
| پێگەی خود | 1 | 44 |
| کۆ | 324 | |

بەوردبوونەوە لەخشـــتەی ژمـارە (3) بۆمـان دەردەکەوێـت، کە بەهـای (مەعریفە، تەندروسـتی، کار، ئاکار، پێداگری و کۆڵنەدان، نیشـتمانپەروەری، رۆشـنبیری گشـتی) لەریزی پێشـەوەی بەهاکاندان بایەخی زۆرتریان پێدراوە. چەنـد بەهـایەك کەمـتر دەرکەوتـوون وەك (لـێـبـوردەیی، خـاکەڕایی، پاکوخـاوێنی، ئـاســوودەیی، مێژووی کورد، کلتوری کوردی،...). هەنـدێك بەهـاش لەپـۆلـێـنی بەهـاکـانی وایـت (White)دا، بەهـیـچ جـۆرێـك دەرنەکەوتوون و بایەخیان پێنەدراوە کە ئەمانەن (گونجـان و ئاســایشی ـ هەڵچوونی، پێزانین، ڕواڵەت، ســەربەخۆیی، خۆشـگوزەرانی و ئایین). ئەم ئەنجـامەش تـارادەیەك هـاوشـێوەی ئەنجـامەکـانی تـوێژینەوەکەی (العبادی2003)یە لای ئەویش پاکوخاوێنی، یاری و وەرزشـکردن، وەرگرتنی مەعریفە، کارکردن و شانازیکردن بەنیشـتمانەوە) لەرێزی پێشـەوەدان، کەمتر لەگەڵ توێژینەوەیکەی مقدادی (1997)دا یەکدەگرێتەوە.چونکە لای ئەو بەهاکانی (هاوکاری و هەرەوەزی، خۆشـویسـتنی فێربوون، ئازایەتی، رێزگرتنی بەرانبەر، چێژوەرگرتن لەجوانی، ئارامگرتن، فێربوونی کارو بەزەیی) بەها دیارو باوەکان بوون.

ئەم بەهـایانە بەگشــتی لەچەنـد گروپێکـدا رێکخراون، لەم توێژەنەوەیەدا ریزبەندی گروپی بەهاکان بەپێی ژمارەو رێژەی دەرکەوتنیان لەخشـتەی ژمارە (4)خراوەتەڕوو:

خشتەی (4)

ریزبەندی گروپی بەهاکان

| گروپی بەها | چەندبارە | ریزبەندی |
|---|---|---|
| کۆمەڵایەتییەکان | 56 | 1 |
| خۆشبارییەکان | 46 | 2.5 |
| جەستەییەکان | 46 | 2.5 |
| کردارییەکان | 43 | 4 |
| مەعریفییەکان | 41 | 5 |
| نیشتمانییەکان | 35 | 6 |
| ئاکارییەکان | 30 | 7 |
| خۆییەکان | 27 | 8 |
| کۆی بەهاکان | 324 | |

**ئامانجی سێیەم**: سەبارەت بەئامانجی سێیەم کە بریتییە بوو لەدیاریکردنی رووبەری تەرخانکراو بۆ وێنەو بابەتەکانیتر لەکتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەرەتیدا. لەدوای پرۆسەی شیکاری ناوەڕۆکی کتێبی ناوبراوو پێوانەکردنی رووبەری هەر بابەتێك بەیەکەی پێوانەی (سم2)، توێژەر بەم ئەنجامە گەشتووە، هەروەك لەخشتەی ژمارە(5) خراوەتەڕوو .

خشتەی (5)

رووبەری تەرخانکراو بۆ وێنە

| بابەت | روبەر سم2 | % |
|---|---|---|
| وێنە | 2838 | 22.93 |
| هەرشتێکیتر جگە لەوێنە | 9538 | 77.06 |
| کۆ | 12376 | 100 |

لەخشــتەی پێشــوودا دەرکەوتووە کە وێنە روبەری کەمی بۆ تەرخانکراوە بەبەراورد بەباتەکانی دیکە، گەرچی وێنە لەگەیانـدنی پەیامـدا کاریگەرترەو هەرگیز نووســـین وەك وێنەی پێنـاکرێـت لەگەیانـدنی پەیـامـدا کە لێرەدا بەهاکانە.

**ئامانجی چوارەم:** ســـەبارەت بەئامانجی چوارەم کە بریتی بوو دیاریکردنی ژمارەی لاپەڕەکانی ژانرە ئەدەبییەکان لەکتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەڕەتیدا کە بەهۆیانەوە بەهاکان بەقوتابی دەدرێن. لەدوای شیکاری ناوەڕۆکی کتێبی ناوبراو، توێژەر بەم ئەنجامە گەشتووە، هەروەك لەخشتەی ژمارە(6) خراوەتەڕوو.

خشتەی (6)

ژمارەی لاپەڕەکانی ژانرە ئەدەبییەکان

| ژانەر | چەندبارە | % |
|---|---|---|
| هۆنراوە | 9 | 32.14 |
| چیرۆك | 4 | 14.28 |
| وتار | 15 | 53.57 |
| کۆ | 28 | 100 |

لەخشـــــتەی ژمـارە(6) دا دەرکەوتــووە کە چــیرۆك روبەرێـکی کەمی بـۆ تەرخانکراوە، لەکاتێکدا بۆ ئەو تەمەنەی منـدال چیرۆك کاریگەرترین ژانری ئەدەبییە بۆ گەشـــەپێدانی ئەنـدێشـــەی منداڵو فراوانکردنو بەپیتکردنی. هۆنراوە بایەخی پێویسـتی پێدراوە، ئەمەش مایەی دڵخۆشـییە چونکە منداڵ لەو تەمەنەدا حەزی بەرێتمی ووشەو هۆنراوەیەو لەرێی ئەم ژانرەوە دەکرێت بەهاکان ئاراستەی بکرێن.

**دەرئەنجامەکان:**

دوابەدوای شـــیکاری ناوەڕۆکی کتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەڕەتیو خستنەرووی ئەنجامەکان بەپێی ئامانجەکانی توێژینەوە، توێژەر بەم دەرئەنجامانە گەیشتووە:

1. ڕێژەی ئەو لاپەڕانەی کە بەهـایـان لەخۆگرتووە، زۆر کەمن. زۆربەی لاپەرەکان بۆ چالاکیو راهێنانو پێرســـتو ناونیشــانو مەبەســـتی دیکە تەرخـانکراون. جگە لەوەی روبەرێکی گەورە لەســـەرجەم لاپەرەکـان هیچ ســـودێکیان لێوەرنەگیراوەو ســـپینو رەنگاورەنگ نەکراون. ئەمانە بوونەتە مـایەی ئەوەی کە کتێبەکە کێشـــی قورس بێو بەقەبارەش گەورە بێـت، خودی لاپەرەکانیش لوس (ئارت) و سەرنجراکێش نین.

2. گەورەترین چەندبارەی بەها (24) جارە. بۆیە هەر بەهایەك لەنیوەی ئەو ژمارەیە زیاتر چەندبارە بوبێتەوە، بە بەهای باو هەژمار کراوە. بەم پێیە بەها باوەکانی نێو کتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەڕەتی، بریتین لە (مەعریفە، تەندروســتی، کار، ئاکار، پێداگریو کۆڵنەدان، نیشـتمانپەروەری، رۆشـــنبیری گشـــتی). ئەمانەش بەدوایاندا هاتوون (راســـتگۆیی، چالاکی، ئەزموونی نوێ، وروژاندن، جوانی، جوگرافیای کوردســـتان، یەکێتی گروپ، خۆشـــەویســـتیو هـاورێیەتی). چەنـد بەهـایەك کەمتر دەرکەوتوون وەك (لێبوردەیی، خـاکەڕایی، پاکوخـاوێنی، ئـاســـوودەیی، مێژووی کورد، کلتوری کوردی،...). ئەم بەهـایانەش لەپۆلێنی بەهاکانی وایت (White)دا، بەهیچ جۆرێـك دەرنەکەوتوونو بـایەخیـان پێنەدراوە (گونجـانو ئـاســـایشـــی هەڵچوونی، پێزانین، ڕواڵەت، سەربەخۆیی، خۆشگوزەرانی و ئایین).

3. ریـزبەنـدی گـروپی بەهـاکـان بەم شـــێوەیەیە (کـۆمەڵایەتـیـیەکـان، خۆشـــبـارییەکـان، جەســـتەییەکـان، کردارییەکـان، مەعـریـفـیـیەکـان، نیشتمانییەکان، ئاکارییەکان، خۆییەکان).

4. روبەری وێنەکان لەلاپەرەکانی کتێبەکە بچوکەو پانتاییەکی کەمی بۆ تەرخانکراوە بەبەراورد لەگەڵ نووسینەکاندا، ژمارەی رەنگەکان کەمن و هارمۆنیەتی رەنگەکان وەکو پێویست نییەو بەشێکی زۆری لاپەڕەکان سپییەو نە بۆ وێنەو نە بۆ نووسین سودی لێوەرنەگیراوە.

5. بایەخدان بەژانری ئەدەبیی هۆنراوە لەئاستێکی باش و پەسەندداپە، بەڵام چیرۆك بۆ گەیاندنی بەهاکان، وەکو پێویست سوودی لێوەرنەگیراوە.

**راسپاردەکان:**

لەژێر رۆشنایی ئەو دەرئەنجامانەی کە لەشیکاری ناوەرۆکی کتێبی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەڕەتی پێیگەیشتن و بەو مەبەستەی ئەو پرۆگرامەی خوێندنی بنەرەتی و خزمەتی زیاتر بەرۆڵەکانمان بگەیەنێت، توێژەر ئەم راسپاردانە دەخاتە بەردەم بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکانی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان:

1.زیادکردن و دەوڵەمەنکردنی ناوەڕۆکی پرۆگرامی خوێندنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەڕەتی بەبەهای زیاتر، چونکە ژمارەی لەپرۆگرامەی خوێندندا نزیکەی (324) بەها بەدی دەکرێت، ئەم ژمارەیەش وەکو پێویست نییەو دەکرێت بەهای زۆرتر لەخۆ بگرێت. هەروەك ئاشکرایە ناوەڕۆکی پرۆگرامی زمان و خوێندنەوە بەبەراورد بەناوەڕۆکی پرۆگرامەکانیتر وەك بیرکاری و زانست و...تاد، شیاوترو لەبارترە بۆ جێکردنەوەی بەهاکان.

2. لەگەڵ بەرەوپێشچوونی مرۆڤایەتیدا دەیان بەهای نوێ دێنە ئاراوەو دەبێت لەکاتی دانانی پرۆگرامدا بەهەند وەربگیرێن. بەتایبەتیش ئەو بەهایانەی کە ئەندێشەی منداڵ فراوان دەکەن و پرسیاری لەلا دەوروژێنن، بۆیە چیرۆکی خەیاڵی زانستی و حیکایەتی فۆلکلۆری ئەو مەبەستە بەباشی دەپێکن. لەبەرئەوەی لەم قۆناغەی تەمەنی منداڵدا ئەندێشەی منداڵ گەشە

دەکات، هەروەها دەبێت زیاتر جەخت لەســەر بەهاکانی وەرزش و جوڵەو یاریکردن بکرێتەوە.

3. ســەرباری گەورەیی رێژەیی لاپەڕەکانی کتێبەکە، بەڵام وەکو پێویســت، ســوودی لێوەرنەگیراوە، بۆ ســود وەرگرتنی تەواو لە لاپەڕەکانی کتێبەکە باشتروایە:

- تەواوی روبەری لاپەڕەکە بۆ وێنەو نووسین سودی لێوەربگیرێت، بۆشاییە سپییەکان تا ئەوپەڕی سنور بچوکبکرێتەوە.
- قەبارەی نووســین گەورەتر بێت بەجۆرێك لەگەڵ قەبارەی لاپەڕەکەدا بگونجێت و هاوسەنگ بێت.
- جۆرێك پەڕە بەکاربهێنرێت کە ســەرنجراکێش و دڵگیر بێت لەرووی کوالیتییەوە.

4. باشــتروایە وێنەکان گەورەتر بکرێن، جوانتر بن و بەهای زیاتر لەخۆبگرن، ڕەنگەکان رەونەقیان پێبدرێ و ئەوەندە کاڵ نەبن، لەروبەری ڕەنگی (سپی)یش تا دوا ئەندازە کەمبکرێتەوە.

**پێشنیارەکان:**

توێژەر ئەم پێشــنیارانە دەخاتە بەردەم توێژەران تا لەئایندەدا لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی لەسەر ئەنجام بدەن:

1. شیکاری ناوەڕۆکی کتێبی خوێنەوەی کوردی قۆناغی دووەمی بنەڕەتی لەژێر رۆشنایی بنەما دەروونییەکانی قوتابیاندا.
2. بەهاکان لەکتێبی خوێنەوەی کوردی لەقۆناغەکانیتری خوێندنی بنەڕەتیدا.
3. بەهاکان لەکتێبی زانســت بۆ هەمووان و بەراودکردنی لەگەڵ بۆچوونە هاوچەرخەکانی زانستدا.
4. بەراوردکردنی ناوەڕۆکی کتێبی خوێندنەوەی کوردی لەگەڵ کتێبی خوێندنەوە لەوڵاتانی پێشکەوتوودا.

## سەرچاوەکان:

1.أبومعـال، عبـدالفتـاح (1988)، أدب الآطفـال، دراســـة وتطبيق، دار الشروق للنشر، عمان . الاردن.

2.أحمد ،عبد الكريم محمد(1999)، القيم التي ينبغي أن تتضـــمنها كتب القراوة والمحفوظات للصفوف الثلاثة الوسطي من مرحلة التعليم الآساسي في الجمهورية اليمنية رسالة ماجستيرغيرمنشورة.

3.احمد، لطفي (1983) القيم والتربية، المملكة العربية السعودية، الرياض، دار المريـخ

4.اشـتي، شـوكت (1999)، القيم الاجتماعية في ادب الاطفال، دار النضال، ط1، بيروت.

5.الأصالة والمعاصرة،( ط 1)، دار الفرقان، عمان، الأردن.

6.الكيلاني، ماجد عرسان ( 1988). فلسفة التربية الإسلامية (ط 2)، مكتبة هادي، مكة المكرمة، السعودية.

7.بكر، محمد الياس (1975)، دراســـة مقارنة في القيم بين طلبة جامعة والثانوية، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية التربية، جامعة بغداد.

8.بوكاني، صـــابر بكرمصــطفي (2007): القيم في مجلات الاطفال باقليم كوردســتان، أطروحة دكتوراه غير منشــورة، كوية، كلية العلوم الاجتماعية، جامعة كوية

9.حسين، سمير محمد (1982) : تحليل المضمون ، عالم الكتب، القاهرة.

10. الحمداني، خالد خيرالدين ياســين (1988)، القيم الســائدة في كتب المطالعة للمرحلة المتوســطة في الجمهورية التركية، رســالة ماجســتير غير منشورة، كلية التربية، جامعة بغداد.

11. زاهر،ضياء (1986). القيم في العملية التربوية، ط 2، مؤسسة الخليج العربي، القاهرة.

12. طعيمة، رشـــدي (1987) : تحليل المحتوي في العلوم الإنســـانية ، مفهومه ، أسسه ، استخداماته ، دار الفكر العربي، القاهرة
13. العجيلي، شـــذي عبدالباقي محمد (1985)، دراســـة مقارنة للقيم في كتب المطالعة العربية للمرحلة الثانوية في الوطن العربي، أطروحة دكتوراه غير منشورة، بغداد، كلية التربية، جامعة بغداد.
14. غراب, يوســـف (1995): القيم في منظومـة التعليم المصريـــي, الإشـــكاليات والرؤي المســـتقبلية, القاهرة: صـــحيفة التربية, رابطة خريجي المعاهد والكليات, مصر.
15. فاضل، خليل ابراهيم : معايير واساليب تنظيم محتوى المقرر والكتاب المدرسي في مادة التاريخ، المجلة العربية للتربية، المجلد 14، العدد الثاني ، المنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم ،١٩٩٤
16. فرحان، اسحق، و مرعي، توفيق و بلقيس، أحمد ( 1984). المنهاج التربوي بين الأصالة والمعاصرة، ط 1، دار الفرقان، عمان، الأردن
17. محمد، مجيد مهدي (1999) : المناهج وتطبيقاتها التربوية ،الموصل، جامعة الموصلم
18. مقدادي, محمد فخري (1997): دراســـة تحليلية للقيم التربوية في كتب القراوة العربية في مرحلة التعليم الَاســـاسي في الَاردن بين الملحوظ والمتوقع, الجامعة الَاردنية, مجلة دراسات, مجلد 24, عدد1, يَذار 1997
.
19. الهيتي، هادي نعمان (1988)، ثقافة الَاطفال، عالم المعرفة 123- الكويت.
20. Baldridge, J(1980): Sociology. New York, John Wily.
21. Smith,S.and P.De Shertanin :(1994) values clarification , PhiDelta

Abraham, Mel David, G (1985). Values and social change in Britain London. The Macmillian Press ltd

.22 www.abegs.org/Aportal/Research/GolfResearchDetails?id=13

.23 القيم المتضمنة في كتب القراوة للصفوف الآربعة الآولي من التعليم http://www.arabtimes.com/portal/article_display.cfm?ArticleID=22775

## پاشکۆی (1)

## پۆلێنی (وایت)ی پەرەپێدراو

### گروپی بەها کۆمەلایەتییەکان:

•یەکێتی گروپ: واتا پەیوەســـتبوون بەگروپو هاوکاری کردنی، بەشـــدار بوونی کـارا لەچـالاکی گروپـدا، ئینتیمـاو هۆگری بۆ گـروپو رێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان، گیانی دەستەجەمعی، گیانی کارکردن لەتیمدا.

• کەسێتی رووخۆش: هەموو ئەو خەسڵەتانە دەگرێتەوە کە وا لەتاکەکەس دەکەن رووخۆشو خۆشەویست بێت. کەسی دڵگیرو زمانشیرینو زمانپاراو.

• بنەماکانی رەفتار: واتا پەیرەوکردنی بنەماکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی دروست. رێزدارو شیاو لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە. رەوشتجوانو ئاکار بەرز.

• خاکەڕایی: واتا زیادەڕۆیی نەکردنو خۆهەڵنەکێشـان. بێ فیزیو خۆبەشـت نەزانین. زیادڕەوی نەکردن لەهەوڵدان بۆ سەپاندنی خود بەسەر کەسانیتردا، بەمەبەســـتی کارتێکردنو خۆجیاکردنەوە لێیان. هەوڵنەدان بۆ راکێشـــانی ســەرنجی کەســانیتر (وەك بایەخدان بەڕواڵەت) خۆهەڵنەکێشـان. خۆی وا دابنێت کەسـانیتریش وەك خۆی بەتواناو لێوەشـاوەنو ئەو نرخەی بۆ خۆی دایدەنێت یەکســانە بەو نرخەی بۆ کەســانیتری دادەنێت. بەرگەی هەڵەی خەڵکی بگرێت.

• تەبـایی/ هـاوتـابوون: واتـا رێکردن لەگەڵ کەســـانیترداو رەزامەنـدییـانو تەبابوون لەگەڵیـانـدا، لاســـایی کردنەوەو شـــوێنی هەڵگرتنیـان. کارکردن بەجۆرەی کە لەکەسێك چاوەڕوان دەکرێت کە لەگەڵ خەڵکیدا ژیا بێت.

• بەخشـــندەیی: واتا ئەو کارەی کە ســـوودی خەڵکی تیدایە. بەخشـــشو بەخشــندەیی. چاکەکاریی، خۆنەویســتیو ئازایەتی. هاوســۆزی و یارمەتیدانی کەسانیتر.

• لێبووردەیی: بەرگەگرتن‌و لێبووردەیی دەگرێتەوە لەبەرانبەر رەفتاری خراپی کەسانیتردا: سەرزەنشت نەکات‌و تورە نەبیّ‌و کینەلەدڵ نەگریّ‌و شەڕانگێزی نەنوێنێت، ئارام‌و هێمن بیّ. ئەگەر کەسێك بەدرەفتاری لەگەڵ بکات: ئەم تۆڵە نەکاتەوەو رقهەڵنەگریّ‌و توندوتێژی بەکارنەهێنێت، کاتێك ئەم کاردانەوەی بۆ بلوێت، نەیانکات‌و تا پێیدەکرێت لێبووردنی هەبێت.

• خۆشەویستی‌و هاورێیەتی: بریتییە لە

1. خۆشەویستی رەگەزی بەرانبەر: واتا تاکەکەس لای رەگەزی بەرانبەرەوە؛ خۆشەویست‌و پەسەندکراو بێت‌و پەیوەندییان لەگەڵدا ببەستێت‌و هاوبەشیان بێت.

2. خۆشەویستی خێزان: خۆشەویستی (باوك‌و دایك‌و خوشك‌و براو منداڵ) بۆیەکتری، خۆشەویستی بۆ ماڵ‌و کات بەسەربردن لەگەڵ کەسوکاردا. پەیوەندی خێزانی دروست. حەزکردن بەوەی منداڵی ببێت‌و بەخێویان بکات‌و لەئامێزیان بگرێت.

3. هاورێیەتی: واتا تاکەس هاورێی هەبێت، کاتیان لەگەڵدا بەسەر بەرێت، هاورێکانی بیانەوێت‌و دەستخۆشی لێبکەن. لەنێو ئەو گروپەدا پەسەندکراو بێت کە هاوتەمەن‌و هاورەگەزی کەسەکەن. کەسانیتر لێی تێبگەن‌و کۆمەڵایەتی بێت و حەز بەتێکەڵبوونی کەسانیتر بکات.

**گروپی بەها ئاکارییەکان:**

• ئاکار: واتا پەیوەست بوون بەخەسڵەتە باشەکانی مرۆڤایەتییەوە. چاکە بەمانا ئاکارییەکەی، کاری باش‌و رێزگرتنی مافی کەسانیتر، وابەستەبوون بەوەی ویژدانی خۆی پێیدەڵێت لەکاتی هەڵەدا، چاکە کە پێچەوانەی خراپەیە.

• راســـتگۆیی: دژی درۆکردنە. بەکردەوە ووتەکانی بســـەلمێنێت. راســـتی نەشـــارێتەوە. جێگای بڕوا بێت، نهێنی پارێز بێت، بەئەمەك بێ‌و بەڵێنەکانی بەرێتەسەر، ئەو کارە بکات کە خەڵکی پێیان سپاردووە.
• داپەروەریی: دادپەروەر بێت لەبڕیارو قســـەکانیدا. یەکســـانی. دژ بەو ســـتەمەی حەزی پێناکات‌و بڕیاری ســـتمکارانە دەرنەکات. بەرلەوەی بڕیاری دادپەروەرانە بدات مێشك کراوە بێت‌و هەموو لایەنەکانی بابەتە وەربگرێت، رەخساندنی هەلی یەکسان.
• ملکەچی: بەبێ زۆرلێکردن ملکەچایەتی بکات، پاشـــکۆیانە رەزامەنـدی نەدات، هاوڕاو هاودەنگ بێت لەگەڵ دەسەڵاتداران‌و بەرپرسان بۆ جێبەجێ کردنی یاساو سیستم‌و بڕیارەکان.
• ئـایین: بـاوەڕ بوون بەخـواو پێغەمبەر، یـان هەر بیرۆکەیەك گەورەیی‌و پیرۆزی خواو پێغەمبەرو کتێبە پیرۆزەکانی لەخۆگرتبێت. رێزگرتنی رێورەســـمە ئایینییەکان، نوێژکردن، رۆژوگرتن، پەرستن‌و سەردانی پەرستگا.

**گرووپی بەها جەستەییەکان:**

• خۆراك: بایەخدان بەخواردن‌و خواردنەوە، تێرکردنی برسێتی‌و تینوێتی.
• حەوانەوە: دورکەوتنەوە لەکارو ماندوو بوونی جەستەیی‌و عەقڵی. نەبوونی ماندووێتی‌و شەکەتبوون. خەوتن‌و حەوانەوە.
• چالاکی: چالاکی جەستەیی (نەك مێشك)، وەرزشی جەستەیی، لەشسوکی‌و ژیانی چالاك‌و گورجوگۆڵ لەدەرەوەی ماڵ‌و لەهەوای کراوەدا.
• تەندروســتی: پەیرەوکردنی تەندروســتی لەش، نەبوونی نەخۆشی، یان هەر شـــتێك کە مەترسی هەبێت بۆ لەش (نەخۆشی، ئازارو ئێشیـــ دەرەکی)، ئاسایشی جەستەو چاکبوونەوە لەنەخۆشی‌و ئێش‌و ئازار.

• خۆشـگوزەرانی: ژیانی خۆش. هەموو تێربوونو خۆشیو چێژێکی جەستەیی کە لەبەها جەستەییەکانی پێشوودا ئاماژەیان بۆ نەکرابێت. خۆگەرمکردنەوە لەکاتی سەرماو خۆفێنکردنەوە لەکاتی گەرمادا.

• پاکوخاوێنی: پیسـی لابردن، پاککردنەوەی دەسـتو جەسـتەو جلوبەرگ، نەبوونی پیسـیو بۆگەنی ناخۆش، رزگاربوون لەپیسـاییو بێزلێکراوەکان، بایەخدان بەخاوێنی ماڵو قوتابخانەو شەقامی ژینگە.

گروپی بەهای خۆشباری:

• ئەزموونی نوێ: چێژوەرگرتن لەهەر چالاکییەك کە گۆڕانکاریو هەمەجۆری لەخۆگرتبێت. گۆڕانکاری بەمەبەسـتی دورخسـتنەوەی پەسـتیو بێزاری، بەسـەربردنی کات لەخولیاکاندا، یاری، ئاهەنگ، سـینەما، تەلەفزیۆن، شـانۆگەریو پرۆگرامی رادیۆیی، چاودێری کردنی پێشـبڕکێو رووداوەکان، گەشت، خوێندنەوەی رۆمانو بەدواچوونی هەواڵەکان.

• وروژانـدن: گوڕوتینی ئەزموونی نوێو، هەسـتونەسـتی تونـدوتیژ، وروژاندن، سـەرچڵی، قومارکردن، گرەوکردن، خواردنەوەی مەی، چیرۆکی ترسو لەڕادەبەدەر، چێژوەرگرتنو شـاگەشـکەبوون بەقەدەغەکراوان یان ئەوانەی مەترسیدارن.

• جوانی: چێژو خۆشی وەرگرتن لەدیمەنو دەنگو مۆزیكو نیگارو شـیعرو ڕەنگو ریتمو گۆرانیو سروشـتی جوانو جوڵەی شـەنگو خاوەنداریکردنی جوانی.

• خۆشیو شـادی: پێکەنین، گاڵتەکردن، دەسـتبازی، بەزم، هەر شـتێك پەیوەندی بەشـتە کۆمیدییەکانەوە هەبێتو مایەی پێکەنین بێت، نەبوونی جدیات.

• گوزارشتی خۆیی داهێنەرانە: ئەندێشەو وێناکردن، ئەنجامدانی هەر کارێك کە جۆرێك لەبنەماکانی وێناکردن یان ئەندێشـەی تێدا بێت (نووسـینی چیرۆك یـان شـیعر)، هەر شـتێـك بکرێـت کە هەموو یـان هەندێـك

لەڕەگەزەکانی ڕەســـەنایەتیو نوێگەرییان پێوە دیار بێت یان لەئەندێشـــەوە سەرچاوەی گرتبێت. دەستپێشخەریو داهێنانو ئەفراندن.

**گرووپی بەها خۆییەکان:**

• گونجانو ئاسـایشیـ هەلچوونی: ئارامی مێشـك، هەسـتنەکردن بەترسو دڵەڕاوکێ، جێگیری، هەست بەنامۆیی نەکردن، سڕینەوەی هەر شتێك ببێتە مـایەی هەلـچـوونی کـۆمەڵایەتیو ڕووبەڕونەوەی، دورکەوتـنەوە لەو هەڵوێســتانەی کە دەبنە مایەی دڵەڕاوکێ. هەر شـــتێك ئاماژە بێت بۆ دەروونددروسـتی، هاوسـەنگی (سـەلامەتیو عەقڵدروسـتی)، پەسـەندکردنی کەسێتی.

• ئاسوودەیی: شادمانی، دڵخۆشی، گەشبینی، شادیو قەناعەتکردن.

• بەدەســـتهێنـان: دەرچوونو ســـەرکەوتن لەکـارو چـالاکیو ڕەفتـاری جۆراوجۆردا، پڕهیوایی، هەوڵو تێکۆشان بۆ سەرکەوتن، لەقوتابخانەدا باش بێتو نمرەی بەرز بەدەست بهێنێت، دەستکەوت بەبێ یارمەتی کەسانیتر.

• پێزانین: پێزانینی کۆمەڵایەتی بۆ توانـاو لێهـاتوویيو بەدەســـتهێنـانو ســـەرکەوتن، ڕێز، پلەو پێگەو پایە، بایەخپێدانو بنەماڵەی ناودارو شـــوێنی نیشتەجێبوونی دیارو باڵا.

• پێگەی خود( ڕێزی خود): بڕوا بەخۆبوونو پشـــت بەخۆبەســـتن، خۆبەکەمو خۆبەهیچو بەخۆبەسووك نەزانین، کامڵبوونی ناوەکی تاکەکەس.

• کۆنترۆلکردن: کۆنترۆڵو دەسـەڵات بەسـەر کەسـانیتردا، هێزو کاریگەری، بوونی پێگەو پایە، سەرکردایەتی دەسەڵاتخواز.

• شـەڕانگێزی: توڕەبوونو دوژمنایەتی، سـەپاندنی هێز بەسـەر کەسـانیتردا، شـــەڕکردن، ئازاردان، تێکشـــکاندن، ڕەقیو توندوتیژی (بەدەر لەچوارچێوەی یاریو گاڵتەو دەسـتبازیدا)، تۆڵەسـەندنەوە، چاوسـورکردنەوەو هەڕەشـەی

بەهێز، تێکدانو وێرانکاری، کوشـتنو حەقسـەندنەوە، سـەرکەوتن لەشـەرو جەنگدا نەك لەپێشبڕکێو کێبڕکێدا.

• هێز: هەموو ئاماژەیەك بۆ هێزی جەستە(قەبارەی لەشو هێزی لەش).

• پێداگریو کۆڵنەدان: ئازایەتیو دەسـتکردنەوە، ڕای جێگیرو توندیو ڕەقی، چاونەترسـان، بەهێزی پاڵنەری تایبەت بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئاسـتەنگو مەترسی، هێزی ویسـتو کۆڵنەدان، ڕەقیو سـووربوون، گلەیی نەکردنو نەگریانو نەکرووزانەوە، پیاوەتی، نەبەردی، نائومێد نەبوون.

• سـوربوون: سـەرجەم ڕواڵەتەکانی ئەو ڕەفتارانە دەگرێتەوە کە پێویسـتیان بەسـەرنجدان هەیە، ئاگایی، وریایی، کۆنترۆڵکردنی خودو زاڵبوون بەسـەریدا، وردیو وردبونەوە، سەرنجدان لەوردەکاری، پلاندان، بەرنامەڕێژی، تێڕوانین لەکاروبارەکان، بەجێهێنانی ئەرك بەوردی.

• سەربەخۆیی: هەستکردن بەئازادی، کەس زاڵ نەبێت بەسەریداو دەست نەخـاتە کـاروبـارەکـانیەوە، کۆتوبەنـد نەکردن، پەیوەسـت بوون بە بەڵێنەکانەوە، کارکردن بەپێی حەزو ئارەزوو، ڕێزگرتنی سەربەخۆیی کەسانیتر.

• ڕواڵەت: ڕواڵەتی باش، پۆشتەوپەرداخ، جوانی، جلوبەرگی جوانو نوێ.

**گرووپی بەها مەعریفییەکان:**

• مەعریفە(زانین): لەبەرکردنی حەقیقەتو راسـتەقینەکـان، داواکردنی زانسـتو زانیـاری، کتێـب، پەروەردەو فێرکردن، داواکردنی زانسـتو لێکۆڵینەوە.

• زیرەکی: توانای عەقڵی، هەموو خەسـڵەتێکی عەقڵیی باش، وەك یادگاو بەڵگەهێنانەوە، هەسـتی شـەشـەمو دەرئەنجام، تێگەشـتنو دانایی، زرنگی و فێڵزانی.

• ڕۆشـنبیری: ڕۆشـنبیری بەمانا گشـتییەکەی، شـارسـتانی (پێچەوانەی دواکەوتنو نـامەدەنی بوونە)، هەموو ئەو تەکنۆلۆژیـایـانەی لەڕواڵەتەکانی

شـــارســـتانین، خودچاککردن، زانینو ناســـینی بابەتە هونەریو مێژوویىو مرۆڤایەتییەکان، هەر شتێك ئاماژە بێت بۆ خۆرۆشنبیرکردن.

**گرووپی بەها کرداریيەکان:**

• کرداری (واقیعی): گونجـاوێتیو کارایی کەرەســـەکانو هەموارکردنیان بۆ گەیشـــتن بەئامانجەکان، دورخســـتنەوەی هەموو ئەو شـــتانەی ناواقیعیو ناکردارینو بۆ گەیشـــتن بەئامـانجەکان، هیچ ســـوودێکیان لێنابینرێت، دورخســـتنەوەی ئەو ئامانجانەی کە بەهیچ هەوڵێك بەدی ناهێنرێن واتا خســـتنەکاری هەوڵەکان بۆ شـــتە بەکەڵکەکانو ئەوانەی مەحاڵو ئاســـتەم نین.

• کـار: کـارکـردن بەحەزو دڵســـــۆزیـیەوە، هەوڵـدان، تەمەڵی نەکـردن، جێبەجێکردنی کاروبارەکان بەباشیو بەوردی، بەرهەمی بەهات، لێپرسراوێتی وەرگرتن، هەوڵو تێکۆشـان، کارکردنو بێکارنەبوون، کارکردن بەدڵسـۆزییەوە بۆ ماوەی درێژخایەن، لەکار نەوەســـتانو بەجێهێنانی ئەرك، رێزگرتنی کاتو پاراستنیو بەکارهێنانی بۆ کارکردنو بەجێهێنانی ئەرك.

• بەهای ئابووری: پارەو پول، کرێی بەرز، پێدانی بەهای (پێوەر، ئاســـت)ی بەرز بۆ گوزەران، ئاسـتی گوزەرانی باڵا، هەلپەو حەزی بەهێز بۆ کۆکردنەوەی سامان، دەولەمەندی، چاوچنۆکی، کۆکردنەوەو عەمارکردن.

• دابینکردنی ئابووری: دەستکەوتنی داهاتێك کە ژیانو پێویستییە زەرورەکان دابین بکـات، ترســـێـك لەئـارادا نەبێـت بۆ بەرزبونەوەی نرخو بێکـاری، دابینکردنی ئابوری، دڵنیایی، جێگیری تاكو دڵئارامی لەســـەر ئایندەی خێزان، واتا خـاوەنداری کردن لەســـنوری بەکارهێنانی تاکەکەســـیدا، صـــندوقی کۆکردنەوەو پاشەکەوت.

• مولکی گشـتی: خاوەندارێتی دەوڵەت بۆ کارگەکان، زەویوزارو کەرەسـەکانی بەرهەمهێنان، خۆماڵکردنی شـوێنە گشـتیو پیشـەسـازییە گرنگەکان، بازرگانی

دەرەکیو ناوەکی بخرێتە ژێردەستی دەوڵەتەوە، چاکسازی کشتوکاڵی، پاراستنی موڵکی دەوڵەتو کۆمەڵگەو چاککردنەوەیان، بواری گشتی.

• پاشـــەکەوت: دەســـتگرتنەوە لەخەرجییەکانو وەبەرهێنانی زیادەکەی، پلاندانان بۆ ژیانی ئابووری تاكو خێزان.

**گرووپی بەها نیشتمانییەکان:**

• نیشـــتمانپەروەری: خۆشـــەویســـتی نیشـــتمانو گرنگیدان بەو شـــتانەی بەرژەوەندیو پێشـــکەوتنو نیشـــتمانی تێدایە، دڵسـۆزی بۆ نیشـتمان، گیانی نیشتمانپەروەری، شانازی کردن بەنیشتمانو خۆشەویستی بۆی، زەحمەتی دورکەوتنەوە لێی، دانانی بەرژەوەندی نیشـتمان لەسـەرو هەموو شـتێکەوە، کارکردن لەپێناو یەکێتی نیشـتمان، هەسـتکردن بەبەرپرسـیارێتی نیشـتمانیو پاراستنی بەرژەوەندیو نهێنییەکانی نیشتمان.

• ئازادی: ئازادی نیشـتمان (رزگارکردنی)، هیچ کەسو لایەك بەسـەریدا زاڵ نەبێو دەســـتنەخـاتە کاروبارەکانیەوەو ویســـتی خۆی بســـەپێنێو بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی بیبات بەرێوە. نیشـــتمان خاوەنی ســـەروەریی خۆی بێتو داگیرنەکراو بێت، مافی چارەی خۆنووســـین، ســـەربەخۆیی، بۆنەکانی سەربەخۆیی نیشتمانو ویستی نیشتمان.

• مێژوو: مێژووی نیشـتمان، رووداوەکانی رابردوو کە پەیوەسـتن بەسـەروەری خاكو پیرۆزی نیشـــتمانو نەتەوەوە، شـــۆڕشـــەکانی رزگاری دژ بەســـتەمو چەوسانەوەو داگیرکەران.

• جوگرافیا: هەر شتێك بەگشتی پەیوەندی بەسنوری نیشتمانەوە هەبێت، شارو گوندەکان، ئاووهەوا، پێکهاتەی بەرزونزمی زەوی، رووبەری نیشتمان.

• ئابووری: بەرهەمی نیشـــتمانی، ســـامانە نەتەوەییەکانی ســـەرزەویو ژێر زەمینی نیشتمان، کشتوکاڵو بەرهەمی ناوخۆیی.

• کولتور: هەر شتێك پەیوەندی بەکولتوری رەسەنەوە هەبێت. نەبەردیو پاڵەوانیو شانازییەکان، کەسێتییە نیشتمانیو ئەدەبییەکانو بەرهەمە هزرییە مێژووییەکانیان، شوێنەواری کۆن، هەموو جێماوەیەکی شوێنەواریو هزریو هونەریو ئەدەبی کۆنی تایبەت بەنەتەوە.

• زمان: هەر شتێك تایبەت بێت بەزمانو شێوەزارەکانییەوە، راڤەکردنی زاراوەکانو روونکردنەوەی چەمکەکان، ناوی شوێنو شارو گوندەکان، شێوەزمانی پاراوو شێوەزمانی خەڵکی ئاسایی. ( بکر، 1975، ص:47-58)، (العجيلي، 1985، ص:187-201)، (الحمداني، 1988: ص163-177). (بوكاني،178،2007-190).

## پاشکۆی (2)

## فۆرمی گروپی بەهاکان

| گروپی بەها | هزر | چەند بارە |
|---|---|---|
| کۆمەڵایەتییەکان | یەکێتی گروپ | |
| | کەسێتی رووخۆش | |
| | بنەماکانی رەفتار | |
| | خاکەڕایی | |
| | تەبایی/هاوتابوون | |
| | بەخشندەیی | |
| | خۆشەویستیوهاوڕێیەتی | |
| | لێبوردەیی | |
| کردارییەکان | کرداری/ واقیعی | |
| | کار | |
| | بەهای ئابووری | |

| | | |
|---|---|---|
| | دابینکردنی ئابوری | |
| | موڵکی گشتی | |
| | پاشەکەوت | |
| جەستەییەکان | خۆراك | |
| | حەوانەوە | |
| | چالاکی | |
| | تەندروستی | |
| | خۆشگوزەرانی | |
| | پاكو خاوێنی | |
| مەعریفییەکان | مەعریفە | |
| | رۆشنبیری | |
| | زیرەکی | |

| گرووپی بەها | هزر | چەند بارە |
|---|---|---|
| خۆییەکان | گونجانو ئاسایشی هەڵچوونی | |
| | ئاسوودەیی | |
| | بەدەسهێنان | |
| | پێزانین | |
| | پێگەی خود | |
| | کۆنترۆڵکردن | |
| | شەڕانگێزی | |
| | هێز | |
| | پێداگری | |
| | سوربوون | |

| | | |
|---|---|---|
| | سەربەخۆیی | |
| | ڕواڵەت | |
| ئاکارییەکان | ئاکار | |
| | ڕاستگۆیی | |
| | دادپەروەری | |
| | ملکەچی | |
| | ئایین | |
| خۆشبارییەکان | ئەزموونی نوێ | |
| | وروژاندن | |
| | جوانی | |
| | خۆشیو پێکەنین | |
| | گوزارشتی خۆیی | |
| نیشتمانییەکان | زمانی کوردی | |
| | ئازادی | |
| | نیشتمانپەروەری | |
| | کولتوری کوردی | |
| | مێژووی کورد | |
| | جوگرافیای کوردستان | |

## پاشکۆی (2)
## نموونەی توێژینەوەیەك بەڕێبازی مێژوویی

# فێرگەو ناوەندە فێرکارییەکانیی مسیۆنەریی ئەمریکی و کاریگەرییان لەسەر ڕەوشی پەروەردەو خوێندن لەکوردستانی دەوڵەتی عوسمانی لەسەدەی نۆزدەدا

پ .ی . د . سامان حسێن ئەحمەد 2020

کلیلە وشە: فێرگە ، مسیۆنەری ئەمریکی ، کوردستان ، خوێندن
الکلمات الدالة: مدرسة، التبشیر الامریکی، کوردستان، التعلیم
المدارس والمراکز التعلیمیة للتبشـیر الامریکي و اثارهم علي الوضـع التربوی والتعلیمی في کوردستان العثماني في القرن التاسع عشر
Keywords: School, American Missionary, Kurdistan, Education
Schools and educational centers for American Missionary and their effects on the educational situation in the Ottoman Kurdistan in the nineteenth century

### پێشەکی
دوای ئەوەی مسیۆنەرەکانی ئەمریکا لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا گەیشتنە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی و دەستیان بە چالاکییەکانیان کرد ،گەلی کورد یەکێک لەو گەلانەی چوارچێوەی ئەو دەوڵەتەدا بوو، کە هەر لەســەرەتای گەیشــتنیانەوە بۆ ناوچەکە، بووە جێی ســەرنجیان و بایەخی زۆریان پێدا ،

بۆیە دوای ماوەیەک وێستگە مسیۆنرییەکانی خۆیان لە چەند شارێکی کوردستان کردەوەو دەستیان کرد بە کارو چالاکیەکانیان لە ناوچەکەدا.
وەک زانراوە، مسیۆنەریی ئەمریکی بەشێکی زۆری چالاکییەکانیان لەبواری رۆشنبیری و خوێندن و فێربووندا بووە و لەم سۆنگەیەشەوە چەندین فیرگەو ناوەندی خوێندنی پیشەیی و تەنانەت زانکۆشیان لە چەند شارێکی کوردستاندا کردۆتەوەو بە دەیان خوێندکاری کورِ و کچ لەو فێرگانەدا خوێندوویانە و کاریگەری بەرچاویان بووە لە گەشەسەندنی پرۆسەی پەروەردەیی لە ناوچەکەدا، بەڵام سەرەڕای ئەوەش تا ئێستا لێکۆڵینەوەیکی تایبەت بەم بوارە لە ناوەندە ئەکادیمییەکانی کوردستان و بگرە دەرەوەی کوردستانیش ئەنجام نەدراوە هەر بۆیە ئەم بابەتەی ئێمە هەوڵدەدات بە دواداچوون و لێکۆڵینەوە، لەرۆڵ و کاریگەریو شێوازی خوێندن و چۆنیەتی دامەزراندن و بەڕێوەجوونی ئەو ناوەندە فێرکارییانە بکات کە لەو ماوەیەدا ئەمریکییەکان لە ناوچەکانی کوردستان دایانمەزراندوەو کاریان تێدا ئەنجام داوە، بەو ئامانجەی بتوانین لە رێی پیادەکردنی چەند میتۆدێکی زانستی وەک میتۆدەکانی گێرانەوە و بەراوردکاری و شیکاری تیشکێکی زانستیانە بخەینە سەر ئەم بابەتە و لە رەهەندە جیاجیاکانی بکۆڵینەوە.
ئەم بابەتە کە بە ناونیشانی (فێرگە و ناوەندە فێرکارییەکانی مسیۆنەریی ئەمریکی و کاریگەرییان لەسەر رەوشی پەروەردە و خوێندن لە کوردستانی دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی نۆزدەدا) ەوەیە،لەسێ تەوەرەی سەرکی پێکهاتووە، کە لە تەوەرەی یەکەمدا بە ناونیشانی (دەرکەوتنی چالاکی مسیۆنەری ئەمریکی لە ناوچەکانی کوردستان)، هەوڵدراوە باس لە سەرەتای دەرکەوتنی مسیۆنەری ئەمریکی لەناوچەکانی کوردستان بکرێت و ئامازەیەکی خێرا بە کار وچالاکییەکانیان لەناوچەکەدا بکرێت، لە باسی دووەمیشدا بە ناونیشانی (ناوەندە فێرکارییەکانی مسیۆنەری ئەمریکی لە ناوچەکانی کوردستان)،ئەو چالاکیانە خراونە تە روو کە مسیۆنەرە ئەمریکییەکان لە

بواری فێرکارییەوە لە ناوچەکانی کوردستان ئەنجامیان داوە و ئاماژە بە گرنگترین ئەو ناوەندانە کراوە کە لە ناوچەکانی کوردستاندا کردوویانەوە.تەوەرەی سێیەمیش بۆ( کاریگەری فێرگە ئەمریکییەکان لەسەر دۆخی پەروەردەیی وفێرکاری کوردستان) تەرخانکراوە بۆ تاوتوێکردنی ئەو کاریگەری و لێکەوتانەی کە لە ئەنجامی کردنەوەی ئەو فێرگانەدا بەسەر دۆخی فێرکردنەو لە کوردستاندا هاتوون.

بۆ ئەنجامدانی ئەم لێکۆڵینەوەیەش پشت بە چەند سەرچاوەیەکی جۆراوجۆر بەستراوە کە هەندێکان سەرچاوەی خودی مسیونەرە ئەمریکییەکانە و هەندێکی تریشیان لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی زانستی پەیوەست بە بابەتەکەیە وهەوڵدەدەین بەپێی گرنگیان هەندێکیان شیبکەینەوە بۆ نمونە (The One Hundredth Annual Report of the American Bord Commissioners for foreign missions) کە یەکێکە لەو کتێبانەی لە سالی ۱۹۱۰ ەوە لەلایەن خودی بۆردی ئەمریکییەوە لە شاری بۆستن دەربارەی کارو چالاکییەکانی بۆرد نوسراوەتەوەو زانیارییەکی زۆر لە بارەی دەزگا فێرکارییەکانی بۆردی ئەمریکی لە کوردستان لە خۆ دەگرێت.هەروەها نامەی ماستەری مریەم کارابەکمز (Karabekmez , Meryem,(2012), The Role of Provincial Directors of Education in the Formation of Modern Ottoman Schooling ,1881-1908) کە لەسالی ۲۰۱۲ دا دەربارەی رۆڵی فێرگە بیانییەکان لە پرۆسەی گەشەسەندنی پەروەردە لە دەوڵەتی عوسمانی نووسیویەتی ولەم رووەشەوە زانیاری ورد و بەسودی لە خۆگرتوە، ئەمانە وچەندین سەرچاوەی تریش کە لە لیستی سەرچاوەکاندا ئاماژەیان پێکراوە.

**یەکەم : دەرکەوتنی چالاکی مسیۆنەریی ئەمریکی لە ناوچەکانی کوردستان**

سەرەتای کاری مسیۆنەری لە ئەمریکا بە کارەکانی رێکخراوەی بۆردی ئەمریکی بـۆ کـۆمســـــیـاری نـێردە دەرەکـیـیەکـان ( American Board of Commissioners for Foreign Missions (ABCFM)) دەستپێدەکات ،کە لە سـالّی ١٨١٠دا بەمەبەسـتی کاری مسـیۆنەری وبلّاوکردنەوەی ئاینزای پرۆتێسـتانتی لە ناوەوەو دەرەوەی ئەمریکا لە شـاری بۆسـتن دامەزرا [1]. لە سـالّی ١٨١٢ەوە نێردەکانی ئەم رێکخراوەیە روویـان کردۆتە نـاوچەکـانی رۆژهەڵات ،دوای مـاوەیـەك بیریـان لەوە کردۆتـەوە ،کـە ئەنـدامەکانیـان رەوانەی ناوچەکانی دەوڵەتی عوســمانی بکەن(Anderson,1872,ix) ، ئەوەبوو لە سـالّی ١٨١٨دا یەکەم شـاندیان کە لە (پلنگ فیکس) ( pliny fisk )و( لیڤی پێرسـونس)( levi parsons )پێکهـاتبوو رەوانەی دەوڵەتی عوسـمانی کرد ، لە سـالّی ١٨١٩دا ئەم نێردەیە گەیشـتە بەندەری ئیزمیرو یەکەم وێسـتگەی خۆیان لە مەڵاتیا کردەوە، لێرەشـەوە دەسـتیان بە گەڕان کرد لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسـمانیدا (Dogan,2013: 12-36) دواتریش هێـدی هێـدی چـالاکییەکـانیـان فراوانترکرد ئەوەبوو لە سـالّی ١٨٢١دا وێسـتگەیان لە شـاری قودس دامەزراند، لە سـالّی ١٨٢٥یشـدا وێسـتگەی بەیروتیان کردەوە (Erban,2000: 322).

لە سـالّانی دواتردا ئەم رێکخراوە زیاتر برەویان بە کارەکانیان دا لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسـمانی ئەوەبوو لە ١٨٣١دا بنکەی سـەرەکیان لە ئەسـتەنبوڵ دامەزراند، لە سـالّی ١٨٣٥یشـدا بنکەی ئورمیەیان لە سـنوری دەسـەڵاتی ئێران دامەزراند (Thomas,1853:220).

بەشـێوەکی گشـتی کارەکانی ئەم رێکخراوەیە تا دەهات لە چوارچیوەی دەوڵەتی عوسـمانیدا فراوانتر دەبوو و ژمارەی ئەندامەکانیان لە ناوچەکەدا زیاتری دەکرد بەو رادەیەی کە لە سـالّی ١٨٣٦دا ژمارەیان گەیشـتە ٤١

[1] لە بارەی دامەزراندنی ئەم رێکخراوەوە بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:( Umit ,2014:22-25)

مســـیۆنەر،هاوکات  لەچوارچێوەی فراوانکردنی چالاکییەکانیاندا لە ســـاڵی ١٨٣٥دا  هەریەکە لەوێستگەی ترابزۆن و وێستگەی ئەرزڕۆمیان دامەزراند ولە ١٨٤٩شـــدا وێســـتگەی  ئەنتـابیـان کردەوە(Erban,2000: 317؛ Kennedy,2008: 30).

لەنیوەی دووەمی ســەدەی نۆزدەدا و بەتایبەتیش  دوای ئەوەی لە 1847 دا فەرمانێکی ســـوڵتانی دەرچوو ودانی بە پرۆتێســـتانتەکاندا نا وەك ئاینزایەکی ڕێگاپێدراو لەچواچێوەی دەوڵەتی عوســـمانیدا، دواتر لە 1850 شـــدا بە تەواوی جەختی لەســـەر کرایەوە (الاسـدی،؟: 24 ) و دامەزراندنی کڵێسـای پرۆتێســتانتی لەچوارچێوەی  دەوڵەتی عوسـمانیدا  لە لایەن سـوڵتانەوە ڕێگا پێـدراوکرا  ئەوەنـدەیتر کار وچـالاکی ئەم ڕێکخراوە  لە نـاوچەکانی دەوڵەتی عوســـمانی و بەتایبەتیش ناوچە کوردییەکان فراوانتر بوو، ئەوەبوو  لەســـاڵی ١٨٥٥ بەدواوە بنکەکانی مەڕاش وئەدەنە و تەرســـوس و ئەســـکەندەرۆنەش کرانەوە (Goodell,1883: 99)و تـادەهـات گرنگیـدانیـان بە نـاوچەکانی دەوڵەتی عوســـمانی زیاتردەبوو بە رادەیەک ، کە بەپێی خودی ســـەرچاوە و ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوەکە لەکۆتایی ســـەدەی نۆزدەدا باسی دەکەن ، نزیکەی یەک لەســەر سـێی بودجەی ئەم ڕێکخراوە بۆ ناوچەکانی دەوڵەتی عوسـمانی خەرج دەکرا و بە هەزاران دۆلاریان  لەکردنەوەی کۆلیج و نەخۆشـــخانە و قـوتـابخـانە وبـنـکەی تەنـدروســـتی خەرج دەکـرد( Kennedy,2008: 49)،هـاوکات ژمـارەی مســـیۆنەرەکانیش تـا دەهـات لەزیـادبووندا بوون بە جۆرێک کە لەسـاڵی ١٨٧٥دا ١٣٧مسـیۆنەریان لە ناوچەکەدا هەبوو،کەچی لەساڵی  ١٨٩٠دا بووبە ١٧٧و لەساڵی ١٩١٣یشـدا گەیشـتە ٢٠٩ مسـیۆنەر (Erban,2000: 317 317).هەروەها تادەهات سنوری چالاکییەکانیشـیان فراوانتردەبوو بەو رادەیەی ، کە لە سـاڵی ١٨٨٠دا نزیکەی ٩٧ کڵێسـا و ٣٣٠ فێرگە لە ژێر چاودێریاندا بوو،بەڵام لە١٩١٣دا بووتە ١٦٣ کڵێساو٤٥٠ فێرگە و٩ کۆلیج ٩ نەخۆشخانە و ١٠ بنکەی تەندروستی(Erban,2000: 317).

دوای فراوانبووی چالاکییەکانیان لەناوچەکەدا بە شـــێوەیەکی گشـــتی بۆ ڕێکخســـتنی کارەکانیان بۆردی ئەمریکی وێســـتگەکانی خۆی لە دەوڵەتی عـوســـمـانی بەســـەر سێ نـاوەنـدی ســـەرەکـیـدا دابەشـــکـرد بەمجۆرە(Kennedy,2008: 32-35):

١- ناوەندی ســـەنتەری تورکیا: کە لە ئەســـتەنبولەوە بۆترابزۆن و دەریای رەش لای رۆژئاوا ولە ئیزمیریشـــەوە بۆ ســـیواسی لای رۆژهەڵاتەوە لە خۆ دەگرت.

٢-ناوەندی رۆژئاوا: کەهەرێمەکانی باشـــوری ئەرمینیاو شـــارەکانی ئەدەنەو تەرســـوس و مێرســـین لەلای رۆژئـاواوە و ئورفـا وئەنتـاب وحەلەبی لای رۆژهەلاتەوە لە خۆدەگرت.

٣-نـاوەنـدی رۆژهەڵات: لەبـاکـورەوە نـاوچەکـانی ئەرمـیـنـیـا و نـاوچە نەستورییەکان و ئاسورییەکانی لە خۆدەگرت ، کە ناوەندەکەی لە ئەرزرۆم بوو لەباکوریش خەربوت لەرۆژئاواش وان و بەتلیس لەرۆژهەڵاتیش ئامەدو ماردینی لەخۆدەگرت.

بە شـــێوەیەکی گشـــتی کورد یەکێـک بوو لەو گەلانەی کە مســـیۆنەرە ئەمریکییەکان هەر لەســـەرەتای هاتنیانەوە بۆ ناوچەکە بایەخیان پێداوە و هەوڵیان داوە زانیاریان لەبارەوە کۆبکەنەوە مەبەســـتیان بووە وێســـتگە مســـیۆنەرییەکانیان لە ناوچە کوردنشـینەکان دامەزرێنن(Umit,2014: 27 )،هەر بۆیە ئەگەر لەوێســـتگە مســـیۆنەرییە ئەمریکییەکان وردبینەوە ئەوا هەر لەســـەرەتاوە لەناوچە کوردییەکاندا کراونەوە بۆ نمونە لە ئەرزرۆم و لە ناوچەکانی ئورمییە لە ئێران ئەمە جگە لەوەی کە ناوەندی رۆژهەڵاتی بۆردی ئەمریکی وەک بینیمان تایبەت بوو بە ناوچەکانی کوردســـتان و هەندێک ناوچەی کوردیش لە چوارچێوەی ناوەندەکانیتردا بوون.

نـاوەنـدی رۆژهەڵات بەلای ئەمریکیەکانەوە ســـەرەڕای ئەوەی دژوارترین ناوەندی کارکردنیان بووە ئەویش بە هۆی سروشـــتی شـــاخاوی و ســـەختی

ناوچەکە و خراپی ڕێگاوبانەکانی ،کە وەک خۆیان دەڵێن بە هەزاران دۆلاریان تێدا خەرجکردووە لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە بە هۆی ئەوەی کە زۆربەی دانیشتوانەکی موسڵمان بوون. بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا بە پێی سەرچاوەکانی خۆیان دەردەکەوێت یەکێک بووە لە ناوەندە زۆر گرنگەکان بەلای ئەوانەوە .ئەم ناوەندە لە پێنج وێستگەی سەرەکی پێک دەهات ،بەمجۆرە: یەکەم وێستگەیان ئەرزڕۆم بووە لە باکور کە نزیکی دەریای ڕەش بووە ،لە نزیک سنوری روسیا وچەندین پزیشک و زانا و مسیۆنەری بانگخواز کاریان تێدا کردووە. دووەم وێستگەشی لە وان بووە ،کە لەوپەڕی ڕۆژهەلاتی ناوەندەکە بووە، ئەم وێستگەیە بە هۆی نزیکییەوە لەئەرمەنەکان گرنگترین وێستگە بووەو دواجاریش بووە بەگەورەترین وێستگە،ئەگەرچی کاری سەرەکی لەم وێستگەیەدا بانگخوازی بووە ،بەڵام لەهەمان کاتدا کاری فێرکاری و تەندروستیشی تێدا ئەنجام دراوە، وێستگەی سێیەمیش لەبەتلیس بووە، وەک خۆیان گوتوویانە سەختترین وێستگەی کارکردنیان بووە وناوچەیەکی داخراو بووە .چوارەمین وێستگەش لەخەربوت بووە، کە بۆ یەکەم جار قوتابخانەی فێرکاری لەوێدا کراوەتەوەو دواتریش بووە بەیەکەم کۆلیجی تێکەڵاوی کوروکچ لە ناوچەکەدا، ئەم وێستگەیە پێگەی سەرکردایەتی لەناوچەکەدا هەبووەو کارەکانی زیاتر لە گەڵ گەلی کورددا بووەو نزیکەی ٢٥ کڵێسای هەبووە وئامەد یەکێک بووە لە ناوچە گرنگەکانی سەر بەم وێستگەیە. ویستگەی پێنجەمیش لەماردین بووە، کە ناوچەیەکی بەرفراوانی دەگرتەوەو تیایدا زۆر گرنگی دەدرا بەفێرکاری و خوێندنی دواناوەندی و بەشێوەیەکی گشتی کاری ئەم وێستگەیە بڵاوکردنەوە ولە چاپدان و بانگخوازی و ڕۆشنبیری و فێرکاری و پزیشکی بوو[2].

[2] بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەم وێستگانەوە بڕوانە:(The One Hundredth...,1910: 118-123 ؛ (Kennedy,2008:27-52

لە پاڵ ئەم ناوەندەشـــدا کە تایبەت بووە بەناوچە کوردییەکان هاوکات وەك ئاماژەی پێدرا چەند ناوچەیەکی کوردی دەکەوتنە ناوەندەکانی ترەوە وەک ئەنتاب و مەڕاش و ئورفەو ئەدنەو چەند ناوچەیەکیتریش کە لەچوارچێوەی ناوەندی سـەنتەری تورکیادا بوون،کە لەم ناوەندانەدا ، ناوەندی ئەنتاب لە هەموان گرنگتر بووەو لەساڵی ١٨٤٧ەوە کاری تێدا دەستپێکراوە و لە ١٨٧٤ دا یەکەم کۆلیجی بە ناوی (ســەنترال کۆلیجی تورکی) لێ دامەزراوە لە دوای ئەویش وێستگەکانی مەڕاش و ئورفا وئەدەنە دەهاتن.

بەشێوەیەکی گشتی ئامانجی ئەم دەزگا مسیۆنەرییە ئەمریکییە بریتی بوو ، لە بڵاوکردنەوەی ئـایىزای پرۆتێســتـانتی لە نێو گەلان و پێکهـاتـە ئـاینییە جیاجیاکانی دەوڵەتی عوســمانیدا ، کار وچالاکییە ســەرەکییەکانیشــیان لە رێگـای لەچـاپـدان و بڵاوکردنەوەی نـامیلکـە وکتێـب و خزمەتگوزاری تەنـدروســتی و رۆشــنبیری و لایەنی پەروەردەیی و فێرکارییەوە ئـەنجـام دەدا(الاسـدی ،23 )، هەر بۆیە لە میانەی کارکردنیان لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوســمانیدا بە گشــتی وکوردســتان بەتایبەتی، جگە لەچالاکییەکانیتریان هاوکات چەندین فێرگەو ناوەنـدی پەروەردەییان لەئاســتە جیاجیاکانـدا دامەزرانـدووە کە کاریگەری بەرچـاویان بووە لەرەوتی گەشــەســەنـدن و پێشکەوتنی پرۆسەی فێرکاری و پەروەردەیی لە دەوڵەتی عوسمانی بەگشتی و کوردستان بە تایبەتی.

## دووەم:نـاوەنـدە فێرکـارییەکـانی مســیۆنەری ئەمریکی لە نـاوچەکـانی کوردستان

لەراستیدا هەموو ئەو دەزگا مسیۆنەرییانەی لەرۆژئاواوە دەهاتنە ناوچەکانی دەوڵەتی عوســمانی لە پێناو زیاتر بڵاوبوونەوەی بیرو باوەڕەکانیان و برەودان بەکارەکانیان بـایەخی زۆریان بە کردنەوەی فێرگە و نـاوەنـدە فێرکارییەکان داوە،کـە لە م رووەوە یەکەم فێرگەی مســیۆنەری لەلایەن مســیۆنەرە فەرەنسییەکانەوە لەساڵی ١٥٨٣دا لەدەوڵەتی عوسمانی دامەزراوە(هیاجنة ,

ملکاوی ,2014: 736)، دواتریش ورده ورەده ئـەم جۆره چـالاکییـەیـان تەشەنەی سەندوە تا ئەو کاتەی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە وەرچەرخانێکی گەوره لەم رووەوە روویـداو فێرگە مســیۆنەرییەکـان بەرێژەیەکی بەرچـاو زۆربوون، بەتـایبەتیش مســیۆنەره ئەمریکییەکان کە ســەرەڕای ئەوەی مـاوەیەکی کەمـیـش بـوو هـاتـبـوونە نـاوچەکە، کەچی زۆر بەخـێرایی چالاکییەکانیان لەم رووەوە هەموو وڵاتانی تری تێپەڕاندو توانیان تۆڕێکی زۆر فراوان لەفێرگەی ســەرتایی وناوەندی ودواناوەندی و ســمینەری تیۆلۆجی و تەنانەت کۆلیجیش لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا لە گەورەترین شارەوە تـا شـــارۆچکە و تەنـانەت گونـدەکـانیش دامەزرێنن( Ozutuk and Ozgur,2013: 64).

لەســالی ١٨٢٤دا مســیۆنەریی ئەمریکی یەکەم فێرگەی خۆی لە شـــاری بەیروتدا دامەزراند، دواتریش لە ســـالی ١٨٣١ لە ئەســـتەنبولیش فێرگەی کردەوە وهەر لەو ماوەیشــدا لەئەســتەنبول فێرگەی کچانیشــی دامەزراند( Ozgur and Muhammet,2015: 65)، لەدوای دەرکردنی مەرســـومی تەنزیمات لەســالی ١٨٣٩دا و دەســتپێکردنی هەوڵە چاکســازیخوازییەکانی دەوڵەتی عوســـمانی بواری زیاتر بۆ دامەزراندنی ئەو فێرگانە لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوســمانیدا رەخســا، هەروەها بەراگەیاندنی چاکســازی لە ســالی ١٨٥٦دا، بوارەکە فراوانتر بوو.

لە راستیدا هەر لە سەرەتاوە و بە تایبەتیش لە سەدەی نۆزدەدا ودوای زیاتر بوونی رۆڵی ئەمجۆرە ناوەندانە لە دەوڵەتی عوســـمانیدا چ لە لایەن گەلانی ناوچەکەوە بە تایبەت ئیســـلامەکان و چ لە لایەن دەوڵەتەوە لە بەرامبەر چالاکییە مسـیۆنەری و ئایینییەکانیان رێگری زۆر لە تەشـەنەکردنی ئەمجۆره ناوەندانە کرا ،لە وێنەی شـێواندنی بینای فێرگەکان و مەترسی خسـتنە سـەر ژیانی مامۆســـتاکان ، هاوکات لـە رێگای بڕیاره فـەرمییەکانەوە ، هـەوڵدرا ئاستەنگیان بۆ دروسـت بکرێت لەوانە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی مەعاریفی

گشتی(اداره المعارف العامه) ، لە سالی ١٨٦٩ دا یاسایەکی بۆ دامەزراندنی ئەمجۆرە فێرگانە دەرکرد کە تیایدا دوو مەرجی بۆ دانابوون ئەوانیش یەکەم پێویســـتە پێش کردنەوەی فێرگەکە مۆلەتی فەرمی ئیدارەت مەعاریف و والی ناوچەکە وەرگرن ،دووەمیش پێویســـتە ئەو بابەتانە دەخوێندرێن لە گەل کتێبەکاندا بخرێنە بەر دیدی ئیدارەت مەعارف، بابەتی ناکۆك لە گەل سیاسەت و ئادابی عوسمانی لە خۆنەگرن، هەروەها دواتریش لە پەیکەری کاری مەعاریفدا ئەنجومەنێکی تایبەت بە ســـەرپەرشـــتی کردنی ئەمجۆرە فێرگەیە دامەزرا بە ناونیشـــانی (مکاتب غیر مســـلمه واجنبیه مفتیشـــلك )( سالنامات نظارات معارف عمومیه,1317 : 525 )بەلام ئەمانە هەرچەندە بە مەبەســـتی ئاســـتەنگ دانان بۆ کردنەوەی ئەوجۆرە فێرگانە بوون ،کەچی سەرەئەنجام بەسودی ئەوان کەوتەوە چونکە فەرمی تری کردن هاوکات لە 1876 دەســـتورێکی عوســـمانی دەرچوو لە بەندی٢٩ دا (هیاجنه ،ملکاوی ،2014 :741) ، بڕیاریدابوو فێرگە تایبەتەکانیش بەهەمان شـــێوەی فێرگە گشتییەکان تەماشابکرێن و هەر کەسێك یان کۆمەلە کەسێك و گروپێك جا هاولاتی دەولەتی عوســـمانی بێت یان بیانی، بتوانێت فێرگە دامەزرێنێت بەو مەرجەی ســـەر بە وەزارەتی مەعاریفی دەولەت بێت وبابەتەکانی لە گەل ئەخلاقیاتی گشـــتیدا گونجاو بن، بەمەش هەلێکی باش بۆمســـیۆنەرە ئەمریکییەکان رەخسا بۆ دامەزراندنی هەرچی زیاتری فێرگەیە لەچوارچێوەی ئەو دەولەتەدا، بە شێوەیەکی گشتی سەرەرای ئاستەنگەکان بەلام لە گەل ئەوەشـــدا تادەهات ژمارەی فێرگە و فێرخوازەکانیان لە زیادبووندا بوون، بە رادەیەک کە لە ســـالی١٨٤٠دا تەنها ٦ فیرگە و٨٤ فێرخوازیان هەبوو و لە ١٨٤٥دا ژمارەکە زیاتری کرد بەو رادەیەی ، کە تەنها لە بەشی ئاســـیای دەولەتی عوســـمانیدا ١٢ فێرگەی ناوەندییان هەبوو( Ozgur,2015: 65 ؛Gokce,2010: 46-48 Muhammet and )،دواتریش لە ١٨٧٠دا ژمارەی ناوەندەکانیان بووبە٢٣٣ فێرگە و٥٨٨٠ فێرخواز، لە ســـالی

١٩٠٦یشـدا ئەم ژمارەیە هەڵکشـا و گەیشـتە نزیکەی ٤٠٦ فێرگە و٢٣٤٧٤ فێرخواز و لە کۆتایی حوکمی سـوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمیشـدا گەیشـتە ٤٣٠[3] فیرگە و ٢٣٤٤٧ فێرخواز ( Kentli,2009:75؛ Ozgur,2015:65 (Muhammet and.

سەرەڕای ئەو فێرگانە کە لە بەراییەوە تا دواناوەندی و چەندین فیرگەی ئایینی وپێشـەییان لە خۆدەگرت هاوکات لە سـاڵی ١٨٥٣دا مسـیۆنەری ئەمریکی کۆلیجی فوراتی لە خەرپوت کردەوە و لە ساڵی ١٨٦٣شدا کۆلیجی رۆبێرتی لە ئەسـتەنبول کردەوە دوای ئەوەش کۆلیجی تالاسی ئەمریکی لە تالاس لە قەیسـەری لە سـاڵی ١٨٧١ دامەزراند و لە سـاڵی ١٨٧٤ یشـدا سـینترال کۆلیجی تورکی لە ئەنتاب دامەزراند، ئەمانەو جگە لەوەی ، کە لە سـاڵی ١٨٧٦ دا ئوسکودار ئەکادیمیای ئەمریکی بۆ کچان لە ئەستەمبول کردەوە و لە سـاڵی ١٨٧٨ شـدا ئەنسـتیتوی کۆلیگیەتی ئەمریکی لە ئیزمیر کردەوە هەروەها کۆلیجی ئەدەنەی ئەمریکی بۆ کچان لە سـاڵی ١٨٨٠دا کردەوە، دواتریش لەساڵی ١٨٨٦ دا لە ئەماسیا کۆلیجی ئەناتۆلیای دامەزراند، دوای ئەوەش لە تەرسـوس، لە سـاڵی ١٨٨٨دا کۆلیجی سـانت پۆلی دامەزراند لە ١٨٩١ یشدا ئەنتەرناشناڵ کۆلیجی لە ئیزمیر دامەزراند(Akalin,2015: 9).

بەمجۆرەش دەردەکەوێت،کە بە شیوەیەکی گشتی مسیۆنەرە ئەمریکییەکان گرنگییان داوە بە کردنەوی ناوەندە فێرکارییەکان لە چوارچیوەی دەوڵەتی عوسـمانیدا کە ئەمیش زیاتر بە مەبەسی بڵاوکردنەوەی ئاینزای پرۆتێسـتانتی بووە لە نێو گەل و ئاینزا جیاجیاکانی ئەو ناوچانەدا .

لە راسـتیدا ئەگەرچی چالاکی مسـیۆنەرە ئەمریکییەکان بەشی هەرە زۆری ناوچەکانی دەوڵەتی عوسـمانی گرتبووەوە، بەڵام لە گەڵ ئەوەشـدا ئەوان زیاتربایەخیان بەگەلانی ناموسـڵمان دەدا ،وەکو جولەکە و ئاینزا

[3] ئەم ریژەیە لە نێو سەرچاوەکاندا جیاوزە کە لە هەندێکیاند تا ٤٦٠ دەڕوات ئەمەش بە هۆی نەبوونی ئاماری فەرمییەوەیە، بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە کە ریژە کە چۆن زیادی کردووە

مەســـیحییەکانی تر، تایبەت  دوای ئەوەی لەناوگەلانی  ئیســـلام زۆر ســەرکەوتو نەبوون (عیســی،2005 :  98 ، هاشـم، 2006: 147-148 ) ، ئەوان زیاتر  گرنگیان بە مەسیحییەکان دەدا لەنێوئەوانیش ئەرمەنەکان زۆر زیاتر ، چونکە  ئەرمەنەکان لە هەمو ئاین و ئاینزاکانی تری ناوچەکە زیاتر لەوانەوە نزیـک بوون  و کەوتبوونە ژێر کاریگەرییانەوە، هەر بۆیە بایەخی زۆریان بە دامەزراندنی ناوەندە فێرکاری وفێرگەکان دەدا لەو ناوچانەدا کە دانیشـــتوانی مەســـیحی وئەرمەنی لێبوون. بەو پێیەی کە لە نـاوچەکـانی کوردســـتانیش رێژەیەکی بەرچاو لە ئەرمەن و مەســـیحی دەژیان لەوکاتەدا، بۆیە وەک چۆن وەک پێشـــتر باســـکرا مســـیۆنەرە ئەمریکییەکان  هەر لەســەرەتای کارەکانیانەوە بایەخیان بە ناوچەکانی کوردســتان داوە لە رووی بانگخوازییەوە ئەوهاش  لە بواری دامەزراندنی فێرگەوە گرنگیان پێداوە و لەم رووەشـــەوە بە دەیان ناوەندی فێرکارییان لە ئاســـتە جیاجیاکاندا لە ناوچەکانی کوردستان دامەزراندووە.

هەر لە ســـاڵی ١٨٤١ ەوە (ئەســـاهیل گرانـت) مســـیۆنەری ئەمریکی کۆمەڵگایەکی فێرکاری لە ســـەر تەپۆلکەیەکی نزیـک نـاوچەی هەکاری دامەزرانـد ،کە لەفێرگەیەکو بەشـــە نـاوخۆییەک بۆ مـانەوەی فێرخوازی ناوچە دوورەکان پێکدەهات(غنیمة، 1998 :110).

لە نیوەی دووەمی ســـەدەی نۆزدەوە لە شـــاری موســـڵ دوو فێرگە لە لایەن مســـیۆنەرە ئەمریکییەکانەوە کرانەوە، کە یەکێکیان کوڕان بوو ئەوەی تریان کچان. لەکوڕانەکەدا ٦ فێرخواز هەبوو و لە کچانەکەشـــدا ١٥ فێرخواز کە فێری خوێندنەوەو نووســـین و درومان دەکران و زیاتریش جەخت لە ســـەر زمانی ئینگلیزی دەکرایەوەو لەماردینەوە پشتگیری دەکرا لەرووی کەرەستە و مامۆســـتاوە[4](عباس,٢٠١٠: ٧٩).هەرلە پەنجاکانی ســـەدەی نۆزدەدا  لە

[4] بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی موسڵەوە بڕوانە(اسماعیل ،2009: 62-65 )

شــاری خەرپوت ئەمریكییەكان چەند فێرگەیەكی ســەرەتایی كوڕان وكچانیان كردەوە ،كە تـا ســــاڵی١٨٧٦ ژمـارەیـان گەیشـــتە پێنج فێرگە،دواتریش بۆ رەخساندنی هەلی خوێندنی باڵاتر بۆ ئەو فێرخوازانەی لەو فێرگانە دەردەچوون ، لەسـەر دارو پەردووی تیۆلۆجیكەڵ سیمینەری ئەو شارە كۆلیجی فوراتیان دامەزراند، (Dennis,1893: 120) .ئەم كۆلێجە ستافێكی وانەوتنەوەی بە هێزی تێدابوو كە نزیكەی ٥٠ كەس دەبوون لە نێر ومێ و بە هەموو بەشـە جیاجیاكانیشیەوە نزیكەی ٨٠٠ خوێندكاری كوڕ وكچ تیایدا دەیانخوێند، كە ٢٠٢ یان لە پلەی كۆلیج و١٢٨یـان لە ئـاســتی ئـامـادەیی و ٤٨٥یش لە سەرەتایی بوون، ئەمە جگە لەوەی تیۆلۆجیكەل سمینەرێكیش لە خەرپوت هەبوو، هەروەها ناوەندێكی پیشـەگەریشــی لێبوو، كە چەند بەشـێكی لەخۆ دەگرت بۆ كچان و كوڕان (The One Hundredth...,1910: 122).

جگە لەو ناوچانە هاوكات لە شــەســتەكانی ســەدەی نۆزدەدا مســیۆنەرە ئەمریكییەكـان چەنـد نـاوەنـدێكی فێركـاری وخزمەتگوزارییـان لە شـــاری ماردینیش كردەوە ، لەوانەش چەند فێرگەیەكی سەرەتاییان بۆ هەردوو رەگەز كرەدەوە، دواتریش دووفێرگەی دوا نـاوەنـدیـان بۆ هەردوو رەگەز كردەوە ئەمە جگە لەوەی تیۆلۆجیكەل ســـمینەرێكیش لە مـاردین هەبوو كە تیـایـداچەنـد گەنجێـك بۆ تـاقیكردنەوەی وەزاری خۆیـان ئـامـادە دەكرد وكـۆرسی خــوێــنــدنەكەیــان ٣ تـێرمی ٨ مــانــگی بــوو( The One Hundredth...,1910: 123).

لە شـاری وانیشـدا ئەمریكییەكان چالاكی بەرچاویان لە بواری فێركاریداهەبوو بەتایبەتیش لە نێو ئەرمەنەكانـدا ، لەم رووەشـــەوە دوو فێرگەی ئـامـادەیی كچان و كوڕانیان دامەزراند[5] هەروەها ناوەندێكی پیشەگەریشیان دامەزراند

[5] لە ساڵنامەی مەعاریفی ساڵی (1317) شدا باسی ئەوە كراوە كە دوو مەكتەبی ئەمریكی لە وان بوون ، مۆڵەتەكەیان بە ناوی دكتۆر ربیۆس موە بووە (سالنامات نظارات معارف عمومیە,1317 : 1427 )

، کە هەماهەنگی لە گەڵ خانەی بێســـەرپەرشـــتاندا هەبوو ( The One Hundredth...,1910: 123 ).

لەشـــاری مەڕاشـــیش مســـیۆنەری ئەمریکی تیۆلۆجیکەل ســـیمینەری مســـیۆنەری و کۆلیجی کچانی مســـیۆنەری هەروەها کۆلیجێکی ئەکادیمی کوڕانی بە هێزیشـــیان دامەزراند، کە بەپێی ســـەرچاوەکان تیۆلۆجیکەل ســـمینەری مەڕاش لە ســـەرجەم ســـمینەرییەکانی تورکیا ذەرچووی کۆلیجی زیـاتری هەبووەو بواری فراوانی خزمەتکردنیشـــی هەبووە،هـەروەهـا لـە ســـاڵنامەدا هاتووە کە دوو فێرگەی ئەمریکی لێ بووە ،کە بەڕێوەبەرەکانیان ناویان (میس بیلکلی )و(سیمۆن کوپەلیان ) بووە (سالنامات نظارات معارف عمومیە,1317 : 1132) ، ئەمانەو ســـەرەڕای ئەو فێرگانەی کە لە هادیج وئەدەنە وئورفە کرابوونەوە لە گەڵ ژمارەیەکی زۆر فێرگە لە گوندەکاندا کە زیاتر لە ٧٠٠٠ خوێندکاریان هەبوو ( The One Hundredth...,1910: 114-115).

لە ئەنتابیش کۆلیجی گشـتی تورکیا بۆ کوڕان کرابووەوە ، کە ٧١ خوێندکاری پلەی کۆلیج و٨٦ لە ئاســـتی ئامادەیی تێدا هەبوو، هەروەها ئەکادیمیای ئەنتاب بۆ کچانیش دامەزرابوو کە زیاتر لە ١٠٠ خوێندکاری هەبوو و بەپێی ســـەرچـاوەکـان چەنـد موســـڵمـانێکیشیـــ تێـدا بووە( The One Hundredth...,1910: 116 ).

لە لایەکی ترێشـــەوە مســـیۆنەری ئەمرێکی ناوەندێکی پیشـــەیی لە ئۆرفا کردبووەوەو توانیبووی هەلی کار بۆ ٢٣٣٦ ژن و منداڵ برەخســـێنێت، کە زۆربەیان لەدروســـتکردنی دەســـەسڕیوون هەروەها بەشی پیشـەسـازیشـی منداڵەکانی رادەهێناو کارامەکانی بۆ پێڵاو دروســـتکردن وبەرگدروو و بازرگانی وئاسـنگەری و بیناسـازی دەناردن هاوکات پەیوەندی لە نێوان کێڵگەکان و خانەی بێسەرپەرشتان دروستکردبوو ( The One Hundredth...,1910: 116).

جگە لەو نـاوچـانە لە ئەرزرۆمیش فیرگەیەکی کوڕانیـان دامەزرانـد[6]، کە نزیکەی ٦٢ فێرخوازی هەبوو و ١٢یـان لە نـاوەنـدی بوون و فێرگەیەکی کچانیشـــیان کردبووەوە کە بە هەموو بەشــەکانی ١٢٣ فێرخوازی هەبوو، ئەوانیش ١٧ یان لەدواناوەندیو ١٥یان لە ناوەندی و٤١ یان لە سـەرەتایی و ٥٠یان لە باخچەی منداڵان بوون.

لەبەتلیسـیش دواناوەندییەکی کوڕانیان دامەزراند،کە ٣٦ فێرخوازی هەبوو و هەنـدێکیان لەخـانەی بێسـەرپەرشــتانەوە هـاتبوون ،هـاوکات فێرگەیەکی کـچـانـیشیـ لـێـبـوو کە نـزیـکەی ٤٨ فـێرخـوازی هەبـوو( The One Hundredth..., 1910:123).

بە پێی گوتەی مســیۆنەرەکان بێت لەســاڵی ١٨٧٦دا تەنها لە ناوەندی مسیۆنەری رۆژهەڵاتدا نزیکەی ٨٦ مامۆسـتا و٦٤ هاریکار هەبوون ( Umit 2014: 30,) جگە لەم ناوەندە فێرکارییە بەراییانە هاوکات لە ساڵی ١٨٧٤دا( ســینترال کۆلیجی تورکی) لەلایەن مســیۆنەرە ئەمریکییەکانەوە لەشـــاری ئەنتـاب دامەزرا وەک نـاوەنـدێکی بـاڵای پێگەیـانـدنی کـادری فێرکـاری و ئامادەکردنی بۆ خوێندنی وەزاری و پیشـــەیی کە لە ماوەیەکی کورتدا بوو بە یەکێک لە ناوەندە زۆر دیارەکانی ناوچەی ئەنادۆڵ(Kennedy,2008: 32)

.

راسـتییەکەی هەر لە سـەرەتای دەرکەوتنی فێرگە ئەمریکییەکانەوە دوو جۆر فێرگە هەبوون کە جۆرێکیان تەواو ئاینی بوو ، پێی دەگوترا سمینەری سکول ،ئەم جۆرە بۆ ئەوکەسانە بووکە لە سەرو تەمەنی هەرزەکارییەوە بوون لە هەردوو رەگەز ، زیـاتریش بەمەبەســتی پێگەیـانـدنی فێرخواز بوو بۆ کاری مسـیۆنەری لە نێو گەلەکەی خۆیدا یان بۆ ئەوەی ببێتە قەشـە وسـەر بەوان

---

[6] لە سالْنامە مەعاريفى باسى بوونى مەكتەبێك كراوە لە ئەرزەرۆم كە سەر بە حكومەتى ئەمريكى بووە (سالنامات نظارات معارف عموميه,1317 : 910 ).

بێت، یانیش وەک فەرمانبەر لەو فێرگانەدا کار بکات کە دەیانکردەوە،جۆری دووەمیش لەو فێرگانە، فری سـکول یان کۆمۆن سـکول بوو ،کە زیاتر لە گوندەکاندا دەکرایەوەو بۆ ئەو کەسانە بوو کە لە خوار تەمەنی هەرزەکارییەوە بوون بۆ هەردوو رەگەز ، زیاتر ئامانج لەم فێرگانەدا ئامادەکرنی مسـیۆنەری سـکیۆلارو مامۆسـتا بوو بۆ ئەو فێرگانەی دەیانکردنەوە (عباس ,٢٠١٠: ٧٨-٧٩).

سـەبارەت بەو بابەتانەی لەو فێرگانەدا دەخوێندران بە شـیوەیەکی گشـتی بۆ نێر ومێ بریتی بوون لە کتێبی پیرۆز ، مێژووی کلێسـا ، جوگرافیای کتێبی پیرۆز ، تیۆلۆجیای مەسیحی، مێژوو و جوگرافیا، فەلسەفەو فەلسەفەی سروشت، کە زیاتر بابەتەکان مرۆیی بوون بەڵام لە هەندی ناوەندیش ماتماتیک و فەلەکناسی و کیمیاش دەخوێندران، لە هەندێ ناوەندیش وەرزش و تەندروسـتی و دورومان و کاری ناومال دەخوێندران (هاشـم،2006: 153-154، الامیر ،2005: 8) هەروەها بایەخ بەزمانی عیبری و سریانی دەدرا وزمانی ئەرمەنی و تورکیش لە پاڵ زمانی ئینگلیزی بە کار دەهات لە پرۆسـەی خوێندندا، کە زمانی ئینگلیزی زمانی باوی خوێندن بوو(Dennis,1893:59 , عیسی ,2005: 131).

ئینجیل بابەتی سـەرەکی بوو لە فێرگە سـەرەتاییەکاندا و هەموو رۆژێکی خوێندن بە خوێندنەوەی چەند بڕگەیەک لە ئینجیل لە لایەن خوێندکارانەوە دەستی پێدەکردو دواتریش دەربارەی ئەو بڕگانەی دەخوێندرانەوە پرسیاریان لێدەکرا، ماوەی خوێندنیش لە رۆژێکدا شـەش کاتژمێر بوو (Dennis,1903:115).

ساڵی خوێندن لەو فێرگانەدا لە ناوەراستی پایزەوە دەستی پێدەکرد ، بەر لەوە بەچەند رۆژێک سـتافی مامۆسـتایان کۆ دەبوونەوە بۆ ئەوەی رێنماییە نوێیەکان وەربگرن لە پێناو باشـترکردنی پرۆسـەی خوێندندا(Moritz,1856:56)

دەربارەی تاقیکردنەوەش، لەو فێرگانەدا چەند جۆرێک تاقیکردنەوە ئەنجام دەدران لەوانەش تاقیکردنەوەی رۆژانە لەو بابەتانەی رۆژی پێشــوتر دەیان خوێند وتاقیکردنەوەی مانگانە لە بابەتەکان و هەروەها تاقیکردنەوەی کۆتایی سال (عباس، ٢٠١٠: ٨٥-٨٦).
زۆر جار مسـیۆنەرەکان فێرخوازە سـەرکەوتوەکانی ناوچەکانی کوردسـتانیان دەنارده ناوچەکانی تری دەولەتی عوســمانی بۆ درێژەپێدانی خوێندنی بالاتر (عباس ،٢٠١٠: ٨٢).
لە زۆربەی ئەم فێرگانە خوێندکار کە دەچونە چوارچێوەی فێرگەکەوە تا تەواو بوون بۆیان نەبو دەربچن وچاویان بە کەســانی دەرەوە بکەوێت تەنها لە رێی مۆلەتی مامۆســتای بەرپرســیارەوە نەبوایە ،خوێندن بە دەنگی بەرز رێپێدراو نەبووهەروەها خواردن لە ناو پۆلەکاندا قەدەغە بوو، دەبوو پێلاوەکان داکەنن و لەشوێنی تایبەت دایبنێن (هاشم،2006: 153-154 ) .
ئەو فێرگانە لەســەرەتادا زیاتر لەلایەن نێردە مســیۆنەری ولاتەکانیانەوە بەرێوەدەچون و مامۆســتاکان لەو ولاتانەوە دەهاتن وزۆربەیان پێشــەیان مامۆستایی نەبوو ، بەلکو تیایان دابوو پیاوی ئاینی و رووەکناس و پزیشک و ئابورینـاس بوون، بۆیە لەرووی پەروەردەییەوە تا رادەیەک کەموکورییان هەبوو، بەلام لە ســالی ١٨٦٩دا مەجلیس مەعاریفی عمومی بریاری دا ئەو فێرگانە بکەونە ژێر چاودێری وەزارەتی فێرکاری دەولەتی عوســمانی و لە ١٨٩١یشــەوە ناچاری کردن کە ئەو مامۆســتایانەی لەو فێرگانەدا وانە دەلێنەوە پێویستە دبلۆمیان هەبێت و تاقیکردنەوەی وەزارەت ئەنجام بدەن و تەواوی بابەت وســیســتەمی خوێندن لەو ناوەندانەدا لە ژێر چاودێری ئەواندا بێت (Gokce,2010: 48-49).
بۆ زیاتر رێکخســتنی پرۆســەی خوێندن لە فێرگەکانیان مســیۆنەرەکان بە بەردەوامی هەر دوو هەفتە چارێک ســەردانی ئەو فێرگانەیان دەکرد ،بۆ چاودێری کردنی پرۆسەی خوێندن وچارەسەرکردنی کێشەکان و کۆبوونەوەکردن و کوێگرتن لە

بنەماڵەی فێرخوازان و مامۆستایان لەلایەکی تریشەوە سەردانی ئەو ناوچە و گوندانەیان دەکرد کە فێرگەیان تێدا نەبوو، لەوێش بانگەشەیان بۆ کردنەوەی فێرگە دەکرد لەو ناوچەیە(عباس،٢٠١٠: ٨٥).
مسیۆنەرەکان موچەی مانگانەیان بۆ مامۆستاکان دەبرییەوە چونکە مامۆستایان زۆر جار تەواو خۆیان بۆ بواری فێرکاری تەرخان دەکرد، هەروەها کرێیان بەو خانوانە دەدا کە دەیانکردن بە فێرگە و پارەیەکی زۆریشیان لە کڕینی پێداویستییەکانی خوێندن و لە چاپدانی کتێبی قوتابخانەکان خەرج دەکرد هەروەها پارەیان دەدا بەو منداڵانەی کە دۆخی داراییان باش نەبوو و جل وبەرگیان بۆ دەکڕین(عباس، ٢٠١٠: ٨٥).
بەمجۆرەش دەردەکەوێت کە ناوچەکانی کوردستانیش وەک هەموو ناوچەکانی تری دەوڵەتی عوسمانی و بگرە لە هەندێک شوێن زیاتریش لە رووی چالاکییە پەروەردەیی و فێرکارییەکانەوە لە لایەن مسیۆنەرە ئەمریکییەکانەوە بایەخی پێدراوەو لەم رووەشە لە چەندین ناوچەی کوردستاندا فیرگەو و ناوەندی فێرکارییان کردۆتەوە لە سەرجەم ئاستەکاندا.

**سێیەم: کاریگەری فێرگە ئەمریکییەکان لە سەر رەوشی خوێندن لەکوردستان**

کردنەوەی ئەو فێرگە بیانیانە بە تایبەتیش ئەمریکییەکان بەو رێژە زۆرە لەناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی بە گشتی ولە کوردستان بە تایبەتی ،جگە لەو کاریگەرییە ی کە لە رووی موژدە بەخشی و بڵاوکردنەوەی بیرو بڕوا ئاینییەکانیانەوە هەیبوو ،هاوکات کاریگەرییەکی زۆریشیان بوو لە سەر سیستەمی پەروەردەیی و دۆخی خوێندن و فێرکاری ناوچەکە ،کە لەم رووەوە بە لای هەندێک لەسەرقاڵانی ئەم بوارەوە رۆڵی ئەو فێرگانە وەک قۆناغێکی گرنگی پێشکەوتنی سیستەمی پەروەردەی لە ناوچەکە و پەڕینەوەی لە قۆناغی کلاسیکی ئاینییەوە بۆ قۆناغی مۆدێرن هەژماردەکرێت و پێانوایە ،کە کردنەوەی ئەم فێرگانە جگە لەو رۆڵەی لەبواری بڵاوبوونەوەی خوێندەواری

لە ناوچەکەدا بینیوبەتی هاوکات رۆڵیشی بووە لە بە سیستەمکردنی بواری پەروەرد ،لە دەوڵەتی عوســـمانیدا (Kentli,2009:75) هاوکات هەندێکیان پێیان وایە ،کە سەرەڕای چەند لایەنێکی نەرێنی ئەو قوتابخانانە بەڵام رۆڵیان هەبوو لە تەکاندان بە پرۆســـەی فێرکاری ناوچەکە و پەیوەندی بەرۆژئاواوە (احمد ،1982: 42 ) .

بە شێوەیەکی گشتی ئەگەر بڕوانینە ئەو دۆخەی کە لە بەرەنجامی کردنەوەی ئەم فێرگانەدا لە ناوچەکەدا هاتە ئاراوە هەر لەو هانگاوە نوێ و کاریگەریانەی خۆیانەوە کە لە بواری فێرکارییەوە لە ناوچەکەدا گرتیانەبەر تا دەگاتە ئەو پەرچە کردارو هەنگاوانەی کە دەولەتی عوســـمانی لە بەرامبەر فراون بوونی ئەو فێرگـانـدا گرتییـەبـەر، ئەوا بەروونی دەردەکەوێـت ،کە یەکێـک لە کاریگەرییەکانی دامەزراندنی فێرگە بیانییەکان بە گشـــتی و ئەمریکییەکان بە تایبەتی لە بەر ئەوەی رێژەیان زۆر بوو بەرەو مۆدێرن بردن و بەســـیکۆلار کردنی ســـیســـتەم و دامەزراوە پەروەردەییەکانی دەولەتی عوســـمانی بوو، چونکە وەک لە ســـەرچاوەکاندا هاتووە ســـیســـتەمی خوێندن وشـــیوازی بەڕێوەبردنی تا سەرەتای سەدەی نۆزدەش لە دەولەتی عوسمانیدا لە سەر ئەو بنەمـا کلاســـیکی وترادســـیۆنییە بوو، کە لە ســـیســـتەمی خوێنـدنی ســـەلجوقییەکانەوە مابووەوە و فێرگە ترادســـیۆنییەکان و مەدرەســـەکان ناوەندی ســـەرەکی خوێندن بوون ، لەو ســـیســـتەمەدا دەوڵەت ئەم بوارەی وەک خزمەتگوزاری گشـــتی نەدەبینی و بەلای دەولەتەوە تەنهـا فێرکردنی ســـەربازو فەرمانبەرەکانی بواری بەڕێوەبردن و پیاوانی ئاینی پێویســـت بوون و بەئەرکی خۆی دەزانی ،هەروەها تا ئەو کاتەش بواری پەروەردە لەژێر چاودێری و کۆنترۆڵی عولەمادا بوون و پیاوەی گەورەی ئاینی ولات کە شـێخولئیسـلام بوو بەرپرسی ئەم بوارە بوو نەک دەولەت و لایەنی دونیایی ،هاوکات خەرجی لایەنی پەروەردەو خوێنـدن زیـاتر لەســـەر ئەو وەقفـانە بوو کە لە رێگای بەخشـین و خێری هاولاتیانەوە دەست دەکەوتن، نەک لە لەسەر بودجەی

دەوڵەت(Gokce,2010: 42 ؛Karabekmez,2012:9)، بەڵام دوای ئەوەی فێرگە بیانییەکان و بەتایبەتیش ئەمریکییەکان بەشـــێوەیەکی بەرچاو پەرەیان ســـەندو لەهەنـدێ نـاوچە بواری پەروەردەو خوێنـدن کەوتە ژێر کۆنرۆڵی ئەوانەوە، ئیدی وردە وردە بوونە مایەی مەترسی بۆ ئەو سیستەمە پەروەردەییە کۆنەی دەوڵەتی عوســـمـانی، کە نەی دەتوانی کێبڕکێی ئەو ســیســتەمە نوێیەی ئەوان بکات ، لە لایەکی تریشـــەوە بە هۆی ئەم فێرگە مســـیۆنـەرییانـەوە رێژەی خوێنـدەوار بەشـــێوەیەکی بەر فراون لەنێو نـا ئیســـلامەکـانـدا بڵاو بووەوە، هـاوکـات بەهۆی نەبوون یـان کەمی فێرگە ئیسلامییەکانیشـەوە نەخوێندەواری لە نێو ئیسلامەکاندا هەر بەردەوام بوو و فێرگە ئیسـلامییەکان و چۆنیەتی بەڕیوەبردنیشـیان لە ئاسـتێکی زۆر خراپدا بوون، ئەمانە هەمووی لە پاڵ چەند هۆکارێکی تردا بە تایبەتی دەرکەوتنی بیرۆکەی چاکســازی و هەنگاونان بەرەو ســیســتەمی رۆژئاوایی لە لای چەند دەسـەڵاتدارو سـوڵتانیکی عوسـمانی وایان لەدەوڵەتی عوسـمانی کرد بیر لەوە بکاتەوە چاکســازی لەم بوارەدا ئەنجام بدات و لەم رووەشــەوە زنجیرەیەک هەنگـاوی بنێـت، ئەوە بوو لە ســـاڵی ١٨٣٨ دا بەڕیوەبەرایەتی فێرگە داوناوەندییەکان(مەکتەبی روشــدییە نەزارەت)یان دامەزراند بۆ بەڕێوەبردنی فێرگە بەراییەکان ،کە ســـەر بە وەزارەتی ئەوقاف بوو، راســـتییەکەی ئەمە هەرچەنـد هەنگاوێکی گرنـگ بوو، بەڵام لەبەرئەوەی هەر لەژێر ســـایەی وەزارەتێکی ئـانیـدا بوو نەبووە مـایەی هەنگاوی بەرەو بە مەدەنی کردنی ئەم بوارە ،بەڵام دواتر لەســـاڵی ١٨٤٦دا (مەجلیس مەعـاریفی عمومی) یـان دامەزراند کە دەکرێت بەهەنگاوی یەکەمی مۆدیرنکردنی سیستەمی پەروەردە لەو وڵاتە ئەژماربکرێـت لەبەر ئەوەی ســـەر بە دەزگای ئاینی وڵات نەبوو بەڵکو ئەنـدامەکانی لە لایەن کۆشـــکەوە دیـاریـدەکران،کە دواتریش بووە بنەمای دەرکەوتنی وەزارەتی مەعاریف لە دواتردا، هەر لێرەشـــەوە دەســـتیان کرد بە دامەزراندی کۆلیج و ناوەندی باڵاتر بۆ پێگەیاندنی کادری پەروەدەیی

پێشــکەوتو،لە دواتریش( مەکتەبی روشــدییە نەزارەت) لە ســاڵی ١٨٤٩دا هەڵوەشایەوە (Karabekmez,2012: 8 ).

لەلایەکی تریشـــەوە هەر لە بەرامبەر ئەو فروانبوونەی فێرگە بیـانی و نـا ئیســـلامیاندا دەوڵەت هەوڵیدا پشـــتیوانی زیاتری رێکخســـتنی فێرکاری و پەروەردەی گشـــتی وڵات بکات، لەم رووەشـــەوە حکومەت فێرگەی نوێی کردەوە بۆ راهێنانی کادری پەروەردەیی پێشـــکەوتووتر، ئەوە بوو (مەجلیس معاریفی عمومی )فێرگەی مولکییەی شـاهانەی(مەکتەب مولکیە شـاهانە ) کردەوە ، هەروەها دار المعلمینو دار المعلمات و مەکتەب طوبیە مەلەکی شـاهانە وعەشـیرەت مەکتەبیو صـنائع نفیسـە و صـنائع مەکتەبی کرانەوە (ســـالـنـامـات نـظـارات مـعـارف عـمـومـیـە,1317 : 712 -546، Karabekmez,2012: 8). هـاوکات هـەر بۆ زیـاتر کۆنترۆڵکردنی لایـەنی پەروەردەیی و رێکخســـتنی ، ســـەرجەم لایەنەکانی پرۆســـەکە رێکخرانەوە و چەند بەڕیوەبەرایەتی و ئەنجومەنێك بۆ ئەم مەبەســـتە دامەزران کە لە ســـاڵنامەدا بە( دوائر ملحقە مرکزیە )ناویان هاتووە وەکو مکاتب عالیە و خســـوسی مفتیشـــی ، مبایعات قۆمســـیۆنی، مامورین متفرقە ،ئەنجومەنی تفتیش ومعاینە قلمی ومکاتب غیر مســـلمە واجنبیە مفتیشـــلك و اوراق اوطســـی و چەندینیتر (سـالنامات نظارات معارف عمومیە,1317 : 524- 518) هەروەها ســـتافی بەرێوەبردن و وانە وتنەوەی ســـەرجەم ناوەندە فێرکاریەکان رێکخران ، هاوکات بەشی پرۆگرام دانەرا وپرۆگرامەکانی خوێندنی ســـاڵانەی ســـەرجەم قۆناغەکان بە کاتژمێر و هەفتە و مانگ وســـاڵ دانران هەروەها تەواوی ئەو بابەتانە دەســـتنیشـــانکران کە لە هەر قۆناغێکدا دەخوێنـدران بـە تـەواوی وردەکارییەکانەوە (ســـالنامات نظارات معارف عمومیە,1317 : 512- 374)ئەمانەو جگە لەوەی کە رێنمایی دانران بۆ ســـەرجەم لایەنەکانی ئەرکی بەرێوەبەر و مامۆســـتاو فەرمانبەران و خوێنکار، هـەروەهـا بۆ تـاقیکردنـەوە و مـافی خوێنکارو وەرگرتنی خوێنـدکارو چـەنـدین

لایەنی تر، هەروەها دیاریكردنی بودجەی تایبەت بۆ بواری پەروەردەیی وموچەی مامۆســتا وفەرمانبەرانی ئەم بوارە دیایكرا (ســالنامات نظارات معارف عمومیە,1317 : 374 -320). بەدیوێكی تریشدا مەجلیس معاریفی عمومی بۆ زیاتر پتەوكردنی دەســەڵاتەكانی وزیاتر ئاگاداربوون لە رەوشی پەروەردەیی وڵات و زیاتر كۆنترۆڵكردنی فێرگە بیانییەكان، بە تایبەتیش فێرگە ئەمریكییەكان ( مەجلیس مەعاریفی محلی) دامەزراند لە بەشی هەرە زۆری هەرێمەكانی وڵاتدا.

بە گشتی كۆی ئەو هەنگاوانەی حكۆمەت بەرامبەر بەو فێرگانە هەڵیهێنا كە زۆرینەیان ئەمریكی بوون وهاوكات هەموو ئەو كارنەی لە بواری باشــتركردنی ســیســتەمی پەروەدەیی لە وڵات حكومەت ئەنجامی دان ، راســتەوخۆ وناراســتەوخۆ كاریگەریان لەســەر دۆخی پەروەردەیی و فێركاری ناوچەكانی كوردستان دادەنا وەک بەشێک لە سیستەمی پەروەردەیی لەو ئیمپراتۆریایە . ئەمانەو جگە لەوەی ،كە وەک پێشــتر باســكرا ئەمریكییەكان بایەخێكی زۆریان بە ناوچەكانی كوردســتان دەدا و ژمارەیەكی زۆر لە فێرگە وناوەندی فێركاریان لەو ناوچانە دامەزراندبوو ،هەر بۆیە سە رەڕای ئەوەی كە ئەركێكی زۆری دەخســتە ســەر دەوڵەت، كەچی لەســالی ١٨٨٢دا مەجلیس معاریفی عمومی گشــتاندنێكی راگەیاند دەبارەی كردنەوەی مەجلیس مەعاریفی محلی لە وان ،ســیواس، دیاربكر مامەرتالەزیزو ئەرزڕۆم، واتا لە ناوچەكانی كوردســتان ،كە هۆكاری ســەرەكی ئەم هەنگاوەش ئەوە بوو، لە بەر ئەوەی پێشــووتر دەوڵەتی عوســمــانی لە رووی پەرەوردەییەوە بە تەواوی ئەم ناوچەیەی پشــتگوێخســتبوو، بۆیە لە هەموو ناوچەكانیتری دەوڵەتی عوسمانی دواكەوتوتربوو لەم رووەوە، كە ئەمەش وای كردبوو لەو ناوچانەدا پەروەردە بەتەواوی كەوتبووە ژێر دەســتی دەزگا فێركارییە بیانییەكانەوەو بە تایبەتیش ئەمریكییەكان ، بۆیە حكومەت هەولیدا لە رێگای كردنەوەی ئەو ئەنجومەنانەوە پەروەردەی ئەو ناوچانە كۆنترۆڵ بكات،لەم رووەشــەوە لە

ســاڵنامەی مەعاریفی ســاڵی 1317 ئاماژە بە مەعاریف ئیدارسی هەریەك لە ویلایەتەکانی وان و موسڵ و مامورلتازیز وئامەد وبەتلیس و ئەرزەڕۆم، کراوە (ســـالنامات نظارات معارف عمومیه,1317 : 1423، 1402، 1368 ، 1194 ، 1048 ،900) هەر لەم پێناوەشـــدا مەجلیس مەعاریفی عمومی لە ســـالی ١٨٩٦ دا بڕیاریانـدا ئەو فێرگە ئەمریکییانە بە تەواوی بخەنە ژێر کۆنترۆڵی ئەو ئەنجومەنە خۆجەییـانەوە بەوبیـانوەی زیـانیـان بە خەڵکی ئیسلام گەیاندووە(Karabekmez,2012: 18-19).

لە لایەکیتریشـەوە زۆری ئەو فێرگانەو چالاکیان و پێشـکەوتوویان و سـەرنج ڕاکێشیان لە ڕووی بابەت وباڵەخانە وکەرەستە وتاقیگەکانیانەوە هەروەها ئەو خەرجییە زۆرەی کە مســیۆنەرەکان لە باڵەخانە و ئاســانکاری خوێندن وهاوکاری فێرخاوزەکان دەیانکرد کە بۆ ئیســلامەکانیش بە هەمانشـێوە بوو وایـان کردبوو جیـاوازییەکی زۆر لە نێوان ئەم فێرگـانە و فێرگەکـانی دەوڵەتی عوســمانیدا ببێت کە ئەمەش بەڕوونی لە ڕاپۆرتی بەرپرســە پەروەدەییەکانی دەوڵەتدا باسی کراوەو ئاماژەیان بەوە کردووە کە دۆخی فێرگە بیانییەکان زۆر لە ئیســلامیەکان باشـترن (Karabekmez,2012: 25-26)، ئەم دۆخەش وای کردبوو کە خێزانە ئیســـلامەکانیش بیر لەوە بکەنەوە منداڵەکانیان لەو فێرگانەدا تۆمار بکەن (الامیر، 2005 :9)، لە لایەکی تریشـەوە ئەو سیستەمە پێشـکەوتوە لە خوێندن بووبووە هۆی ئەوەی کە چینێکی خوێندەواری باش لە نـاو مەســـیحییەکـانـدا و بە تـایبەت ئەرمەنەکـانـدا دەرکەوێـت لە بەرامبەریشـــدا ئیســـلامەکان و بەتایبەتی هۆزە کوردەکان بە نە خوێندەواری بـمـێـنـنەوە ، هەمـوو ئەمـانەش وایـان لـە حـکـومەت دەکـرد، بـۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو چـالاکیـانەی فێرگە بیـانییەکـان وبە تـایبەتیش ئەمریکییەکان ئەو مەجلیسانە لەو ناوچانەدا بکاتەوە و هەروەها هەوڵبدات چەند فێرگەیەک لەو ناوچانەدا بکاتەوە، تەنانەت بیر لە کردنەوەی فێرگەی پیشەییش بکاتەوە، بۆ نموونە لە 1889 دا لە هەرسێ ویلایەتەکەی عێراقدا

15 قوتابخانەی روشـــدیە هەبوو ،کە 840 خوێندکاریان هەبوو زۆربەیان دەرچوی کتاتیب بوون و چەند پۆلێکی سـەرەتاییان تێدا بوو ، تەنها سێ لەو قوتابخانانە لە ویلایەتی موسـڵ بوون، بەڵام لە 1890 بە دواوە سـیاسـەتی فێرکاری دەولەتی عوسـمانی کاری لەسـەر گەشـەپێدانی قوتابخانەی روشـدی وفەرمییەکان دەکرد لە ماوەی 1899-1902 دا چـەندین خوێندنگە لە ویلایەتی موســڵ وبەغدا کرانەوە لەوانە لە مەندەلی و خانەقین وســلێمانی ،هاوکات رێژەی خوێندەوار زیادی کرد و لە کۆتایی سـەدەی نۆزدە خوێندنگە ســەرەتاییەکان زیادیان کرد(احمد ،1982: 42 -44)، ئەوە بوو دواتر لە ســەردەمی ســوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا(1876-1909) چەند فێرگەیەکی ســەرەتایی و پیشـــەیی دامەزراند(Umit ,2014: 34) لەم بارەیەشـەوە ئەگەر بروانینە سـاڵنامەی مەعاریف باس لە هەبوونی مەکتەبی روشـدیەی سـەربازی لە وان و مەکتەبی روشـدییەکانی ناو شـاری وان وقەزاو سەنجەقەکانی جولەمێرگ عادلجواز وهەکاری و کواس دەکات ، (سالنامات نظارات معارف عمومیە,1317 : 1420-1427 ) هەروەها لە ویلایەتی موســڵ ئاماژە بە قوتابخانەکانی ناو شــاری موســڵ کراوە لە ســەرەتایی وروشـــدیە وئامادەیی کچان و کوڕان و مەکتەبی روشـــدییەی هەولێر وســەڵاحیە ومەکتەب روشـــدییەی ســەربازی لە ســلێمانی و مەکتەب روشـــدییەی ســلێمانی وکەرکوك و رەواندوز (ســالنامات نظارات معارف عمومیە,1317 : 1402-1405) و مەکتەبەکانی مامورلتازیز لە روشـــدیە وروشـدیەی سـەربازی و روشـدیەی کچان تۆمارکراون (سـالنامات نظارات معارف عمومیە,1317 : 1368-1372) هاوکات هەریەك لە ئامادەیی و مەکتەب روشـدییەکانی ئامەد و مەکتەب روشـدییەی سـەربازی و مەکتەب روشـــدییەی کچان و روشـــدییەی ســیلوان وماردین ودار معەلمین ئبتدائی شوعبەسی ئامەدو ئامادەی ئامەد(سالنامات نظارات معارف عمومیە,1317 : 1194-1198) ومەکتەبی روشـــدیەی وســـەرەتایی لە مەڕاش وئورفە

وروشدیەی ئەنتاب باسکراون (سالنامات نظارات معارف عمومیه,1317 : 1138 -1108) هەروەها لە بەتلیس کنج مەکتەب روشدیسی و روشدییەی ئەخلات و مەکتەب روشـــدییەی ســـەربازی لە بەتلیس ومەکتەبە روشـــدییەکانی بەتلیس و موش و ســـیرەت  (ســـالنامات نظارات معارف عمومیه,1317  : 1046-1049 ) و مەکتەب روشدیەی سەربازی ئەرزرۆم و مەکتەب روشدییەکانی ئەرزەنجان و بایەزید و روشدیەی کچانی ناوەندی ویلایەتەکە ومەکتەبی ئامادەیی ئەرزرۆم تۆمار کراون (ســـالنامات نظارات معارف عمومیه,1317 :  900-903). کە ناوی مامۆســـتا و بەڕوەبەرکانی هـاوکـات ژمـارەی فـێرخـوازەکـانـیـش ســـەرجـەم ئـەو نـاوەنـدانـە تۆمارکردوون.ئەمەش ئەوە دەردەخات ئەگەرچی بەراورد بە ناوچەکانی تر کەمتریش بووبێت بەڵام لە گەڵ ئەوەشـدا پرۆســەی پێشـکەوتنی خوێندن کوردستانیشی گرتۆتەوە .

وێڕای ئەمانەی باسـکران هاوکات سـیسـتەمی فێرکردنی دەوڵەتی عوســمانی زیاترگرنگی  بە شـارەکان دەدا، ئەمە لە کاتێکدا کە مسـیۆنەرە  ئەمریکییەکان جگە لە شـــارەکان هاوکات گرنگیان بە گوندەکانیش دەدا، ئەمەش وای لە حکومەتی عوسمانی  کرد لە ١٨٩٩دا فەرمانێکی شاهانەی دەرکرد بەوەی کە لە ســەدا پێنج  گۆمرگ بخرێتە ســەر داهاتی  هەرێمەکان بۆ لایەنی فێرکاری خەرج بکرێت بە ناوی بەشی فێرکارییەوە(مەعاریف حسـەسی) بە مەبەسـتی دامەزراندنی فێرگەی ســـەرەتایی و ناوەندی بە ناوی روشـــدییەوە، هەروەها رێژەیەك لە داهات بۆ ئەم مەبەســـتە خەرج بکرێت (احمد ،1982: 42 ،Umit ,2014:33).

کەواتە کردنەوەی ئەم فێرگە ئەمریکیانە لە ناوچەکانی کوردسـتاندا ئەگەرچی تا دوای ســـاڵی ١٩٠٠ کەمترین رێژەی کورد تێایدا دەیانخوێند بەڵام کاریگەر بوو لە ئاشـناکردنی دانیشـتوانی ناوچەکە بە فێرگە وخوێندنی پێشـکەوتووی ئەوکاتە  هەروەها کاریگەر بوو لەوەی کە دوای ئەو هەموو پشتگوێخستنەی

ناوچەکە لە رووی پەروەردەییەوە دەوڵەتی عوســـمانی لە بەر مەترسی ئەو فێرگانە بیر لەکردنەوەی فێرگەو تەنانەت ناوەندی بەڕێوەبردنی پەروەدەییش بۆ ســەرپەرشــتیکردنی پرۆســەی خوێندن لەو ناوچانەدا بکاتەوە ، لەلایەکی تریشـــەوە ئەو هەوڵانەی کە دەوڵەتی عوســـمانی بۆ مۆدێرنکردن و بەرەوپێشـبردنی سـیسـتەمی پەروەردەیی وڵات دای کاریگەر بێت لە سـەر ئەو ناوچە کوردیانەش وەک بەشــێک لە دەوڵەتی عوســـمانی ، بەمجۆرەش تەواوی ئەو هەنگاوانەی کە دەوڵەتی عوســـمانی وەک پەرچەکرداری ئەو چالاکییە پەروەردەییانەی مســـیۆنەرە ئەمریکییەکان نایان لە دوائەنجامدا بوون بە هەنگاوێکی گرنگی پەرینەوەی ســیســتەمی پەروەردەیی لە ناوچەکانی کوردســتانیشـدا وەک ســەرجەم ناوچەکانی تری دەوڵەتی عوســمانی بەرەو پەروەردەی نوێ.

لە لایەکی ترەوە جگە لە لایەنی بەڕێوەبردن و کردنەوەی فێرگەی نوێ هـاوکـات ئەو فێرگـانە لەرووی میتۆد و پرۆگرام و بـابەتەکـانی خوێنـدن و فەلســـەفەی پەروەردەییشـــەوە رۆڵی بەرچاویان لە رەوتی بەرەو پێشـــچونی پەروەردە لە دەوڵەتی عوســـمانیدا گێڕا ،جونکە تا ئەوکاتەی کە ئەو فێرگانە بەوجۆرە لە دەوڵەتی عوسـمانیدا بڵاوبوونەوە زیاتر قورئان وفیقهی ئیسـلام و کتێبە تەفســـیرییەکـان دەخـوێنـدران ئەویش بە میتـۆدێکی نەقلی وتەلقینی(عبـاس , ٢٠١٠: ٨١ )، بەڵام لەو فێرگە مســـیۆنەریـانەدا وەک پێشـــتریش باســـکرا بیرکاری و زمان و بازرگانی و جوگرافیا ومێژوو و لەســـەر دەستی مامۆستای شـارەزا دەخوێندران، هەر بۆیە لە ئەنجامی ئەو پەروەردە نوێیەی پێشکەشی دەکرد و بە تایبەتی گرنگیدان بە لایەنە پیشەییەکان فێرگە مســـیۆنەرییەکان زۆر ســـەرکەوتوتر بوون لەفێرگە ئیســـلامییەکان،هەروەها بینـاکـانیـان جۆری ئەوروپی بوون و پۆلەکـان گونجـاوبوون بۆ خوێنـدن و تاقیگەیان هەبوو،خاوەن بیرو باوەڕی ئابووری وکۆمەڵایەتی و فەلســـەفەی پەروەردە وبنەمای مادییەکانی دوای شـــۆڕشی پیشـــەســـازی بوون ، بۆیە

هەرچەندە ئامانجی ســـەرەکییان بڵاوکردنەوەی پرۆتێســـتانتی بوو لە نێو منداڵاندا، تەمەنێکی منداڵیدا، بەڵام منداڵەکانیان لە ســـەر ژیانی دوای قوتابخانە رادەهێنا هەروەها گرنگیان بە زمانە کانی سریانی و عیبری وبە زمانی عەرەبی و تورکی و ئەرمەنیش دەدا لە پاڵ زمانی ئینگلیزیدا کە زمانی ســـەرەکی خوێنـدنیـان بوو، کە دواچـار ئەو خوێنـدکارانە دەیـان توانی لە دەرەوەی دەوڵەتی عوسـمانی درێژە بەخوێندن بدەن ، ئەمانەش وایانکردبوو کە خێزانە ئیســـلامەکانیش بیر لەوە بکەنەوە منـداڵەکانیـان بنێرنە ئەو قوتـابخـانـانە هەرچەند تا ســـاڵی ۱۹۰۰ ئەو رێژەیە زۆر کەم بوو ، بەڵام لەوێ بەدواوە دەســـتی پێکردبوو،کە ئەمانەش وایانکرد مەجلس داوا لە وەزارەت بکات بە میتۆدی خوێنـدن و بابەتەکانی خوێنـدنـدا بچنەوەو ئەو بابەتـانە بخەنە ناو پرۆگرامی خوێندنەوە کە لەگەڵ ســـەردەمدا دەگونجێت و دەکرێت رکابەری بـابەتی ئەو فێرگە بیـانیـانە بکـات بۆ ئەوەی بـاوکـان بیر لەوە نەکەنەوە منـداڵەکانیان بنێرنە فێرگە بیانییەکان، هەربۆیە ئەو فێرگە ئەمریکیانە جگە لەوەی رۆڵیان بوو لە بە مۆدێرنکردنی ســیســـتەمی پەروەردە، هاوکات رۆڵی گەورەشـیان بوو لە دەرکەوتنی فەلســەفەی پەروەردەیی و پرۆگرام مەنهەجی نوێی خوێنـدن لە نـاوچەکەدا و لەوێوە ئیـدی بـابەتە دونیـایی و نوێیەکانی خوێندن کەوتنە نێو ســـیســـتەم و پرۆگرامی خوێندنی ناوەندە فێرگەییەکانی دەوڵەتی عوســـمـانییەوە (Kentli ,2009: 75-80; Umit ,2014: 38؛ Karabekmez ,2012:23-31)، بۆ نمونە بابەتەکانی موسـیقا وجوگرافیا و مێژوو، رەسـم، هەندەسـە (ئەندازە )، ادارە بیتیە (ماڵداری )،حسـاب ،حفظ صـحـت(تەندروسـتی)، علم اشـیا، موالید وحکمت طبیعیە ،اخلاق عملیە - تطبیقات، اخلاق،اخلاق نظریە، اصـــول التعلیم واداره مکاتـب ،حســـن الخط،کتـابـت، قواعـد عثمـانیـە ، فـارسی، عـەرەبی، علوم الـدینی، تجویـد قورئان کریمە، فرانســـزجەو لە هەندێك قۆناغ کیمیاو فیزیاو میکانیك و کۆزمۆگرافیا کەوتنە نێو پرۆگرامی خوێندنەوە لەقۆناغە جیاجیاکانی خوێندن

لە دەوڵەتی عوســـمانیدا ، کە لە وردەکاریدا بەشی زۆریان لە ژێر کاریگەری پرۆگرامی ســەردەمیانی خوێندنی رۆژئاوادا بوون (ســالنامات نظارات معارف عمومیە,1317 : 512 -374 ) ، بێگومان ناوچەکانی کوردستانیش بەشێک بوون لەو سیستەمە پەروەردەییە واتا پەروەردە لە ناوچەکانی کوردستانیش لەو پێشکەوتنانە بێبەش نەبوو.

لە لایەکی تریشـــەوە کردنەوەی فێرگەی کچان و بواردان بەخوێندنی کچان لەسەرجەم ئاستەکانی خوێندن و ناوەندە پیشەییەکاندا وای کرد سەرەتاکانی ئاســایی بوونی ئەم هەنگاوە لە ســەرجەم ناوچەکانی دەوڵەتی عوســمانی بە گشتی و ناوچەکانی کوردستانیش دەرکەوێت و ئیدی ئەگەرچی رێژەیەکی زۆر کەم کوردیشی تێدا بوو، بەڵام لە ناوچە کوردییەکاندا بۆ یەکەم جار ئافرەتان چونە بەر خوێندنو فێرگەی کچان دەرکەوت و ئافرەت لە بواری پیشـــەییدا راهێنانی دەکردو دواتریش بواری کارکردنیان بۆ رەخســا ،ئەمانە جگە لەوەی کە بەدیوێکی تریشـــدا ئەو هەنگاوانە وای لە دەوڵەتی عوســـمانی کرد بیر لە دامەزراندنی فێرگەی کچان بکاتەوە، ئەوە بوو لە ساڵی ١٨٥٧دا بابی عالی بۆ یەکەمـجـار بـڕیـاری لەســـەر کـردنەوەی روشـــدیـیەی کـچـان دا(Karabekmez,2012:8) وەکو پێشــتریش باســکرا لە چەند ناوچەیەکی کوردستانیش کرانەوە .

لە پاڵ هەموو ئەمانەشـــدا ئەم فێرگانە رۆڵی گەورەیان بوو لە زیادبوونی ژمارەی خوێندەوار لە ناوچەکانی کوردستاندا کە بە دەیان کەس لەوفێرگانەدا دەیانخوێند هەر لە فێرگە بەراییەکانەوە تا کۆلیجەکان و تەنانەت رەوانە کردنی سەرکەوتووەکان بۆ ناوچەکانی دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانیش،ئەمانە هەرچەندە رێژەیەکی زۆرکەمیان کوردبوون ،بەڵام لە گەڵ ئەوەشـــدا ئەمە بـووە هـۆکـاری بڵاوبـوونەوەی خـوێنـدەواری لە نـاوچە کـوردییەکـانـدا وئاشـــناکردنی ناوچەکە بە فێرگە و خوێندەواری ، ئەگەرچی لە دوائەنجامدا ئەم دیاردەیە لێکەوتەی نەرێنیشـــی بۆ ناوچە کوردییەکان هەبوو چونکە

بەشی هەرە زۆری ئەو کەسـانەی لەو نـاوندانەدا دەیـانخوێنـد ئەرمەن بوون،واتـا ئەم پرۆسـەیە وای کرد ئەرمەنەکـان خوێنـدەواربن و توێژێکی رۆسنبیریان تێدا دەرکەوێت و ژمارەیەکی یەکجار زۆریان لە شارە گەورەکاندا لە خوێندنداین ، لە بەرامبەریشدا رێژەی خوێندەوار لە ناو کورددا بەو رادەیە زیاد نەکات ، کە ئەمەش رۆڵی گەورەی بوو لەوەی ئەرمەنەکان لەو کاتەدا زیاتر لە زلهێزەکان نزیک ببنەوە وکاریگەریان لە سـەردابنێن و هەروەها پێش کورد رێکخراوە ودامەزراوەی سـیاسی دامەزرێنن کە لەو ماوەیەدا چەندین پارت و رێکخراویان هەبوو (توفیق،٢٠١٢: ٧١-٧٩ )هاوکات بە دیوێکی تردا کردنەوەی فێرگە سـەرەتاییە فەرمییەکانی حکومەت وروشـدییەکان لە کوردسـتان لە بەرانبەر ئەو فێرگانەدا وەك پێشـتر باسـکرا رۆڵی بوو لە دەرکـەوتنی خوێنـدەواری کورد ،کـە دواجـار هـەر ئـەمانـە بوون بـە توێژی خوێندەوار و ورۆشـنبیر لە دەرەوەی پیاوانی ئاینی ، چونکە بەر لەوە ئەوەی بەلای ئەوانەوە بـاو بوو تەنهـا خوێنـدنی کوڕان بوو ئەوێش لە خوێنـدنگە ئاینییەکاندا ، کە بۆ مەلایەتی رای دەهێنان ، کە هەرئەمانە لە دوائەنجامدا بوون بە توێژی سـەرمەشـق لە روی زانسـتی ورۆشـنبیری وسـیاسـییەوە ،لە کوردستان و لەم رووەشەوە بە دەیان ناوی گەورەی وەکو ئەمین زەکی بەگ و ئەندامانی بنەماڵەی بەردخان و موسـتەفا پاشـای یامولکی ودەیانی تر دەرکەوتن ،کە دەرچووی ئەم خوێندنگانە بوون .

**ئەنجام**

لە ئـاکامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دوای کار و بەدواداچوون لەسـەر جـالاکی مسـیۆنەرە ئەمریکییەکان لە ناوچەکانی کوردسـتان و هەڵسـەنگاندنی کارەکانیان لە رووی پەروەردەییەوە لە نـاوچەکەدا بە چەنـد ئەنجـامێـک گەیشـتین لەوانە، مسـیۆنەری ئەمریکی هەر لەسـەرەتای هاتنییەوە بۆ نـاوچەکانی دەوڵەتی عوسـمانی یەکێـک لەو نـاوچـانەی بـایەخی پێـداوە ،

کوردستان بووە ، ولەم رووەشەوە چەندین وێستگەی مسیۆنەری لە ناوچە کەدا دامەزراندوە، کە لە رێگایانەوە چالاکییە مسیۆنەرییەکانی خۆیان ئەنجامداوە و هاوکات خزمەتگوزارییە تەندروستی و رۆشنبیرییەکانیان پێشکەشکردووە، هەروەها بەوە گەیشتین کە یەکێک لە چالاکییەکانی مسیۆنەری ئەمریکی لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانێدا بواری پەروەردەیی و کردنەوەی ناوەندە فێرکارییەکان بووە،کە لەم رووەشەوە، بایەخی زۆریان بە ناوچەکانی کوردستان داوە و چەندین فێرگە و ناوەندی ئەکادیمیان دامەزراندوە لە سەرجەم ئاستە جیاجیاکاندا، هاوکات بەو ئەنجامە گەیشتین کە ئەو ناوەندە فێرکارییانەی ئەمریکییەکان لەو ماوەیەدا لە ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەگشتی وکوردستان بەتایبەتی دایان مەزراند کاریگەر بوون لە بەرەو پێشبردنی سیستەمی پەروەردەیی لەناوچەکە لە سەرچەم رووەکانەوە و بە مۆدێرنەکردنی ، بەمەش ئەم پێشکەوتنانە کاریگەر بوون لە سەر ناوچەکانی کوردستانێش وەک بەشێک لەئیمپراتۆریای عوسمانی، هاوکات ئەو فێرگانە رۆڵیان بوو لە ناچارکردنی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئاوەڕدانەوە لە ناوچەکانی کوردستان لەرووی پەروەردەییەوە دوای ئەوەی کە پێشوتر تا رادەیەکی زۆر پشتگوێ خرابوون لەم رووەوە،هەروەها بۆمان دەرکەوت،کە ئەگەرچی رێژەیەکی زۆر کەم کورد تیایاندا دەیانخوێند بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم فێرگانە کاریگەر بوون لەوەی خوێندەواری لە ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوبێتەوەو دانیشتوانی کوردستان بە سیستەمە نوێیەکانی خوێندن و خوێندنی کچان و خوێندنی پێشەیی ئاشنا بکات.

## سەرچاوەکان

یەکەم : ساڵنامەی عوسمانی

1- سالنامات نظارات معارف عموميه,1317 , دار الخلافة العلمية , مطبعة عامرة .

دووەم : بە زمانی ئینگلیزی

1. Akalin, Berrin.( 2015),Ottoman-American Relations, Francis Hopkins Smith and Armenian Issue, Journal of International Education and Leadership Volume 5 Issue 1 Spring
2. Anderson , Rufus. (1872),History of the Missionary of the American Board to the Oriental Churchs,Vol.1, Bostn.
3. Avarogullari,Muhammet and Yildiz, Ozgur,(2015), Role of American protestant Missionariens Late Ottoman Empire Educational System,Turkish International Perodical for the Languages, Literature and History of Turkish ,V,10/9.
4. Dennis, James . (1893), Foreign mission after century, New York.
5. Dennis, James. (1903) ,Missions and social progress, Vol.(3), pub. Fleming H. Revel company Madison.
6. Dogan, Mehmet Ali .(2013), American Board of Commissioners for Foreign Missions (ABCFM)and Nominal Christians, Elias Riggs (1810 -1901), and American Missionary Activites in the Ottoman Empire.
7. Erban, Cegri. (2000), Ottoman Official Attitudes Towards American Missonaries, International

Confrence on 'the United States and the Middle East: Cultural Encounters, Yale University.

8. Fulya Damla Kentli,(2009), Foreign Schools in Turkey: Parents' Reasons to Choose, Ozean journal of social sciences.
9. Karabekmez , Meryem,(2012), The Role of Provincial Directors of Education in the Formation of Modern Ottoman Schooling ,1881-1908,(Master of Science in History) the Graduate School of Social Sciences, Istanbul Sehir University
10. Kennedy, W. Judd.(2008),American Missionaries in Turkey and Northern Syria and the Development of Central Turkey and Aleppo Colleges, 1874-1967,College of William and Mary Publish.
11. Gokce، Feyyat.(2010),Minority and Foreign Schools on the Ottoman Education System.e-intarnational journal of of educational research Volume: 1 Issue: 1- Summer.
12. Goodell,William.(1883),Forty Years in the TurkishEmpire ,NewYork.
13. Moritz, Wanger. (1856),travel in Persia, Georgia and Kurdistan, Vol.(3),Hurst and Blacket, London .
14. Ozutuk,Ayhan and Yildiz,Ozgur,(2013), Religious and Educational Activities of American Protestant

Missionaries in Bursa,Cumhuriyrt International Journal of Education,V,2, No1.
15. The One Hundredth Annual Report of the American Bord Commissioners for foreign missions ,(1910), Bostn.educational research ,V,1.
16. Thomas ,Laurie.(1853),Dr Grant and the Nestorian, Edinburge.
17. Umit, Devrim, (2014), The American Protestant Missionary Network in Ottoman Turkey, 1876-1914,International, Journal of Humanities and Social, V ,4,No,6,.

**سێیەم : بەزمانی عەرەبی**

1. احمـد، ابراهيم خليـل.( 1982)، تطور التعليم الوطنى فى العراق (1869-1932) .
2. الاسـدى ، ناهدة حسـين علي,الارسـاليات التبشـيرية الامريكية في العراق و موقف الدولة العثمانية ,المجلة السياسية و الدولية .
3. اسماعيل، عامر بلو.( 2009)،التعليم التبشيرى الامريكي في الموصل منـذ اواخر العهـد العثمـاني حتى عـام 1932,مجلـة التربيـة والعلم ,المجلد 16, العدد 2.
4. الامير، ا.د. ليلى ياسين.( حزيران 2005),النشاط التعليمى للارسالية المريكية في البصرة 1912- 1958 , دراسات التاريخية , العد الاول.
5. توفيق ، هوگر طـاهر.( ٢٠١٢) الكرد والمسـالةالارمنيـة(١٨٧٧-١٩٢٠)،اربيل: ئاراس.

6. عباس ،محمد احمد.(2010),البعثات التبشـــيرية في كردســـتان في نصـــف الثاني من القرن التاســـع عشرـــ(رســـالة ماجســـتير غير منشورة),كلية اداب, جامعة صلاح الدين.
7. عيسىـ د. عبدالرزاق عبدالرزاق.( 2005 )التنصـير الامريكى في بلاد الشام 1834 -1914, القاهرة.
8. غنيمة, حارث يوســـف .(1998), البروتســـتانت والانجيليون في العراق، مطبعة الناشر المكتبي ، بغداد .
9. هاشـــم ، د.ســـوادي هاشـــم .(حزيران 2006),النشـــاط التبشـــيري الامريكي في شمال غرب بلاد فارس 1833-1870 ,دراسات الاقليمية , السنة 3,العدد 5 .
10. هياجنة، ايمان عبدالرحمن وملكاوى ،حنان ســـليمان .( 2014) التبشـــير الفرنسيـــ الكاثوليكي في ولاية الاناظول في القرن التاســـع عشرـــ(النشـــاط التعليمى نموذجا ),دراســـات ,العلوم الانســـانية والجتماعية ,م(41) ملحق 2 .

**Abstract**

After American missionaries arrived to the regions of Ottoman Empire in the beginning of the 19th century and when they started their activities, the Kurds as one of the nations who were living within the Ottoman Empire, attracted the attention of missionaries. Therefore they opened their office in the Kurdish cities and started their activities. As it has been known that most of the activities of American missionaries were intellectual and educational activities, as a result they opened many schools, professional schools and even they established universities in some cities of Kurdistan, many girls and boys studied in these schools.

This study is about (American Missionaries' educational centres in Kurdish cities in Ottoman Empire in 19$^{th}$ century). This study attempts to illustrate the impact of these schools that were established by American Missionaries and how they were operated. This paper is divided into three parts. First part is about the appearance of American missionaries' activities in the region of Kurdistan. In this part we will try to briefly describe how they came to Kurdish regions and how they worked and what were their activities. The second part is about the American missionaries' educational centres in Kurdistan. It endeavours to show the educational activities of American

missionaries in Kurdistan regions, and then it will illustrate the importance of these educational centres in Kurdistan regions. The third part is about the effect of American missionaries' educational centres on the situation of education in Kurdistan. It will evaluate the impact of these educational centres on the education in Kurdistan and on the situation of education in Kurdistan.

**ملخص البحث**

بعد ان وصل المبشرون الامريكيين الى مناطق الواقعة تحت سلطة الدولة العثمانية في بدايات القرن التاسع عشرو بدأو بنشاطاتهم التبشيرية . وبما ان الكرد كان احد الشعوب المتواجدة ضمن حدود السلطة العثمانة، وكان يعيش في مناطق كوردستان نسبة من المسيحيين , لذا فجلب انتباه المبشرين الامريكيين واصبح احد المناطق الذى اهتم بها التبشير الامريكى منذ بداية وصولهم الى المنطقة، وبدأو بنشاطاتهم في المناطق الكردية وفتح محطاتهم التبشيرية فى مناطق كردستان متعددة , وبما ان من المعروف على التبشير الامريكى بأن نشاطاتهم كان على الاكثر هي التعليمى لذا فقد فتح التبشير الامريكى في مناطق الكردستان عددا ملحوضا من مدارس الابتدائية و المهنية والثانوية للبنين وبنات .

يتناول الدراسة مدى نشاطات الحركة التبشيرية الامريكية ومحطاتهم التبشيرية في كوردستان واعمالهم من الناحية التعليمية فى المناطق الكردية في قرن التاسع عشر و بعدها مدى تاثيرها على الناحية التعليمية والتربوية في المنطقة، والبحث يتكون من ثلاثة محاور رئيسية، فالمحور الاول يتناول بداية ظهور نشاطات التبشير الامريكى في كوردستان، اما المحور الثاني فيقوم بدراسة نشاطات التعليمية والتربوية لتلك المنظمة التبشيرية

الامريكية وما قاموا به من فتح مدارس و مرافق تعليمية في كوردســـتان، والمحور الثالث والاخير فيبحث عن مدى تأثير هذه النشـــاطات و الاعمال التى قـام بهـا اتبشـــير الامريكى في المجـال التربوى على الوضـــع التعليمى والتربوي في كوردستان .



## کورتەیەك لەژیان و بەرهەمەکانی نووسەر:

- ساڵی 1966 لەسلێمانی لەدایك بووە.
- ساڵی 2001 ماستەری ئادابی لەسایکۆلۆژیای کەسێتی و دروستی دەروونیدا وەرگرتووە.
- ساڵی 2007 دکتۆرای فەلسەفەی لە سایکۆلۆژیای پەروەردەیی/ ڕاگەیاندنی منداڵدا بەدەست هێناوە.
- ئێستا پرۆفیسۆرە لەزانکۆی سلێمانی.

## ئەم بەرهەمانەی نووسیوەو بڵاوکردۆتەوە:

- سایکۆلۆژیای خەوتن و خەوبینین 1996.
- خەواندنی موگناتیسی 1997
- تاوانبارو سزا 2002.
- سایکۆلۆژیای گشتی 2003.
- چەند لاپەڕەیەك لەسایکۆلۆژیای منداڵ 2003
- فەرهەنگی سایکۆلۆژی 2004.
- لەنێوان هەست و نەستدا 2006.
- مجلات الاطفال فی اقلیم کوردستان، تحلیل وتقویم 2008
- لەپشت ڕەفتارەوە 2009
- میتۆدی توێژینەوەی زانستی 2016.
- پێکەنینو گریان 2016.
- ئینسایکڵۆپیدیای زانستە دەروونییەکان 2020.

## ئەم بەرهەمانەی وەرگێڕاوەو بڵاوی کردۆتەوە:

- خۆشەویستی لەنێوان دڵ و دەماغدا 1998.
- دەربارەی هونەری سەرکردایەتی کردن 2001.
- سۆسیۆلۆژیای خێزان 2002.
- مرۆڤ لەنێوان ڕواڵەت و جەوهەردا 2004.
- لەسایکۆلۆژیای مرۆڤدا 2006.
- سروشت و پەرەسەندنی هزر 2007.

بڵاوکردنەوەی دەیان وتارو لێکۆڵینەوە لەرۆژنامەو گۆڤارو سایتە کوردییەکاندا.


٥٠٠٠دینار

خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا
سلێمانی سەرەتایی شەقامی مەولەوی
فەرعی سەعید تەها کۆیی
٠٧٥٠١١٢٨٢٨٨-٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧
Ktebxanai chwarchra